

الدار العربية للعلوم ناشرون
Arab Scientific Publishers, Inc.

# بە دەم ڕێگاوە گوڵچنین

## چەند بابەتێکی کۆمەڵناسی





نەوشیروان مستەفا ئەمین

کتێبی یەکەم
بەرگی دووەم

# ناوەرۆک

# سەرەتا

ئێستا ساڵی 1435 ی کۆچی مانگیە.
ئێستا ساڵی 2014 ی زایینیە.

دەوڵەتی عوسمانی ساڵی 1891 بۆ سازدانی هێزی کورد دژی روسیای قەیسەری و دژی گەلی ئەرمەنی، فەوجەکانی حەمیدی، لە خێڵەکانی کورد دروست کرد و، دەیان هەزاری بە ناوی تیرە و هۆز و خێڵەکانیانەوە بە سەرۆکایەتی ئاغا و بەگ و خان و شێخەکانی خۆیانەوە کۆ کردەوە و، هاویشتنیە مەیدانی جەنگەوە.

دەوڵەتی تازە دامەزراوی عیراق لە سیەکان و چلەکانی سەدەی بیستەم دا توانی بە هەمان شێوە، بە ناوی تیرە و هۆز و خێڵەوە هەزاران کورد، شان بە شانی جەیشی عیراق، رێک بخا و بیان کاتەوە بە گژ شۆڕشی کوردا.

حیزبی بەعس پاش نزیکەی سەد ساڵ لە دەوڵەتی عوسمانی و، پاش زیاتر لە پەنجا ساڵ لە دەوڵەتی هاشمی، لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەم دا توانی بە هەمان شێوەی جاران، زیاتر لە سێ سەد و پەنجا فەوجی میلیشایی بە ناوی تیرە و هۆز و خێڵەوە دروست بکا و، سەدان هەزار کورد چەکدار بکات، لە شەڕی ئیران دا بە کاریان بهێنێ و، لە هەمان کات دا بیان کاتەوە بە گژ شۆڕشی کوردا.

ئێستاش بە هەمان نازناوی تیرە و هۆز و خێڵەوە، بە هەمان نازناوی گوند و شار و ناوچەوە، سەدان رۆشنبیر، نوسەر، شاعیر، رۆژنامەنوس رۆژانە لاپەڕەی گۆڤار و رۆژنامەکان رەش ئەکەنەوە. کەسایەتیە سیاسیەکانیش لە ناو سەرکردایەتی حیزب و، لە ناو وەزارەت و سەفارەت و پارلەمان دا، لە کۆڕە سیاسی، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری، رۆژنامەوانیەکان دا، ململانێی نازناوی خێڵەکی و ناوچەیی ئەکەن. تەنانەت لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی هەرێم دا چەند کەسایەتیەک کە بۆ سەرۆکایەتی هەرێم رکابەری یەکتریان ئەکرد، هەر یەکەیان هەڵگری نازناوی خێڵ یا ناوچەیەک بون.

لێرەدا چەند پرسیارێ دێتە پێشەوە:

بۆچی هەتا ئێستاش ئەم گرێیە: گرێی خێڵ، گوند، ناوچە، لە دەرونی مرۆڤی کوردا ئەوەندە کاریگەرە، ئەوەندە جێگەی شانازیە خۆی پێوە هەڵ بکێشێ؟

بۆچی ئەوەندەی ئینتیما بۆ گوندەکەی، شارەکەی، ناوچەکەی ئەی وروژێنێ ئەوەندە ئینتیما بۆ نیشتمانەکەی - کوردستان دای خرۆشێنێ و، ئەوەندەی ئینتیما بۆ تیرەکەی، هۆزەکەی، خێڵەکەی ئەی جوڵێنێ ئەوەندە ئینتیما بۆ نەتەوەکەی - کورد دای بزوێنێ؟

بۆچی حیزبەکان مەکتەبی کۆمەڵایەتیان دامەزراندوە بۆ بەلاداخستنی کێشەی کۆمەڵایەتی ناڵۆز و خوێناوی لە کاتێک دا دەزگای قەزایی "پیشەیی" هەیە.

ئەم چەند وتارە هەوڵێکی سەرەتاییە بۆ بەشداری لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەدا.

# وشەوانی

ئێستا کە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی - سۆسیۆلۆجی و ئەنترۆپۆلۆجی، ئێتنۆلۆجی، ئێتنۆگرافی... لە گەشانەوەدایە و، بەردەوام بەرەو پسپۆڕیی قوڵتر ئەڕوا، بە تایبەتی کە لە هەندێ لە زانکۆکانی کوردستان دا بەشی کۆمەڵناسی کراوەتەوە. پێویستە لە نوسینی کوردیێش دا ئەو سەرمایە زمانیەی هەیەتی سەرلەنوێ بە پێوانەی زانستی دابەش بکرێن و، هەر وشەیەک بخرێتە خانەی بەکارهێنانی تایبەت بە خۆیەوە.

لە ئاخاوتنی ئاسایی دا دەستەواژەی عەشیرەت، خێڵ، ئێل، عێل، تایەفە، تیرە، قەوم، قەبیلە، هۆز... بە تێکەڵوپێکەڵی بەکار ئەهێنرێ. هەروەها لە زمانی نوسین دا هێشتا چەمک و مەعنای ئەم دەستەواژانە لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتی دا بە وردی دیاری نەکراون، بە تایبەتی چونکە باسی لەو بابەتە لە زمانی کوردی دا نەبوە یان دەگمەن بوە. لەم بابەتانە دا هەوڵێ دراوە بۆ لێکدانەوە و دانانی جۆرێ لە ڕیزبەندی وشەکان لە پەیکەرەی کۆمەڵایەتی ئەو گروپانە دا.

**عەشیرەت:** دەستەواژەی عەشیرەت بە هەمو یەکەیەکی کۆمەڵایەتی وتراوە، گەورە بوبێ یا بچوک، ئەگەر خێزانێکی فراوان بوبێ یا یەکگرتنی چەند هۆزێ، کە هاوخوێنی، یا هاوشوێنی، یا هاوقازانجی لە ژێر ناوێکی هاوبەش دا کۆی کردبنەوە. لە بنەڕەت دا وشەیەکی عەرەبیە هاتۆتە زمانی کوردیەوە. لە زمانی کوردی دا بە شێواوی بە کار هێنراوە بەڵام لە زمانی عەرەبی دا بۆ چەمکێکی دیاریکراوی یەکەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو بە کار هێنراوە.
هەمان وشەی "عەشیرەت" و "عەشائیر" بۆ کۆکراوەکەی لە زمانی فارسی و هەندێ زمانی تردا بە کار هێنراوە و ئێستاش بە کار ئەهێنرێ.

**ئێل:** کە لە سەر زمان بۆتە عێل و خێڵ، لە بنەڕەت دا وشەیەکی تورکی مەغۆلیە. مەغۆل، بۆ گەل، کۆمەڵێ خەڵک، گوێڕایەڵی کەسێ بۆ گەورەکەی، بە کاریان هێناوە.

لە زمانی فارسی و هەندێ زمانی تردا بە کار هێنراوە و ئێستاش بە کار ئەهێنرێ. چەند دەستەواژەی تری لێ کەوتۆتەوە، لەوانە:

**ئێلی:** گوێڕایەڵی.

**ئێلخان:** بە سەرۆکی ئێل وتراوە.

**ئێلچی:** بە نێردراو، سەفیر وتراوە.

ئێل، هاتۆتە زمانی کوردییەوە، لە باتی وشەی عەشیرەت بە کار هێنراوە. هەندی جار لە گۆکردن دا بۆتە ئێل. عێلی مرادی، نازناوە بۆ عەشیرەتی جاف. وەلی دێوانە لە شیعرێکی دا لە دەلیل ئەپرسێ: "کۆچ خێڵخانەی ئێلی جاف نەدیت/ سەرداری رەندان سەوڵی ساف نەدیت؟" پیرەمێردیش ئەڵێ: "تەکەرۆز گەرام وادی بە وادی/ جێگە و نزرگەی ئێلی مورادی". لە وشەی ئێلەوە چەندین وشە و دەستەواژە داتاشراوە، لەوانە:

**ئێلجاڕی:** بریتیە لە سازدانی گشتی هەمو ئەندامانی ئێلەکە بۆ ئەنجامدانی کارێکی گەورە، بە تایبەتی کۆکردنەوەی لەشکری ئێلەکە بۆ پەلاماردانی دوژمنی ئێلەکە، بە کار هێنراوە.

**ئێلات:** کۆکراوەی ئێلە. کۆمەڵێ عەشیرەت. مەولەوی ئەڵێ: "داخ پەی تۆ! چ تەور، بێ ڕەحمی کریان/ ئێلات پەی ئێلاخ، باز، ئێزنش دریان."

**ئێلاخ:** هەواری کوێستانەی ئێل.

**خێڵ:** هەمان وشەی ئێلە. لە سەر زمان گۆکردنی گۆڕاوە، بە هەمان مەعنا بە کار ئەهێنرێ. وەلی دێوانە ئەڵێ: "هەی دەلیلەی ڕەم هەردە و هەڵەت گێڵ/ هەی سەرداری پۆل تەتارانی خێڵ." هەر ئەو ئەڵێ: "مەر نمەزانی لێلاویت لێڵەن/ ئەی ماوا و مەسکەن گوزەرگەی خێڵەن. یۆرتی چەراگەی خێڵی جافانەن، جای عەیش و ئەشات عەنبەر نافانەن." هەروەها مەولەوی ئەڵێ: "جە قەتارەی خێڵ دیدە سیاوان/ باقی هەوارگەی گەرمیان ئاوان". کەسێکی تر کە لە هەوارەکەی بێزار بوە بە گلەییەوە وتویەتی: "ئەو وەختەم زانی ناخرم شەڕ بو/ خێڵم ئاوێتەی خێڵی سەگوەڕ بو". خێڵ خراوەتە وشەسازییەوە، وەکو:

**خێڵخانە:** خانەی خێڵ. مەولەوی ئەڵێ: "ئیمشەو مەینەتان نە دەرون جەمەن/ خێڵ خانەی کەیفم پڕ جە ماتەمەن."

**خێڵی حەمە:** گوندێکە لە شارەزور.

**کانی خێڵ:** گوندێکە لە شارباژێر.

**بانی خێڵان:** گوندێکە لە ناوچەی دەربەندیخان. یەکێ بوە لەو وێستگایانەی کە ئێلی جاف، لە گەرمیان و کوێستان دا بارگەیان لێ خستوە.

**خێڵ بەرەو ژور:** نیشانە بوە بۆ جوڵانی خێڵ لە بەهاردا بەرەوە کوێستان.

**خێڵ بەرەو خوار:** نیشانە بوە بۆ جوڵانی خێڵ لە پایزدا بەرەوە گەرمیان. پەندێکی کۆن ئەڵێ: "خێڵەوخوار و خێڵەوژور/ بزنە بەلە و جاجمە سور".

**سەرخێڵ:** سەرئێل، سەرۆکی عەشیرەت. مەولەوی ئەڵێ: "گێج مدۆ دەرون چەنی ئێش، ئامان!/ بەڵام هەی سەرخێڵ نەوتول ئەمامان". دیسان مەولەوی ئەڵێ: "جەورەکەی سەرئێل خەم بێ شومارەن/ خێڵ خانە بەرێچ تا خێڵ ئەو خوارەن". لە ناو هەندێ لە عەشیرەتەکانی موکریان دا لە باتی سەرخێڵ وشەی "مەزن" بە کار هاتوە.

**خێڵ:** لەم چەند بابەتەدا لە باتی عەشیرەتی عەرەبی و (tribe) ی ئینگلیزی بە کار هێنراوە.

**هۆز:** کۆمەڵێ خەڵکە لە سۆنگەی هاوشوێنی یا هاوقازانجی لە ژێر ناوێکی هاوبەش دا کۆ بونەتەوە. مەرج نیە هەمو ئەندامانی هۆزەکە لە نەوەی یەک باپیرە بن و، هاوخوێنیی پێکیانەوە ببەستێ. ئەشێ لە چەند خێزانی جیاواز و لە چەند باپیرەی جیاواز بن.

وشەی هۆز لە چەندین بابەتی فۆلکلۆری دا بە کار هاتوە. بە گاڵتەوە لە ژنێکیان پرسیوە چەند شوی کردوە و چەند جار هەڵگیراوە ئەویش بە گاڵتەوە وتویەتی: "تۆ لەم هۆزی، تۆ لەو هۆزی. تۆ لە هۆزی برایمە قۆزی. تۆ لە بەر هەتاو خۆیان ئەدۆزی. دەستم لە هەویرە، هەر ئەوەندەم لە بیرە!". پێشینان وتویانە: "کە من کەوتمە دەرۆزە، ئەم هۆزە دا ئەو هۆزە". بۆ پۆشینی جلی ئاسایی و جلی کار وتویانە: "ئەم بۆ ناو هۆز، ئەو بۆ ناو کۆز".

وەلی دێوانە یەکێ لە شیعرەکانی بەمجۆرە دەس پێ کردوە: "بێزیای هۆزان.../ ها بیم وە مەجنون بێزیای هۆزان. ئەگەر وە دۆزام، بەیان دڵسۆزان/ مەگەر نە هەردەی ئەجەم بدۆزان." لە شیعرێکی تری دا کە لە گەڵ سەنگی هەواران ئەدوێ، ئەڵێ: "تۆ جە داخی کێ سوفتە و سۆزانی/ پەسمەندەی هەوار کامین هۆزانی؟"

**تیرە:** کۆمەڵێ خەڵکە هاوخوێنیی بە یەکیانەوە ئەبەستێ. هەمویان نەوەی یەک باپیرەن. رەنگە چەند بەرەبابێ بن، بەڵام راست یا وەهمی، هەمو خۆیان بە نەوەی یەک پیاو ئەزانن و خۆیان بە خزمی یەکتری دائەنێن.

وشەی "تیرە"، جگە لە کورد، لە ناو کۆمەڵگا خێڵەکیە ئێرانیەکان دا، بە تایبەتی لە ناو فارس و لوڕ دا بۆ هەمان مەبەست بە کار ئەهێنرێ.

**بەرەباب:** چەند خێزانێکن لە یەک باوک کەوتونەتەوە. هەمویان ناوی باوک و باپیری خۆیان بە دروستی ئەزانن و کەسوکاری خۆیان بە چاکی ئەناسن. مەرج نیە هەمویان لە یەک دایک بو بن. رەنگە باب چەندین ژنی هێنابێ و بەری چەندین دایک بن، بەڵام مەرجە بەری یەک باب بن.

**بنەماڵە:** خێزانێکی فراوانە، خاوەن ناونیشانە و ناسراوە لە ناو کۆمەڵ دا و خۆی بە خانەدان و بەرێز ئەزانێ.

**خێزان:** بچوکترین یەکەی کۆمەڵایەتیە پێک دێ لە یەک پیاو (مێرد، شو) و یەک ژن، لە گەڵ منداڵەکانیان لە کوڕ و کچ. پیاوێک ئەگەر زیاتر لە یەک ژنی هەبو ئەشێ بە یەک خێزان زیاتر دابنرێ.

---

**تێبینی:**

*الدکتور شاکر خصباک: الاکراد. بغداد - 1972.*

*خەسباک، لەم کتێبەی دا لە لاپەرەکانی 350 - 352 دا هەوڵی داوە ئەم دەستەواژانە شی بکاتەوە. جگە لە لێکۆڵینەوەکانی خۆی هەندێ قسەی توێژەری پێش خۆی باس کردوە.*

لە ناو کوردا دین، مەزەب، زاراوەی زمان، عەشیرەتی جیاواز هەبون. هەر دینە و هەر مەزەبەی بە پێی یاسا و ڕێساکانی خۆی هاوسەرگیری کردوە. بەڵام لە ناو هەر یەکێ لەمانەدا ریوشوینی جیاواز هەبوە. رەگی هەندێ نەریتی هاوسەرگیری ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی زو.

## هاوسەرگیری ناوخۆیی

بنەماڵەیەک، بەرەبابێک، تیرەیەک، هۆزێک، عەشیرتێک، مەزەبێک، دینێک کە تەنیا لە ناو خۆیان دا ژنوژنخوازی بکەن، لە دەرەوەی گروپەکەی خۆیان ژن نەهێنن و نامانە نەبێ ژن بدەن بە پیاوی گروپێکی تر، پێی ئەوترێ "هاوسەرگیری ناوخۆیی". بە پێچەوانەوە هاوسەرگیری ئەگەر کۆسپی دینی، مەزەبی، خێڵایەتی، نەتەوەیی لە رێ دا نەبێ، کچ و کوڕ بتوانن لە دەرەوەی خێزان، بنەماڵە، بەرەباب، هۆز، تیرە، خێڵ، دین، مەزەب، نەتەوەکەی خۆی، شو بکات و ژن بهێنێ، پێی ئەوترێ "هاوسەرگیری دەرەکی". لە کوردستان "هاوسەرگیری دەرەکی" دەگمەن و "هاوسەرگیری ناوخۆیی" سیستەمی هەرە باوی ژنوژنخواخی بوە کە ئەویش چەندین جۆری هەبوە، لەوانە:

هاوسەرگیری ناوخۆیی - دینی، هاوسەرگیری ناوخۆیی - خێڵایەتی، هاوسەرگیری ناوخۆیی - شێخایەتی، هاوسەرگیری ناوخۆیی - چینایەتی.

## هاوسەرگیری ناوخۆیی - دینی:

**نمونە: 1**

### هاوسەرگیری ئیزیدی

پێڕەوانی ئۆلی ئیزیدی، لە ناو خۆیان دا هاوسەرگیری ئەکەن. نە ژن ئەدەن بە پیاوێکی نەئیزیدی و نە ژن لە خەڵکی نەئیزیدی ئەهێنن. بە پێچەوانەی ئەمەوە توشی گرفتی دینی ئەبن. رەنگە لە دینەکە دەر بکرێن. توشی گرفتی کۆمەڵایەتی ئەبن، لە ناو خەڵکەکەی خۆیان دا بە چاوی سوک سەیر ئەکرێن.

ئیزیدی لە ناو باوەڕدارانی ئۆلەکەی خۆیشیان دا، پێڕەوی هاوسەرگیری ناوخۆیی ئەکەن. فرەژنی و هاوسەرگیری لە نێوان خزمی نزیک دا ڕێگە پێدراوە. کۆمەڵی ئیزیدی پێکهاتوە لە چەند چینی دینیی - کۆمەڵایەتی (کاست)، لە سەرەوە بۆ خوارەوە: میر، پیر، شێخ، مورید. چینی مورید پێکهاتوە لە کوچەک، قەوال، فەقیر.. ئەم چینانەش لە ناو خۆیان دا ژنوژنخوازی ئەکەن و بۆیان نیە لە دەرەوەی چینەکەی خۆیان

هاوسەرگیری بکەن. هاوسەرگیری ناوخۆیی - چینایەتی بە واتای چینی میر لە ناوخۆی دا و چینی شێخ لە ناو خۆی دا و چینی مورید و چینەکانی تر هەر یەکە لە ناو خۆیدا هاوسەرگیری ئەکا. بۆ نموونە پیاوێک لە چینی فەقیر بۆی نیە لە گەڵ کچێ یا ژنێ یا بێوەژنێ لە چینی ئەمیر، شێخ، قەواڵ.. هاوسەرگیری بکا.

فرەژنی لە ناو ئیزیدی دا ڕێگە پێدراوە.

لەم جۆرە هاوسەرگیریە دا بە دەگمەن ڕەئی ژن وەرگیراوە.

**نموونە: 2**

**هاوسەرگیری یارسانی**

پێڕەوانی ئاینی یارسان (کاکەیی)، لە ناو خۆیان دا هاوسەرگیری ئەکەن. فرەژنی و هاوسەرگیری لە نێوان خزمی نزیک دا ڕێگە پێدراوە. هاوسەرگیری کاکەیی تا ڕادەیەکی زۆر هاوشێوەی هاوسەرگیری ئیزیدیە. کۆمەڵی کاکەیی پێکهاتوە لە چەند چینی دینیی - کۆمەڵایەتی (کاست)، لە سەرەوە بۆ خوارەوە: سەید (کە بە پیر دائەنرێ)، مام (کە بە دەلیل دائەنرێ)، باوە، ئۆمی... ئەم چینانەش لە ناو خۆیان دا ژنوژنخوازی ئەکەن و بۆیان نیە لە دەرەوەی چینەکەی خۆیان هاوسەرگیری بکەن.

لەم جۆرە هاوسەرگیریە دا بە دەگمەن ڕەئی ژن وەرگیراوە.

**نموونە: 3**

**هاوسەرگیری مەسیحی**

پێڕەوانی دینی مەسیحی، لە ناو خۆیان دا هاوسەرگیری ئەکەن، فرەژنی لە ناو ئەوان دا ڕێگەپێدراو نیە.

**نموونە: 4**

**هاوسەرگیری ئیسلامی**

هاوسەرگیری لە دینی ئیسلام دا جیاوازە. لە ڕوی تیۆریەوە هەمو موسوڵمانێ سەرەڕای جیاوازی زمان و نەتەوە و ناوچە و ڕەنگ، چین، بۆی هەیە هاوسەرگیری لە گەڵ هاودینەکانی بکا. هاوسەرگیری لە گەڵ خزمە نزیکەکانی، ئامۆزا، پورزا، خاڵۆزا... بکا. بۆی هەیە چوار ژن بهێنێ. پیاوی موسوڵمان بۆی هەیە هاوسەرگیری لە گەڵ ژنی ناموسڵمان بکا. بەڵام ئافرەتی موسوڵمان بۆی نیە هاوسەرگیری لە گەڵ پیاوی ناموسوڵمان بکا. لە ناو موسوڵمانیش دا مەزەبی جیاواز هەیە. ئەگەرچی ڕێسایەکی ئیسلامی نیە ڕێ بگرێ لە هاوسەرگیری نێوان ژن و پیاوی مەزەبە جیاوازەکان، بەڵام سوننە و شیعە، کە دو مەزەبی دینی ئیسلامن، هاوسەرگیری لە گەڵ یەک ناکەن، ئەگەر بیکەن لە ناو خزم و هاومەزەبەکانیان دا پەسند نیە.

**نموونە: 5**

**هاوسەرگیری ناوخۆیی - شێخایەتی**

لە کوردستان سەدان خێزان و بنەماڵە هەن خۆیان بە نەوەی محەمەد، پێغەمبەری ئیسلام، دائەنێن. خۆیان بە سەید یا شێخ ئەناسێنن. پێیان وایە لە بەر ئەوەی خوا پێغەمبەری لەوان هەڵبژاردوە، ڕەگەزی ئەوان بەرزترە لە ڕەگەزی خەڵکی ئاسایی، بۆیە ئەبێ پارێزگاری پاکی و بەرزی ڕەگەزی خۆیان بکەن. لە ناو خۆیان دا ژن و ژنخوازی ئەکەن. هەتا بۆیان بکرێ ژن بە ژن و خزمی پلەی یەکەمی خۆیان لە ئامۆزا و پورزا و خاڵۆزا ئەهێنن.

لەم جۆرە هاوسەرگیریە دا بە دەگمەن ڕەئی ژن وەرگیراوە.

**نمونە: 6**

**هاوسەرگیری ناوخۆیی - مەزەبی**

دینی ئیسلام دابەش بوە بە سەر چەندین مەزەبی سەرەکی و لە ناو مەزەبەکانیشدا چەندین لقی لێ جیا بۆتەوە. مەزەبی سەرەکی سوننی و شیعیە. مەزەبی سوننی پێکهاتوە لە شافیعی، حەنەفی، حەنبەلی، مالیکی، شیعەش پێکهاتوە لە دوانزەئیمامی و زەیدی... لە پاڵ ئەم مەزەب و لقانەدا هەندێ لقی تر هەن کە رەنگە لە هەندێ پرس دا لە گەڵ مەزەبێ هاورا بێ و لە پرسەکانی تردا لێی جیاواز بێ.

ئافرەتی شیعە بە دەگمەن دراوە بە پیاوی سوننە و، هەروەها بە پێچەوانەشەوە. ئەگەر هاوسەرگیریەکی لەو جۆرە کرا بێ کەسوکاری ژن و پیاوەکە و هاومەزەبەکانیان بە جۆرێکی ئاسایی رەفتاریان لە گەڵ نەکردون.

**نمونە: 7**

**هاوسەرگیری ناوخۆیی - خێڵایەتی**

پێکهاتەی بەشێکی گەورەی کۆمەڵگای کوردی خێڵە. خێڵەکان بە زۆری کۆچەر بون. سەرچاوەی ژیانیان ئاژەڵداری بوە و، هەندێکیان نیشتەجێ بون سەرچاوەی ژیانیان کشتوکاڵ بوە. لە هەردو جۆرە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دا پلەی جیاواز هەبوە. لە ناو خێڵەکان دا: سەرۆک، مەزن، گەورە، ئاغا، بەگ، کوێخا... هەبوە، پلەی کۆمەڵایەتی و ئابوری ئەم توێژانە بەرزتر بوە لە پلەی کۆمەڵایەتی خێڵەکیە ئاساییەکان، بەو پێیە پلەکانی هاوسەرگیریش لە ناو خێڵەکەدا جیاواز بوە. پیاوانی پلەکانی سەرەوە لە ناو خۆیان دا ژنوژنخوازییان کردوە هەروەها بۆیان هەبوە ژن لە پلەکانی خوارەوەش بهێنن. بەڵام ئەوانی خوارەوە بۆیان نەبوە ژن لە توێژەکانی سەرەوە بهێنن.

لەم جۆرە هاوسەرگیریە دا بە دەگمەن رەنی ژن وەرگیراوە.

**نمونە: 8**

**هاوسەرگیری ناوخۆیی - چینایەتی**

لە ناو شار و گوندەکان دا، لە ناو دانیشتوانی جێگیردا، کە دابەشبونی کار و پیشە و، لە ئەنجامی ئەوەش دا دابەشبونی پلە و پایەی کۆمەڵایەتی، تەنانەت دابەشبونی گەرەک و کۆڵانی تێدا دروست بوە، چینی ئابوری - کۆمەڵایەتی دروست بون. سەردەمێ پیشەی ئازاد و خاوەنێتی موڵک و کار و، سەردەمێ کارمەندی حکومەتی و هاوولاتی ئاسایی جیاواز بون. ئافرەتی چینەکانی خوارەوە دراوە بە پیاوی چینەکانی سەرەوە، بەڵام ئافرەتی چینەکانی سەرەوە نەدراوە بە پیاوی چینەکانی خوارەوە. ئەگەر هاوسەرگیریەکی وەها روی دابێ کێشەی لێ دروست بوە. زۆر جار ئەو ئافرەتە لە لایەن ماڵە باوانیەوە ئافەرۆز کراوە، پەیوەندی کۆمەڵایەتییان لە گەڵ بریوە.

نمونەی ئەمە لە گێڕانەوەی هەندێ سەرگروشتە و چیرۆک و بەیتە کوردییەکان دا دوبارە بۆتەوە.

لە "بەیتی مەم و زین" دا لە گفتوگۆیەکی خاتو زین و کارەکەرەکەی دا بە رونی دیارە: "مەلک رەیحانیان دەرکرد بو، بانگیان کردەوە. مەلک رەیحان بازیبەندی لە قۆڵی خۆی کردەوە. لە پێش پایە زینی دانا، گوتی: ئەمن چی دی قەرەواشیە ناکەم. پایەزین گوتی: لە بەر چی؟ گوتی: پایە زین، ئەتۆ دەچیە شەوگەردییە، ئەمن نابەی. خاتون زین گوتی: ئەمن چومە کوێ؟ گوتی: ئەمشەو هەمو شەوێ چویە شەوگەردییە، ئەمنت بۆ نەبرد دەگەڵە خۆت؟ گوتی: جا تۆ بۆ زیز دەبی؟ ئەگەر هاتن قەرارمان بێ ئاغا بۆ

من. نۆکەر بۆ تۆ! ئەو قەرارەیان پێکەوە کرد." *(ئۆسکار مان: توحفەی موزەفەرییە. عەلی ئانەوازاده. هەولێر - 2013: 97)*

لە بەیتی "مەحمەڵ و برایم" دا جیاوازی چینایەتی لە کێشەی ناکامیی هاوسەرگیری دڵدار و دڵخوازدا ڕەنگی داوەتەوە. مەحمەڵ و برایم دو شوانی خاوەن مێگەلی گەورە بون. نیشتەجێی ئەشکەوت بون. برایم بە ئاگاداری دایکیان بڕیار ئەدا ژن بۆ مەحمەڵ بهێنێ. لە ڕێگەی هاتوچۆی بازارەوە بۆ فرۆشتنی ئاژەڵ، ئاسیاوی و ئاشنایەتی لە گەڵ خاتو پەریزادی کچی گەورەی ناوچەکە پەیدا ئەکا. مەحمەڵ و پەریزاد حەز لە یەکتری ئەکەن. باوکی پەریزاد کە لە چینی سەرەوەی کۆمەڵگا بوە کچی خۆی نادا بە "کرمانج" کە لە چینی خوارەوەی کۆمەڵگا بون. پەریزاد ڕەدوی مەحمەڵ ئەکەوێ. باوکی پەریزاد ئەمە بە سوکایەتی و ئابڕوچونی خۆی دائەنێ. لەشکر ئەنێرێتە سەر مەحمەڵ و برایم. هەردوکیان لە شەڕێکی خوێناوی دا ئەکوژرێن. پەریزاد بە گیراوی ئەهێننەوە بۆ لای باوکی. لە سەر تکا و پاڕانەوەی پیاوماقوڵەکانی لە باتی ئەوەی بیکوژن، وەکو سەگ لە چێشتخانەی ماڵەکەیان دا بە دەسبەسەری فرێی ئەدەن. پەریزاد، بێ ئەوەی باوکی لێ ئاگادار بکەن، لە مەحمەڵ ئاوس بوە. پاش مانگێ بە سکێ دو کوڕی ئەبێ. سەرەتا ئەیان شارنەوە. پاشان بە ناوی باوکیان و مامیانەوە ناویان ئەنێن مەحمەڵ و برایم. بەیتەکە بە ڕوداوێکی تراجیدی کۆتایی دێ. *(ئۆسکار مان: 296)*.

**نمونە: 9**

## هاوسەرگیری ناوخۆیی - خزمایەتی

یەکێ لەو نەریتانەی کە باو بوە و ئاینەکانی ئیسلام و ئێزیدی و یارسان ڕێگەی پێ داوە، هاوسەرگیری نێوان خزمی نزیک بە تایبەتی ئامۆزاکان. خاڵۆزاکان. پورزاکان. بوە. بگرە هەندێ جار تا ئامۆزا هەبوبێ ڕێگە نەدراوە ئافرەتەکە بدرێ بەکەسێکی تر. بۆ شیبان و شایستەیی. ئامۆزا یەکەمین بوە. بۆ ئەوەی بە تەواوی بەسترێنەوە و هیچ جۆرە ئازادییەک بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر، نە بۆ کچەکە و نە بۆ کوڕەکە، نەهێڵرێتەوە. هەندێ جار لە گەڵ لە دایکبونیان دا لە یەکتری مارەکراون. شوکردنی ئافرەت بە پیاوی بنەماڵەیەکی تر بۆتە هۆی دابەشبون و بردنی زەوی و سامانی بنەماڵەکە بۆ بنەماڵەیەکی تر. بۆ ئەوەی ئەوە ڕونەدا، سامان و میرات، لە ناو هەمان بنەماڵەدا بمێنێتەوە، پێڕەوی نەریتی هاوسەرگیری خزمایەتی کراوە.

چەندین گۆرانی "دوێت مام" بە کرمانجی و گۆرانی "ئامۆزا گیان" بە سۆرانی: "ئامۆزا تۆ بالا بەرزی/ ئامۆزا تۆ بۆ من فەرزی!/ نیشانەن بۆ پێداگری لە سەر ئەم جۆرە دڵداری و هاوسەرگیریە.

بەیتی "لاس و خەزاڵ" لە سەر هاوسەرگیری ئامۆزایی داڕێژراوە. دو پیاو، دو برا بون. مناڵیان نەبوە. لە خوا پاڕاونەتەوە مناڵیان بداتێ. یەکێکیان کوڕ و ئەوی تریان کچی بوە. هەر کە لە دایکبون لە یەکیان مارە کردون. لاس بە دەزگیرانەکەی ڕازی نەبوە. شەیدای ئافرەتێکی تر بوە. لە تاوا مەڵبەندەکەی خۆی بە جێ هێشتوە. بۆ ئەوەی لە دڵخوازەکەی نزیک بێ بۆتە نۆکەری باوکی. هەر لە سەر ئەو، خۆی بە کوشتن داوە. *(ئۆسکار مان: 154)*

بەیتی "شێخ فەرخ و خاتو ئەستێ" کە دڵداری و دڵخوازیەکی ئەفسانەیی هەڵبەستراوە ئەویش هەر لە سەر هاوسەرگیری ئامۆزایی داڕێژراوە.

هاوسەرگیری ناوخۆیی لە سەر بنەمای خزمایەتی لە ناو چەندین گەلی تردا هەبوە. تەنانەت بنەماڵەی شاکانی بەریتانیا پێڕەوی هەمان نەریتیان کردوە و، ژنوژنخوازییان لە ناو خۆیان دا: لە نێوان ئامۆزا، پورزا، خاڵۆزادا، کردوە.

**نمونە: 10**

## ژن بە ژن

ژن بە ژن یەکێ بوە لە شێوە باوەکانی هاوسەرگیری ناوخۆیی. لە ناو هەمو دین و مەزهەب، لە ناو هەمو خێڵ و هۆز و تیرە و بەرەباب و بنەماڵەکانی کوردستان دا. هاوسەرگیری لە سەر بنەمای ژن بە ژن نەریتێکی پێرەویکراو بوە.

پیاوێ کە ویستبێتی ژن بهێنێ ئەبو لە بەرامبەردا ئافرەتێک: خوشکی، یا ئامۆزای، یا خزمێکی نزیکی، کچی خۆی، هەندێ جار دایکی، بدایە بە لایەنی بەرامبەر. ژن لە خێزانی گوندنشین و لە خێزانی کۆچەردا هەمیشە دەستی کار بوە. بەشێکی گرنگی کارەکانی خێزانەکەی لە بواری ئاژەڵداری و کشتوکاڵ و پەروەردەی منداڵ و کاروباری ناوماڵ دا کراوە. شوکردنی ئافرەتەکە بە پیاوی بنەماڵەیەکی تر دەستێکی کاری کاریگەری لەم بنەماڵەیەدا کەم کردۆتەوە. بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە ژنێکیان لە لایەنی بەرامبەر وەرگرتوە.

## ژن بە ژن بە چەند رێگا کراوە:

ئەگەر ئافرەتی هەردولا لە تەمەنی شوکردن دا بونایە ئەوا لە یەک ئاهەنگ دا هەر لایە بوکی خۆی بردوە و لە نیوەی رێگەدا هەر لایە بوکەکەی خۆی بەوی تر سپاردوە و. بوکەکەی خۆی وەرگرتوە.

ئەگەر ئافرەتی لایەکیان لە تەمەنی شوکردن دا بوایە و ئافرەتی لاکەی تر هێشتا منداڵ بوایە یا لە تەمەنی شوکردندا نەبوایە، گەورەکە ئەگوێزرایەوە بەڵام گچکەکە لە باوک یا برای کچە گوێزراوەکە مارە ئەکرا، بۆ ئەوەی ببەسترێتەوە و نەتوانێ شو بکا یا بدرێ بە شو. لە سەر "گەورە بە گچکە" رێک کەوتون. مارە کراوە تا گەورە بون، ئەوسا ئەویش یا ئەگوێزرایەوە بۆ مارەبڕەکەی یان ئەبو لە لایەن پیاوێکی ترەوە هەڵبگیرایە. هەڵگر بۆی ئەبوە هەڵگیراو بباتە ماڵی خۆی یا ماڵی باوکی. بەڵکو ئەبو بیباتە ماڵی کوێخا، ئاغا، شێخ، یا یەکێ لە دەسەڵاتدارە ناسراوەکانی ناوچەکە. ئەویش بۆی تێ بکەوێ "مەسڵەت" ی بۆ بکا. پاش رێککەوتنی هەردولا، لای مەلا مارە بکرێ و. بگەڕێتەوە سەر ژیانی ئاسایی.

هەندێ جار لە بەرامبەر یەک کچ دا دو کچ و پارە بەوی تر دراوە.

## تەڵاق بە تەڵاق

هەمو جار ژن بە ژن سەری نە گرتوە. هەندێ جار "ژن بە ژن" پێش ئەنجامدانی، یاخود دوای ئەنجامدانی بە "تەڵاق بە تەڵاق" کۆتایی هاتوە. لایەکیان پەشیمان بونەتەوە، یاخود ژنی لایەکیان تۆراوە یا دەستی لە مێردەکەی بەرداوە. یاخود لایەکیان بە ژنەکە رازی نەبوە یا دەری کردوە، ئەوسا لە بەرامبەردا لاکەی تریش "رەفتاری هاوشێوە" ی لە گەڵ ئەوان کردوە، ژنەکەی تەڵاق داوە یان کەسوکارەکەی خۆی زۆریان لێ کردوە بگەڕێتەوە ماڵە باوانی.

## پەراوێز

1. تێبینی: لەم وتارەدا وشەی "ئافرەت" بۆ ڕەگەزی مێینە بە گشتی، وشەی "کچ" بۆ ئافرەتێ کە هێشتا شوی نەکردوە، وشەی "ژن" بۆ ئافرەتێ کە شوی کردوە، بە کار هێنراوە.
2. دەستەواژەی "هاوسەرگیری" بۆ "marraige"، "هاوسەرگیری ناوخۆیی بۆ "endogamy"، "هاوسەرگیری دەرەکی" بۆ "exogamy"، "تاک هاوسەری" بۆ "monogamy"، "فرە هاوسەری" بۆ "polygamy"، "ژن هەڵگرتن" بۆ "bridekidnapping"، "چینی دینی - کۆمەڵایەتی" بۆ "caste"، بە کار هێنراوە.

بۆ کەسێ بیەوێ زانیاری زۆرتر وەربگرێ لە سەر ئەم دەستەواژانە ئەتوانێ لە هەر فەرهەنگێکی سۆسیۆلۆجی دا بۆیان بگەڕێ.

3. بۆ ئاگاداری زیاتر لە سەر چینە دینیەکانی ناو ئاینی یارسان بڕوانە:

محەمەد ئەمین هەورامانی: کاکەیی. (بەغداد - 1984) (ل 21 - 38)

بوار نورەدین: ڕەدووکەوتن لە کەلتووری کوردیدا. (سلێمانی - 2005). دەربارەی چینە دینیەکانی ئۆلی ئێزیدی (ل 210)، دەربارەی چینە دینیەکانی ئاینی کاکەیی (185 - 186).

فۆلکلۆری کوردی، بە هەمو بەشە جیاوازەکـانیەوە، رۆلّێکـی کـاریگەری هەبـوە لە سـەر دروسـتکردنی کەسایەتی مرۆڤی کورد، لە سەر لێکدانەوەی دیاردە سروشتیەکان، وەرگرتنی دیاردە کۆمەلاّیەتیەکـان، راهـاتنی لە سەر خو و رەوشت و هەلّسوکەوتی ناو خێـزان و دەوروبەرەکەی، بە تـایبەتی لە سـەردەمێک دا کە هێشـتا رۆلّــی دەزگاکــانی پەروەردە - دایەنــگە، خوێنــدنگە، زانســتگە، رۆلّــی دەزگــا فەرمیەکــانی حکــومەت - بەرێوەبەرایەتی، کارگێری، دادگا، رۆلّی میدیا - رۆژنامە، رادیۆ، تەلەفزیۆن.. نەبوە یا لاواز بوە.

مرۆڤـی کـورد لە ژێـر کـاریگەری دایـک و بـاوک و ئەنـدامانی خێـزانەکەی دا بـوە، ئینجـا ژیـنگە کۆمەلاّیەتیەکەی ئەگەر گوند یا خێلّ یا شار بو بێ. لە ناو خێزانەکەی خۆی دا فێری قسە و زمـانی ئاخـاوتن بوە، لە ناو خێزانەکەی خۆی دا زانیویتی دینەکەی چیە، لە ناو خێزانەکەی دا ئاشنا بوە بە نەریتە کۆمەلاّیەتیە باو و رێگەپێدراوەکان. لە ناو خێزانەکەی خۆی دا گوێی لە گێـرانەوەی سەرگروشـتە و چیـرۆک و بەیـت و بالۆرە و گۆرانی بوە. لە ناو خێزانەکەی دا فێری پەندی پێشینان بوە و هەوالّی رابوردوان و، باسی مانـگ و رۆژ و ئەستێرە، باسی گیانداری کێوی، باسی کارەساتی سروشتی لافاو و بومەلەرزە و وشکەسالّی و هێرشی سون و کولە و پەتای تاعون و لەرزوتای... بیستوە.

فەرهەنگی کۆمەلاّیەتی لە نەوەیەکەوە گوێزراوەتەوە بـۆ نەوەیەکـی تـر و، نەوەی نـوێ لاسـایی نەوەی پێش خۆی کردۆتەوە. ئەشێ سیستەمی هاوسەرگیری کوردی و شێوە جیاوازەکانی، دیاردەی ژن بە ژن و، ژن هەلّگرتن، دەستێکەلاّوکردنی ژێربەژێری کـچ و کـور و، ژن و پیـاو، لەم چوارچێـوەیەدا لێـک بـدرێتەوە. ئەو نەریتانە پێش ئەو، لە لایەن باووباپیرانیەوە، پێرەوی کـراون، بە میـرات بـۆ ئەم مـاونەتەوە ئەمـیش پێـرەوی کردون و، ئەوانی هاوزەمانی خۆی و دوای خۆی راهێناوە پێرەوی بکەن.

توێژەری کـورد لە رابـوردودا بـایەخێکی ئەوتـۆی بە کـۆکردنەوە و لێکـۆلّینەوەی فۆلکلـۆری کـوردی نە داوە. رۆژهەلاّتناسەکان لەم بوارەدا دەستپێشـخەری و، کـاری گرنگیـان کـردوە. لەوانە: ئەلیکسـاندەر ژابـا، ئۆسکار مـان، باسـیلی نیکیتـین. هەنـدێ لە دەقـی بـابەتە فۆلکلۆریەکـان بە هـۆی ئەوانەوە تۆمـار کـراون و پارێزراون. هەر ئەو کەرەستەیەش، بۆ ئەوان، بۆتە سـەرچاوەی سـەرەکی لێکـۆلّینەوەی زمـانەوانی و هەنـدێ لایەنی ژیانی کۆمەلاّیەتی و ئابوری کۆمەلّگای کوردی.

نوسەری کورد لە نیوەی دوەمی سـەدەی بیسـتەمەوە هەنـدێ بـایەخی داوە بە کـۆکردنەوەی فۆلکلـۆر، ئەویش بە شێوەیەکی زانستی و سیستەماتیک نەبوە، کاری یەکتەنی و پچرپچڕ بوە.

حەیران، بەشێکە لە فۆلکلۆری کوردی. جۆرێکە لە گۆرانی تـایبەت بە هەنـدێ خێلّـی گەورەی کـورد و، هەنـدێ نـاوچەی کوردسـتان. حەیـران وەکـو ئـاواز و وەکـو تێکسـت، نەبـۆتە گـۆرانیەک لە سـەر ئاسـتی سەرانسەری کوردستان بناسرێ و بگوترێ و ببیسترێ.

ڕەنگە بۆ یەکەم جار لە پەنجاکانی سەدەی ڕابوردودا لە بەشی کوردی ئیستگەی ڕادیۆی بەغدادەوە بڵاو کرابێتەوە و، یەکەم کەس کە بە دەنگ لە ڕادیۆ و بە نوسین دەقەکانی بڵاو کردبێتەوە ڕەسوڵ بێزار گەردی بوبێ. *(رسول بێزار گەردی، بژار، بغداد - 1957)*. دوای ئەو لە شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی بیستەم دا لە لایەن هەندێ حەیرانبێژەوە لە سەر شریت تۆمار کراوە و، هەندێ دەقی لە کتێب دا نوسراوەتەوە و، هەندێ نوسەر و مۆسیقاری هەولێری هەندێ بابەتیان لە سەر نوسیوە.

دەقی حەیران، بە تایبەتی ئەوانەی لە زمانی حەیرانبێژە میللیەکانەوە تۆمار کراون، کەرەستەیەکی گرنگ و دەوڵەمەندن بۆ لێکۆڵینەوەی زۆر لایەنی ژیانی کۆمەڵایەتی. بە تایبەتی لە ناو ئەو خێڵ و تیرە و هۆز و، لەو ناوچانەدا کە حەیران یەکێ بوە لە هۆیەکانی دەربڕینی بیروبۆچون و، شاوات و نازارەکانیان و، تا ئەندازەیەکی زۆر نواندنەوەی نەریتە باوەکانی ناو کۆمەڵەکانیان.

ئێستا چەند کتێبێ نوسراون و بڵاوکراونەتەوە تەرخان کراون بۆ باسی حەیران. هەریەکێ لەو کتێبانە، زۆر و کەم، چەند دەقی بڵاوکردۆتەوە، سەرەڕای ئەوەی بە گشتی حەیرانەکان تازەن و، هەندێکیان نوسەرەکان خۆیان دایانناون. ناوەڕۆکی حەیرانەکان بە پێی تێگەیشتنی خەڵکی ئەم سەردەمە گونجێنراون و هەندێ لە بابەتە هەستیارەکانی لێ دەرهێنراون. بۆیە لێرەدا کتێبێ کراوە بە سەرچاوەی باسەکە کە:

یەکەم، دانەری کتێب، دەقی حەیرانەکانی لە زمانی چەندین حەیرانبێژەوە نوسیوەتەوە وەکو ئەوان وتویانە، نەک وەکو ئەو ویستویەتی.

دوەم، خۆی هیچ حەیرانێکی تازەی دانەناوە تێکەڵاوی حەیرانە کلاسیکیەکانی کرد بێ.

ئەویش بریتیە لە کتێبی "ئەحمەد بەحری: گەنجی سەربەمۆر، بەشی یەکەم، (دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم - سلێمانی)

## جوگرافیای حەیران

بە خوێندنەوەی دەقی حەیرانەکان دا ئەشێ سنوری بڵاوبونەوەی وەکو سەرزەمین و وەکو کۆمەڵ دیاری بکرێ.

لە دەشتی هەولێر: لە قەراج، کەندیناوە، شەمامکەوە دەس پێ بکرێ بەرەو شاری هەولێر، بەرەو بەستی شەرغە و بەستۆرە، بەرەو شەقڵاوە و ڕانیە، قەڵادزێ، بەرەو سۆران و چۆمان و برادۆست، بەرەو قەندیل و سپیرێز بەرەو سەردەشت و خانە و شنۆ، بەرەو موکریان، یاخود بە پێچەوانەوە لە موکریانەوە بەرەو دەشتی هەولێر.

ئەم سنورە هەروەک پانتاییەکی فراوانی ئەرز ئەگرێتەوە کە پڕە لە چیا و گرد و کانی و سەرچاوە، لە دەقی حەیرانەکان دا ئەوەندە ناویان هاتوە هەندێ جار بە سەر بیرۆکەی گۆرانیەکە دا زاڵ بوە.

هەروەها پانتاییەکی فراوانی ژیانی دەیان خێڵی گەورە و پچوکی گرتۆتەوە، مامەش، مەنگوڕ، پیران، بڵباس، ئاکۆ، زەرزا، گەورک، سوێسنی، گەردی، دزەیی، زراری، خۆشناو، سورچی، هەرکی، کە جاران بە زستانان نیشتەجێ و بە بەهاران و هاوینان و پایزان کۆچەر بون. لەو ناوچەیە دا گەرمیان و کوێستانیان کردوە و، ناوی عەشیرەتەکان و هەندێ لە گەورەکانیان و، جوانە ناودارەکانیان و تایبەتمەندییەکان باس کراوە.

## بابەتی سەرەکی

کەسایەتیە سەرەکیەکانی حەیران بریتین لە:

- کچێ حەز لە کوڕێ ئەکا.
- کوڕێ حەز لە کچێ ئەکا.

- ژنێکی بە مێرد حەز لە پیاوێکی تر ئەکا.
- پیاوێکی چڵێس، چاو ئەبڕێتە ژنی بە مێردی پیاوێکی تر.
- شۆفارێ کە دوزمانی ئەکا و ئەبێتە باعیسی دو دڵان.
- قاسیدێ پەیامی خۆشەویستی یا کات و شوێنی ژوانی دڵدار و دڵخواز بە یەک ئەگەیەنێ.
- دەسەڵاتدارێ کە پەنای بۆ ئەبرێ مەسڵەتەکە بکا.

بابەتی سەرەکی حەیران دڵدارییە. بابەتەکانی تری، بە تایبەتی راو، ستایشی شێخێ یا ئاغایەک، شەڕ و لەشکرکردن کە تێکەڵاوی کراون، لاوەکین.

دەربڕینی دڵدارییەکەیان سادە و ئاشکرایە. خۆشەویستییەکی دنیایی بێ پەردە و بێ پێچ و پەنا و شاردنەوەیە. باسی بەسەربردنی شەوە بە ماچومۆچ و راموسان و دەسلەملان. باسی رابواردنە بە دەسبردن بۆ سنگ و مەمک گوشین و، تێرکردنی ئارەزو و ویستی جوتبون.

سەیر ئەوەیە ئەم دڵدارانە، ئەگەر بۆ گاڵتەش بێ، بەرێزەوە ناوی یەکتری نابەن. کچ بە خۆشەویستەکەی ئەڵێ: "هەتیمە حەیران" و، کوڕ بە خۆشەویستەکەی ئەڵێ: "کچەتیمە حەیران". ژن بە مێردەکەی ئەڵێ: "مێردە گوڵە".

ئەم دڵدارییە بە مرازگەیشتنی تێ دایە، هەروەک بەیەکنەگەیشتنیشی تێ دایە. بابەتەکانی هەڵگرتن و رەدوکەوتن، پێکگەیشتن و دەسلێکبەربان ئەگرێتەوە.

هۆکانی پەیوەندی بریتییە لە کەسی سێیەم: "پێناو" یا "قاسید"، کە لە نێوان هەردولادا بێ، قسەکانیان بەیەک بگەیەنێ و سەرەنجام وا بکا لە جێیەک کۆ ببنەوە و بە یەک بگەن.

هەندێ لە خێڵەکان کۆچەر بون هاوینان چونەتە کوێستان و پایزان گەڕاونەتەوە گەرمیان. پێ ئەچێ کوێستان شوێنێکی لە بار بوبێ بۆ دڵداری و بە یەک گەیشتن. دڵدارییەکەیان کورت خایەن بوە. چەند مانگی هاوین ماوەی مانەوەی کوێستان بوە. کاتێ خێڵ بەرەوخوار بۆتەوە توشی "دەسلێکبەربان" بون، بە تایبەتی ئەگەر خەڵکی یەک گوند و ناوچە نە بوبن.

ناوەرۆکی حەیران بە کۆمەڵێ ناوی کوردەواری رازێنراوەتە. خشڵی خۆرازاندنەوەی ژنان، جلوبەرگی قەشەنگی ناوچە جیاوازەکانی کوردەواری، ناوهێنانی سروشتی مەڵبەندەکە، گوڵی رەنگاورەنگی وەرزە جیاوازەکانی ساڵ، دیمەنی کەپری هاوینە، کۆچ و کۆچبار، خانوی دەسەڵاتدار، ئەمانە جوانییەکی تایبەتییان بە گۆرانییەکە بەخشیوە.

لە هەندێ حەیران دا ئاماژە بۆ هەندێ بابەت کراوە، ناکرێ وەکو رێکەوت یان حاڵەتێکی تایبەت سەیر بکرێن، بەڵکو لە بەر ئەوەی هەمان بابەت لە سەر زمانی چەندین حەیرانبێژ و، لە چەندین کات و شوێنی جیاواز دا، دوبارە بونەتەوە، ئەشێ وەکو دیاردەی کۆمەڵایەتی لێک بدرێنەوە، وەکو: دڵداری و دڵخوازی نێوان پیاو و ژن لە دەرەوەی چوارچێوەی ژنومێردایەتی و هاوسەرگیری، هەڵگرتن و رەدوکەوتنی ژنی بە مێرد، تەڵاقدانی زۆرەملێ، داوای دەستێکەڵاوکردنی ژێربەژێر، کە ئەمانە لە گەڵ رێکخراوەی بەها بەرزەکانی دینەکانی ئیسلام، مەسیحی، ئێزیدی، یارسان.. و، لە گەڵ رێکخراوەی بەها بەرزەکانی قانونە دانراوەکانی دەوڵەتەکانی ناوچەکە، کە بۆ رێکخستنی پەیوەندی نێوان لایەنەکانی هاوسەرگیری دانراون، ناگونجێن.

حەیران لە بۆنە گشتییەکان و لە دیواخانی ئاغا و بەگ و دەسرۆیشتوانی کۆمەڵ دا، بە ئامادەیی ژمارەیەکی زۆری ژن و پیاوی ئاستی جیاوازی کۆمەڵایەتی و دینی و هۆشیاری، بە دەنگی بەرز وتراوە، کەچی ئەم جۆرە بابەتانە بە ئافەرین و دەسخۆشی لە حەیرانبێژەکە تێ پەڕیوە. گوێ نە دراوەتە ئەو ناکۆکییە ئاشکرایەی لە نێوان ناوەرۆکی حەیرانەکە و بەها کۆمەڵایەتییەکان دا هەبوە.

هەڵگرتنی کچێ کە هێشتا شوی نە کرد بێ، یا بە "گچکەیی" مارەی برا بێ و نە گوێزرا بێتەوە، ئەگەر کەسوکاری، بە پێچەوانەی ئارەزوی خۆیەوە، زۆری لێ بکەن، بیدەن بە کابرایەکی نەویستراو، هەر ئەیسە بەڵام پیاوێک و ژنێک کە بە گرێبەستی "شەرعی"، یا "قانونی"، پێکەوە بەستراون و، بە دوای خۆی دا بەسترانەوەی ئەخلاقیی هێناوە، چۆن ڕێی بە خۆی داوە ماڵ بە شپرزەیی و منداڵ بە سەرگەردانی بە جێ بهێڵێ؟ دوای پیاوێکی تر بکەوێ، هەم پیاوەکەی خۆی - مێرد، هەم پیاوەکەی تر - هەڵگر، هەم ژنەکە - هەڵگیراو، هەم کۆمەڵگاکە قبوڵی کرد بێ و، بە نەریتێکی ئاسایی وەری گرت بێ، سەرۆکی خێڵ، یا کوێخای گوند، یا پیاوماقوڵی ناوچەکە، بە هاوکاری پێشەوای دینی - مەلا، ئەم گرفتە ئاڵۆزەی خاو کرد بێتەوە، خێزانێکی هەڵوەشاند بێتەوە و، خێزانێکی نوێی پێک هێنا بێ؟

نەریتە کۆمەڵایەتیەکان، کە پاشماوەی سەردەمی زۆر کۆنن و لە ناو ئەم کۆمەڵگایانەدا، ماونەتەوە و لە نەوەیەکەوە گوێزراونەتەوە بۆ نەوەی دوای خۆی، بە کارێکی کۆمەڵایەتی ئاسایی ژمێردراون، لە بەر ئەوە ڕەگ داکوتراوتر و بەهێزتر بون لە بەها دینی و قانونی و کۆمەڵایەتیەکان، بۆیە لەو ناوچانەدا کە ئەم کردەوانە ڕویان داوە بە "مەسلەت" کۆتاییان هاتوە، نەک بە تێکچون و پەلاماردان.

## باج ئەستێنی ماچان

### نمونە: 1

### عەوڵای کاولان ئەڵێ:

برا وەرە لە پەرێزی، لە پەرێزە جۆیە
ئەمن ڕەنگم زەرد دەبوو دەگەڵ هەوەهەوی دە پاڵان، خرمە خرمی دە داسان، بە خودای پایز تێکۆیە
شەرت بێ بە شەرتی دە خودای، ئەمن دەست هەڵنەگرم لە بەژنێ بارێک، هەتا وەکوو ئەوێ ڕۆژێ حەززەتەکەی قابیس دێتە خوارێ لە عاسمانێ حەوتەمین، چۆکانم لە سەر سینگی دادەدا، بە ڕۆحێم دەکاتەوە نیسکۆیە
سەد بریا لە بری دە خودای بایە ئەمن خەرج ئەستێنێ ماچان بام:
لە چارۆکە سپی دە مەنگوڕان، لە کەراس ڕەشی دە مامەشان، لە کۆچکە بە سەری دە گەورکان، لە کڵاو بە سەری دە محاڵیان، لە شەدە بە سەری دە بانەییان، لە خەزێم شۆڕی دە پژدەریان، لە بەرۆک بە دراوی دە سوێسنیان، لە بێورە بێوران، لە کاولە دووکانێ، لە شل و ملی دە سەردەشتیان، بە عام هەموو نوێژی نیوەڕۆیە.
*(ئەحمەد بەحری، گەنجی سەربەمۆر: 217)*

### نمونە: 2

### فەقێ رووزە ئەڵێ:

دەڵێم: بریا خەرج ئەستێن و باج ئەستێنێکی ماچان بام:
لە سەر شیوی موکریان، لە نێو عێلی زودک و زوراریان، لە سەر کۆچکەرووی دە شۆڕان، لە سەر حەوزی شێخاڵی، لە بێورە بێوران، لە بن بیە دووکانان، لە سەر شل و ملی سەردەشتیان، بەڵان خۆشە هەمو دێوارانت گرتبایەوە ئامان نێزەڕۆیە.

*(بەحری: 173)*

**نموونە: 3**
**ڕەسوڵ شێرمۆخ ئەڵێ:**

ئەرێ کیژۆڵێ دە سەت خۆزێ ئەمن گوڵێک بام لە گوڵی دە هەلاڵێ
شین ببام لە تیلەی کوێستانی قەندیلی مامەکۆیان. بەرابەر قەسری، لە سەر گـۆمی
قووچی قەزەنی، ڕەندۆڵی زەرزایان. بەرانبەر و پێشاوپێش بە کاوله گرژاڵێ
ئەمما ماچ و شەوڕامووسانم لە کوێ پێ خۆشن؟
لە تانج بە سەری دزەییان، لە لفکەشۆڕی گروێسیان، لە کڵاوزرێ شۆڕیان. لە نێـو
کیژی بێوره و بێوران، لە شەنگەبێری باسـتاوێ و پـاگردان. لە بـن پـانکوڵێ دە
ڕەشماڵێ.

*(بەحرێ: 190)*

**نموونە: 4**
**حەمە کوێری بێژوێ ئەڵێ:**

دە وەرە براینە، هەورێکی هێنا لە من گەوارە گەوارە.
ئەوە گەواری شینە، لە من تەڕ دەکا مەغڵەت و مەغڵەتان. کلـکەی گـوێزێ، سـەری
دارەبزمارە،
سـەر و کەلـلەی شـەنگەبێرییان، بـاغەڵ شـۆڕێ دزەیيـان، مەشـرەف خۆشـی
هەولێرییان، مەمک خڕی کۆییان، دەربەند و دەربەندنان، شار و دوکـانی قەڵادزێ،
چارۆکەسپی مەرگێ، کۆچکە بە سەری پژدەرییان، پشتێند شلوملی ئالانی، پایز و
بەهاران، لە سەر ڕێیە عێلێ کۆچی کۆچبارە.

*(بەحرێ: 193)*

**نموونە: 5**
**قادر زاڵە ئەڵێ:**

ئەوڕۆ ماڵە بابی بەژنێ باریک هەڵیاندەدا لە قووچی قەفڵانان، بەرەو کەونەلاجانێ
خۆزێ لە خۆزێ دە ئیمانداران ئەمن خەرج ئەستێنێ ماچان بام:
لە گومبەزی سوڵتان عەبدوڵڵای عەرەبی، کلکەی حوسێنی غازی، لە دەرکی قەڵاتـی
کاوله هەولێرێ، لە مزگەوتی مەلا جامی، حەمامی پووتی، شەقڵاوێ ڕەنگـین، سـەر
کانی کاوله سەقاوێ.

*(بەحرێ: 154)*

**نموونە: 6**
**کەریم ئالانی ئەڵێ:**

ئەمن ئاشقم بە شل و ملێ ناسک بە دراوێ
پاشپانیە خڕێ، داوودەلینگ جوانێ، بووکی کاکلاغای گلۆلانێ،
چەند جوانە ئێواران دێتەوە لە سەر ڕێی سەراوێ، چەند بە خان و مانێ.
*(بەحرێ: 225)*

## خوشکی نیە بیدا بە ژن

هەندێ جار کوڕ ئەگەر خوشکی نەبوبێ ژن بە ژنی پێ بکا تا کۆتایی تەمەنی بە ڕەبەنی ماوەتەوە. یاخود ناچار بوە لە ناوچەکەیان دا ئافرەتێ بدۆزێتەوە. کچ بێ یا ژن رازی بکا هەڵیبگرێ، پاشان بەرامبەر "شیربایی" بە پارە مەسلەتی بۆ کراوە. یان ئەگەر نەیتوانی بێ مەسلەت بکا، کابرا لە گەڵ ئافرەتەکە سەری خۆی هەڵگرتوە بە یەکجاری ڕۆیشتوە بۆ ناوچەیەکی دور کە دەستی کەسوکاری کچ/ ژنە هەڵگیراوەکەی پێ نەگات.

**نمونە: 1**

**ڕەسوڵ شیرمۆخ ئەڵێ:**

دەڵێم: کیژۆڵێ! ئەورۆ ئێواریێ زەینی خۆم لە بۆ دەدایە ناوەندی عاسمانێ،
ئەستێرێک هەڵدەهات لە لای کاولە یەمەنێ
ئەمما کۆ و تەرازوو و حەوتەوانە گەلێک دوورن، دە چ پکەمێ نایگەنێ
ئەرێ کیژێ! پەرچەمت سۆرە مەینێ دە خەنێ
وەسیێتە لە پاش من، ئەوان جووتە زەرمەمێ دە باغەڵێت دە دەست کەس مەنێ
هەتا لە بۆ خۆم دێم کەپرێکت لە بۆ ساز دەکەم، لە سوێسنێ، هەڵاڵێ، بەیبوونێ،
لە سوورەگوڵێ، پەرژین لە ڕەشەڕەیحانێ، لە گوڵی دە کاولە مەوتەنێ
ئەمما من چ خوشکی لە دای و باب شک نابەم،
ئەوێ کەڵەگەتێ، بەژن بارێکیم، بە ماڵی دنیایە نادەنێ
ئەمما ئەمن چەندم حەیف و خەفەتی لەوێ کەونە دنیایە دەکوژن لە بۆ وان:
گەورەکچی دە مەزنە مالان، ئەگە شەوێ دە سێیاری نیوەشەوێدا، کەلەکە و
کەلەکان دەگۆڕن و، ئاخان دەخۆنەوە بە تاقی تەنێ.

*(بەحری: 190)*

## ژن هەڵگرتن

ئەو دڵداریەی لە حەیران دا باس کراوە و لەوانە بوە بە هاوسەرگیری کۆتایی هاتبێ شێوەکانی جیاواز بوە لەو جۆرە "هاوسەرگیری ناوخۆیی" یانەی کە باو بون. ئەم جۆرەیان ڕەنگە ڕاستتر وابێ بە "هاوسەرگیری دەرەکی" دابنرێن، لەوانە:

- هەڵگرتنی کچی مارەنەکراو.
- هەڵگرتنی کچی مارەکراوی نەگوێزراوە.
- هەڵگرتنی کچی مارەکراوی گوێزراوە.
- هەڵگرتنی ژنی شوکردوی بێ مناڵ.
- هەڵگرتنی ژنی شوکردوی مناڵدار.

لە ناو ئەو عەشیرتانەدا ژن هەڵگرتن و ڕەدوکەوتنی ژن و مەسلەت نەریتێکی باوی هاوسەرگیری بوە. ڕەنگە ژن و پیاوەکە هاوخوێن، یا هاوتیرە و هاوخێڵ، تەنانەت هاودینی یەکتری نە بوبن.

ئافرەتەکە کە رەدوی پیاوەکە کەوتوە و پیاوەکە هەڵی گرتوە:

- ئەشێ کچێ بوبێ بە شو نە درابێ و. بۆ خزمێکی نزیکی خۆی یا بۆ کەسێکی دیاریکراو نـاوبێر نە کرابێ.
- ئەشێ کچێکی مـارەبڕاو بـو بـێ لە پیاوێـک بەڵام لە بەر کەمـی تەمەنـی یـا هەر هـۆیەکی تـر نە گوێزرابێتەوە بۆ ماڵی مارەبڕەکەی و هەر لە ماڵی باوک یا برای ما بێ.
- ئەشێ ژنێکی بە مێرد بوبێ گوێزرابێتەوە بۆ ماڵی زاوا بەڵام هێشتا منالی نە بوبێ.
- ئەشێ ژنێکی بە مێرد بوبێ گوێزرابێتەوە بۆ ماڵی زاوا بەڵام منالێ یا چەند منالێکی هەبوبێ.
- پیاوەکە/ کوڕەکە. بە نهێنی دور لە چاو و ئاگـاداری کەسـانی پێوەندیـدار لە گەڵ کـچەکە/ ژنەکە رێک کەوتوە کە بڕۆن و پەنا بەرن بۆ ماڵی کەسێکی دەسەڵاتدار وەکو: مێر. کوێخـا. ئاغـا. بەگ. لە ماڵەکەی ئەودا خۆیان حەشار بدەن و پاش ماوەیەک ئاشکرای بکەن و. خاوەن مـاڵی پەنـادەر کەوتۆتە پێوەندی لە گەڵ ماڵی هەڵگیراوەکە بۆ ئەوەی "مەسلەت" یان بۆ بکەن و پێکیان بهێنـنەوە و هەڵگر و هەڵگیراو بگەڕێنەوە ناو گوند. ناوچە. عەشیرەتەکەی خۆیان.
- مەسلەت. کە ئەبو بە پێکهاتن و رازیبونی هەردولا تەواو ببێ. بە چەند جۆر کراوە:
- پیاوی هەڵگر کچ/ ژنی داوە بە پیاوی ژنهەڵگیراو لە گەڵ هەندێ پارە یا دارایی.
- کچـێ کە مـارە کـرا بـێ و نە گـوێزرابێتەوە نـرخەکەی کەمتـر بـوە لە ژنێکـی بە مێـرد کە گوێزرابێتەوە.
- ژنێکـی گـوێزرابێتەوە و مێـردی هەبـوبێ و منـاڵی نە بـوبێ نـرخەکەی کەمتـر بـوە لە ژنێکـی گوێزرابێتەوە و منالی هەبوبێ.
- ژنێکی گوێزرابێتەوە و مێردی هەبوبێ و منالی هەبوبێ و تا منالی زۆرتر بوبێ گرانتر کەوتوە لە سەر پیاوی هەڵگر.

گرانبونی پەیژەیی نرخی هەڵگیراو بە گوێرەی گوێزرانەوەی ژن و نە گوێزرانەوەی. هەبون و نەبـونی منـاڵ. کەمـی و زۆری ژمـارەی منـاڵ. گەڕاوەتەوە بـۆ ئەوەی کـابرای ژنهەڵگیـراو. لە بەر ئەوەی منالەکـانی بە سەردا بە جێ هێڵراوە. هەتا منالی زۆرتر بوبێ. ئەرکی زۆرتر بوە و. ژنی دوەمـی بە زەحمەتتـر پـێ رازی بوە.

کەسێکی کە هەڵگیراو براوەتە ماڵەکەی لە بەر پیاوچاکی و بە خـۆڕایی دالـدەی هەڵگیـراوی نە داوە و مەسلەتی بۆ نەکردون. لە کرێی دالـدەدانی هەڵگیـراوەکە و. ئەنجامدانی "مەسـلەت" هکەدا چەردەیەک پـارەی لە هەڵگر یا لە کەسوکاری هەڵگر سەندوە.

هاوسەرگیری کە لە ئەنجامی هەڵگرتن دا تەواو بوە بە بێ زەماوەن تێ پەڕیوە و. پێویسـتی نە کـردوە زاوا خزم و ناسیاوەکانی بانگ بکا بۆ گێڕانی ئـاهەنگی شـایی و بەزمـی هەڵپەڕکـێ و نـان خـواردن. زاوای کەمدەرامەت ئەو "مەسرەف" ەی لە کۆڵ بۆتەوە. بوک بە بێدەنگی گوێزراوەتەوە بۆ ماڵە تازەکەی.

هەڵگرتن ئەریتێکی تایبەت نیە بەم خێڵە کـوردانە. زۆر لە گەلانـی قافقـاس بـۆ هاوسـەرگیری هەمـان ئەریتی کۆمەڵایەتی‌یان پێڕەوی کردوە و تا ئێستاش پێڕەوی ئەکەن. لەوانە: چیچانی. داغستانی. کازاخستانی. بەشێکی ئازەربایجان.

## گەفی هەڵگرتن

**نمونە: 1**
**خلە دەرزی ئەڵێ:**

ئەوجار حەیران دە بلێ سەت جاران کوڕ گاز دەکا: بابە من چ پکەم ئێـواران بە
تەنێم خەو نایە
دە زوو لە بۆم برۆن نە بۆ کن مەلایان، ریش سـپییان، کەیخودایـان، پـارەزۆران،
زۆرداران. بۆم بچنەوە کن بـابی نـازدار حەیرانـێ. هەنـدێکم بـۆ بـکەن تکـایە،
هێندێکم بۆ تێکەون بە ماڵی دنیایە
پێی بڵێن بە بابی خەزێم شۆڕێ: ئەگەر دەمداتێ بەژنێ باریک و زەندێ بە بازن
گەلێ گەلێکم پێ چاکە. دەنـا بێیـتە سـوێند و قورعانـان هەڵیـدەگرم، سـەفەرێکی
دەکەم هەروەکی ناسر و ماڵماڵان لە بۆ کن خەلیفەکەی بەغدایە.

*(بەحری: 199)*

**نمونە: 2**
**عەلی گەردار ئەڵێ:**

ئەوڕۆ ئەوە کاکینە بە ڕۆژ هەراسانم. بە شەوێم خەو نایە
ئەوە بۆم بڵێن بە کەیخودایان. بە دەوڵەمەندان، پیاوماقووڵان. بـۆم بچـنەوە کـن
بابی خەزێم شۆڕێ. هەندێکیان بۆم پکەنەوە تکایە. هەنـدێکیان بـۆم تـێکەون بە
ماڵی دە دنیایە
خـۆ مـن سـوێندم خـواردوە ئەگە خەزێـم شـۆڕم نە دەنـێ، پیلـی دەگـرم، چـووکەڵە
سەفەرێکی دەگەڵ دەکەم. وەکوو ناسر و ماڵماڵان بۆ کن خەلیفەکەی ماڵ لە بەغدایە.

*(بەحری: 162)*

کوڕی حەیران هەڕەشەی کـردوە کە ئەگەر کـچەکەی بە مـاڵی دنیـا و بە ڕجـا و تکـای پیاومـاقوڵانی ناوچەکە نە دەنێ هەمان ڕێگەی ناسر و ماڵماڵ ئەگرێ. بەیتی "ناسر و ماڵماڵ" هێنانەوەی نمونەی ئەم بەیـتە جۆرێکە لە هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە. "چوکەڵە سەفەرێک"، کە حەوت ساڵی خایاندوە، کردوە بۆ لای "خەلـیفەی بەغدایە". ئەوسا گەڕاوەتەوە و، دڵخوازەکانیان بە زۆر سەندوە.

ناسر و ماڵماڵ دو گەنجی خاوەن ڕان و لەوەڕگا بون کەسێکی لە خۆیان بە دەسەڵاتتر لێی داگیر کـردون کە سێ کچی هەبوە، ناسر حەز لە خاتون تەورێز و ماڵماڵ حەزی لە خاتو ئەسمەر کـردوە. خوازبێنیـان کـردوە نە یان داونەتێ. داوایان لە کچەکان کردوە هەڵیان بگرن. کچەکان ڕازی نەبون ڕەدویان بـکەون. بەڵکـو داوایـان لێ کردون برۆن پلەوپایەی کۆمەڵایەتی بە دەس بهێنن ئینجا بچـنەوە خوازبێنیـان. لە بەرامـبەر دا پەیمانیـان لە گەڵ بەستون، جگە لەوان شو بە کەسی کە نەکەن و، تا ئەوان نەگەڕێنەوە چاوەڕێیان بن.

ناسر و ماڵماڵ سەری خۆیان هەڵگرتوە. ڕان و کوێستانەکەیان بە جـێ هێشـتوە. شـاران گەڕاون تـا ڕێگەیان گەیشتۆتە بەغداد. لە بەغدا کاریـان کـردوە نە یـان توانیـوە هـونەری خۆیـان بنـوێنن و، سـەرنجی گەورەی بەغداد رابکێشن. تا شاری بەغداد لە لایەن شـێخێکی عەرەب و خـێڵەکەیەوە گەمـارۆ دراوە. بـون بە نۆکەری گەورەی شاری بەغداد. بەغداد و دەسەڵاتی گەورەی بەغداد کەوتۆتە مەترسیەوە. شەڕ قەوماوە. چەنـد

جاریٰ هێزی گەورەی بەغداد شکاوە. تا ناسر و ماڵماڵ وەکو دو پاڵەوانی هەڵکەوتو بۆیان چونەتە مەیدانی شەڕەوە. پاڵەوانەکانی شێخی عەرەبیان کوشتون و، شێخەکەیان بە دیل گرتوە و بردویانە بۆ گەورەی بەغداد. گەورەی بەغداد لە گەڵ شێخ پێکهاتوە پەیمانی ئاشتی بەستوە. لە پاداشتی ئەم سەرکەوتنەدا ویستویەتی ناسر و ماڵماڵ خەڵات بکا. ئەوانیش داوایان لیٰ کردوە خاوەنێتی شوێن و لەوەرگاکەی خۆیان و دەسەڵاتداریێتی ناوچەکەیان پیٰ بسپێریٰ. گەورەی بەغداد ئەو فەرمانەی بۆ دەر کردون.

ناسر و ماڵماڵ بە سەرکەوتویی و سەربەرزی و، بە پلەوپایەی فەرمیەوە دوای حەوت ساڵ دوروڵاتی گەڕاونەتەوە مەڵبەندی پێشوی خۆیان. لەو ماوەیەدا خاتون تەوریز بە زۆری هەڕەشەی باوکی دراوە بە کابرایەکی تر کە بۆتە شوانی مێگەلەکانی و کوڕێکی لە خاتون تەوریز بوە.

بۆتە شەڕ لە نێوان ناسر و ماڵماڵ و دەسەڵاتداری ناوچەکە کە باوکی دڵخوازەکانیان بوە. باوکیان کوشتوە، شوانەی مێردی خاتو تەوریز و کوڕەکەیان کوشتوە. لە دوای ئەم روداوە خوێناوییانە ئینجا بە دڵخوازەکانیان شاد بون. *(توحفەی موزەفەرییە: 177 - 209)*

## هەڵگرتنی بە زۆر

دڵدار بە ناواتی خواستوە ئەگەر بۆ چەند رۆژێکیش بیٰ هێندەی میری سۆران دەسەڵاتی هەبوایە. بۆ ئەوەی بچێتە سەر ماڵی دڵخوازەکەی بە زۆر لە مێردەکەی داگیر بکا. میر محەمەد، دوایین میری سۆران (؟ - 1838)، لە سەردەمی میرایەتیەکەی دا، بیٰ بەزەیی بوە. بۆ جێگیرکردنی ئارامی و ئاسایشی وڵاتەکەی و، جێبەجێکردنی شەرعی ئیسلام، زەبروزەنگی زۆری نواندوە. ترس و تۆقاندنێکی بیٰ ئەندازەی لە ناو سنوری قەڵەمڕەوەکەی دا بڵاو کردۆتەوە. سەری بە ناحەز و نەیار دانەواندوە یا لە ناوی بردوە. کەس نەی وێراوە سەرکێشی یا سەرپێچی لە فەرمانەکانی بکا. لەشکرکێشیەکی گەورەی کردۆتە سەر شەنگار و مەڵبەندی ئیزەدیەکان. زۆری پیاوەکانی کوشتون. ژن و منداڵەکانی گرتون و بە دیلی هێناونیەتیەوە بۆ رەواندز. دابەشی کردون بە سەر جەنگاوەرەکانی و بە سەر خێزانی دەسەڵاتدارەکانی ناوچەکەی دا. *(بۆ ئاگاداری زیاتر دەربارەی ئەم بابەتە، بڕوانە: حوسێن حوزنی، مێژوی میرانی سۆران، چاپخانەی کوردستان، 1962)*

**نمونە: 1**

**قادر دریازی ئەڵیٰ:**

ئەمن دەڵێم: حەیران ئەورۆ دەربەند لە کاکی خۆ بە تاقە
دیسان دەڵێم: براینە ئەمن زەینی خۆ دەدەمەوە کوێستانی دە عەزیم، شین دەبێتەوە لە گوڵی دە سوور، ناوەڵڵا بە عام گوڵە مێلاقە
بریا خۆزیٰ لە خۆزێداری دە دنیایە، من سیٰ رۆژانم حوکمی میرە کوێرەی رەواندزیٰ بە دەست با، ئەمن چووبامەوە سەر گولە کوڵەی دە گولەمێردان، بە حوکمی خەنجەریٰ، پێم فڕیدابانەوە هەر سێک تەڵاقە.

*(بەحری: 220)*

**نمونە: 2**

**مام ئەڵڵا ئەڵیٰ:**

کوڕینە هەولێرۆک لە من بە تاقە
ئەمن لە بۆت دەچنم سوێسنە، هەڵاڵە، بەیبوونان، لە نواڵان وردە مێلاقە

کوڕینە چەند خۆشە حوکمی وەزیرە کوێری رەواندزێت پـێ بـێ، پچـیەوە سـەر گولەکی دە گولەمیرداں، بە حوکم لێی وەرگرێوە هەر سێک تەڵاقە.

(بەحری: 170)

## هەڵگرتن بۆ دور

**نمونە: 1**

**عەولا گولناز ئەڵێ:**

ئەوە بەستۆک لە بەر تەلانی
نازداریێ ماڵان راوەستاوە: لە کۆشکان، لە پەنجەران، لە شانشـینان، دوودەریـان.
ناوەڵڵا نازێ دەکا بە تای کەتانی
ئەمن سوێندخۆرم دەگەڵ بەژنێ باریک، ئەمە دەستی خۆمـان پێـک دەگـرینەوە، دەچینەوە سەر چاکان، سەر پیران، سەر شەخسان، ناوەڵڵا سەر مەرقەدی شـێخی بورهانی
ئەگەر لەوێمان مەخسود حاسڵ بوو چاکە، دەنا ئاوا دەبینەوە ئەوبیـو، دەبیـنەوە بە رەعیەتی ئەلمانی.

(بەحری: 156)

**نمونە: 2**

**مەحمەڵ ئەڵێ:**

ئەوڕۆکانە ئاشقم بە ناسکی ناسک بەدەنێ، قەد بە کەمبەرە
مل بە هیزاریێ، قۆڵ بە بازنێ، پەنجە پڕ لە ئەنگوستیلە
دەیکـوت مـاڵم خەرا بـوو وەڵـلا بەژنــێ باریـک مەڕۆ، ئەمـن لە بیسـت و دوو عەشیرەتانی هەڵدەگرم، ئاوای دەکەم لە دیوی ئێرانێ
مەسڵەتێم بۆ پکەن بە زەبری دە پـوولێ، بە حـوکمی دە لیـرێ، بە تێسـکوڵێ دە تفەنگێ، بەڵام مەسڵەتیان لە بۆ کردم چاکە، دەنا پیلـی بەژنـێ باریـک و نـازدار حەیران دەگرم دەڕۆمە خوارێ، لە بۆ شارەکەی بازیانێ.

(بەحری: 158)

**نمونە: 3**

**مام ئەڵلا ئەڵێ:**

کوڕینە! ڕۆژ دێتە دەرێ پریشکان داوێ،
شـۆق و شـەبەقی خـۆی دەدا: لە کۆشـکان، لە پەنـجەران، لە دوودەریـان، لە شانشینان، زینگۆڵەی دە خۆی داوێ لە بریقەی دە قەتڵاوێ
کوڕ دەڵێ: بەژنێ باریک هەڵدەگرم، دەیبەمە ماڵە میرانی ئەحمەدبەگی، بۆم دەکـا مەسڵەتێ، ماڵی لە شەقڵاوێ.

(بەحری: 168)

**نموونە: 4**
**عەلی کەردار ئەڵێ:**

ئەوە کوڕ دەیکوت:
ئەمن ماڵە خۆم کەنگێ بە ورد و وێرانی دەدێ؟
ئەگە دوێنێ ئێوارێ خەزێم شۆڕیان بۆ گولەی مارڕ باب دەڕازاندەوە
شێعەبدوڵڵای تەقیلەسپی دەنگم ناتگاتێ. بۆ تۆم هاوارە.

(بەحری: 162)

## تەڵاقدانی زۆرەملێ

لە هەندێک حەیرانی تردا ئەگاتە رادەی ئەوەی کە بە زۆر بچێتە سەر مێردەکە لە ژێر هەڕەشەی تفەنگ یا خەنجەردا ناچاری بکا دەس لە ژنەکەی هەڵبگرێ و تەڵاقی بدا بۆ ئەم.

**نموونە: 1**
**خلە دەرزی ئەڵێ:**

ئەرێ حەیران دەوەرە لۆت ئەمێنم سەت جاران دەربەند لە من بە ملکە
بیتوێنێ رەنگین لە منی ماڵ وێران و خانە خەرابێ دیارە بە دەلاقە
جا من چ بکەم لە گەرمێنانم سوور دەبوونەوە سوورەگوڵە
ناوەڵڵا لە کوێستانێ دە رەنگینم وە دەر دەکەوتن گوڵووکە مێلاقە
ئامن حەیفێک و پێنسەد و بیست و دوو مخافەتێ
دە وێ بەژن بارێکێم دەکوژن
پار ئەو وەخت و هەندەران لە ماڵە بابی کۆنە یار و دۆستەکەی خۆم بوو
ئەوساڵ لە ماڵە گولەکی دە مێردان لە من بە مارە و تەڵاقە!

(بەحری: 200)

**نموونە: 2**
**محێدین پێنج قیت ئەڵێ:**

ئەوڕۆ حەیران رەندۆڵی زەرزایان لە من بە تاقە
لە سەر کێلەشینی سامرەندان. قەندیلی مامەکۆییان. سپی ڕێزی غەیلانیان. مۆڵی بەرانان. قووچی قەزەنێ. سەری سەفینێ. لە من شین دەبن هەڵاڵە و بەیبوون و سوێسنە. نا بە خوڵای لە باغانم شین دەبن گوڵووکە مێلاقە
ئەوە حەزلێکردنی خەڵکی دەگەڵ کیژۆڵێ چاردە ساڵ و مەمک ئەهاتوون. ئەوە نی منی دڵ بە گەردێ دەگەڵ ژنێکە بە مارە و تەڵاقە
دەبا دەست بەمە تفەنگێ. بە حوکمی تفەنگێ جانبێزار. بە گولێکی دە سەگبابان فڕێ دەمەوە هەر سێک تەڵاقە.

(بەحری: 204)

لە هەمو ناوچەکانی کوردستان و، لە ناو هەمو کۆمەڵەکان دا هەمیشە ژنهەڵگرتن بە "مەسەلەت" کۆتایی نەهاتوە، بەڵکو گرفتی کۆمەڵایەتی گەورەی لێ کەوتۆتەوە. لە هەندێ ناوچەدا بنەماڵەی هەڵگیراو، هەڵگرتنی کچ / ژنەکەی خۆیان بە سەرشۆڕییەکی گەورە داناوە. هەندێ جار بۆتە هۆی ناکۆکی درێژخایەنی نێوان کەسوکاری هەردو لایەن، هەڵگر و هەڵگیراو و، کوژرانی چەندین کەس.

بەیتی "خەج و سیامەند" چیرۆکی یەکێ لەو هەڵگرتنانە ئەگێڕێتەوە کە بە ئەنجامێکی تراجیدی تەواو بوە. خەج و سیامەند ئامۆزا و دڵخواز و دڵداری یەکتری بون. باوکی خەج، لە بەر هەر هۆیەک بوبێ، ئامادە نەبوە خەج بدا بە سیامەندی برازای. سیامەند خەج هەڵئەگرێ بە جوتە ڕو ئەکەنە چیایەکی سەخت. خەج حەوت برای هەبون. کە ئەبیستن خوشکەکەیان هەڵگیراوە هەست بە سەرشۆڕی ئەکەن، بۆ ئەوەی ئەو ڕیسواییە بسڕنەوە شوێنیان ئەکەون بیان دۆزنەوە و بیان کوژن. سەرەنجام، خەج و سیامەند، بۆ ئەوەی بە زیندویی نەکەونە دەست بکوژەکانیان لە بەرزایی شاخەکەوە بە دوای یەک دا هەردوکیان خۆیان هەڵئەدێرن و ئەمرن. *(بەحری، 302)*

## ژوانی نهێنی

لە زۆر حەیران دا کەسێتی پیاوی کورد و کەسێتی ژنی کورد، وەکو نادڵسۆز و ناپاک بەرامبەر پەیوەندییەکانی ناو چوارچێوەی هاوسەرگیری پیشان دراوە. پیاو چاوی بڕیوەتە ژنی پیاوێکی تر و هانی ئەدا بۆ دەستێکەڵاوکردنی ژێربەژێر و، ژن پیاوێکی تری جیا لە مێردەکەی خۆی هان ئەدا بۆ جێ ژوانی نهێنی و بۆ سەرجێگەی خەوتنی خۆی. لە بەر ئەوەی مێردەکەی بە کارێک لە ماڵ دور کەوتۆتەوە بێت و کەڵک لەو هەلە وەربگرێ بۆ ئەوەی لە گەڵی ڕابوێرێ.

**نمونە: 1**

**مام ئەڵڵا ئەڵێ:**

> کوڕینە بای دێ شەماڵە
> لە سەرانم هەورە، بایە، لە دامێنان بەری داوە، ساماڵە
> کیژ دەڵێ: جوابێکم لە بۆ بەرنەوە کوڕە حەیرانێ ئەوڕۆ دوو ڕۆژە، گولەکی دە گولەمێردان، چۆتە کاروانی، بێ دەستەگوڵی خۆی بوەشێنێ، کەڵێن بەتاڵە.
> *(بەحری، 169)*

**نمونە: 2**

**نەناسراو ئەڵێ:**

> ...
> کیژ دەڵێ: ئەمن چ بکەمێ بۆ قاسیدێکی بە بەقا! بمگاتێ ئەوڕۆ ئێواری، دوو دانە ڕۆژە گولێکی گولەمێردان لە ماڵێ نیە، هەی بابە چ بکەمێ، بە خوای کەلێن بەتاڵە.
> *(بەحری، 214)*

**نمونە: 3**

**نەناسراو ئەڵێ:**

> کیژ دەڵێ: چ بکەمێ لە بۆ قاسیدێکی بە بەقا بینێرمەوە کن کوڕەتیو حەیرانێ

ئەورۆ دوو دانە رۆژە، گــولێکی گــولەمێردان، پیســەکی دە پیــاوان. لە مــاڵێ نییە. دەبـا بـێ، بە دەسـتی چـۆپەم بگـرێ شـەمامە و شـەمامی بـاغەڵێ. بـڵا دە حەدووسەدی نیوەشەویدا، دەستی راستەم لە بۆ شل کا، بیهاوێتەوە سەر کەزیـلەی دە نێولانێ.

(بەحری: 210)

**نمونە: 4**

**نەناسراو ئەڵێ:**

کیژ دەڵێ: ئەمـن چ پکەمـێ لە بـۆ قاسـیدێکی بە بەقا! بینێـرمەوە کـن هەتـیمە حەیرانێ، ئەوە دوو رۆژە، گولێکی دە گـولەمێردان، لە مـاڵێ نـیە. بە خـوای جـێ ژوانی من و هەتیمە حەیرانێ چۆڵە.

(بەحری: 211)

**نمونە: 5**

**رەسوڵ شیرمۆخ ئەڵێ:**

ئەوە کیژ دەڵێ: چ پکەم لە بۆ قاسیدێکی گەلێ گەلێ بە متمان!
دەینێرمەوە کن کورە حەیرانێ خۆم، دە حەدە حەدی نیوەشەویدا، دەسـتی خـۆی باوێتەوە سەر گۆیە دە خەنـجەرێ، خـۆ بە خـودای ئەمـن چ پکەمـێ لە مـاڵێ دە مێردانە، هەڵناگرمەوە حەسرەتێ، تەشەنێ، دای تەشەن و غەمان.

(بەحری: 188)

**نمونە: 6**

**حەمە کوێری بێژوێ ئەڵێ:**

کیژ گاز دەکا دەڵێ: غەمان دامەگرە وەکی قەت بە غەمان پێک دایە
تو خوڵا وەرە لاقانم بنێ کۆشێ، رامووسە خاڵی روومەتێ، دەست بدە لە شەمامە و شەمامەرەنگینی باغەڵێ، تەماشا کە شابالی برۆیە
دنیا ژین و مردنە، دەچینە کاولە غەریبایەتێ، دەوەکـی تـۆ دەبیـنمەوە، تـو خـوڵا وەرە گەرنێ تۆم لێ بێ دازا.

(بەحری: 192)

## حەزکردن لە ژنی بە مێرد

یەکـێ لەو بابەتـانەی لە نـاو زۆر دە حەیرانەکـان دا وتـراوە و لە دەمـی زۆرێـک لە حەیرانبێژەکـان دا دوبـارە بـۆتەوە حەزکردنـی پیـاوە لە ژنـی بە مێـرد و حەزکردنـی ژنـی بە مێـردە لە پیـاوێکی تـر جـگە لە هاوسەرەکەی خۆی. لە هەندێکیان دا داوای لێ دەکا مێـردەکەی بە جـێ بهێڵـێ و رەدوی ئەو بـکەوێ. یـان بە پێچەوانەوە ژنەکە داوا لە پیاوەکە دەکا هەڵی بگرێ.

**نموونە: 1**

**ڕەسوڵی نادری ئەڵێ:**

ئەوە بەستۆڕ لە من بەستۆرە، بەستۆڕ بە تاقە
لە سەری بەستۆڕێ، بە قوڕ گیراو، سوور دەبوون سومبل و گیابەنـد و خـاوە، لە دامێنی گوڵووکە مێلاقە
حەزلێکردنی دۆست و برادەران لە کیژی مەمک نەهاتووە، نی من لە ژنی بە مێرد و تەڵاقە.

(بەحری: 182)

**نموونە: 2**

**حەمەڕەسوڵی سۆفی مینە ئەڵێ:**

خۆ من دەڵێم ئەوە دەربەندی بە قوڕێ گیراو لە من بە تاقە
سەری لە من بە قۆنگرە، بنی لە من بە دەلاقە
لە کوێستانەکەی گەرمێنی و گەرمەسێرێ، لە مـن شـین دەبـونەوە هەلاڵـێ، بەیبـوونێ، سوورەگوڵێ، ئەوە لە ڕۆژانەکەی دە عەزیم لە من شین دەبوونەوە گوڵە مێلاقە
ئەو ساڵەکانە، حەوت ساڵی ڕاستە، حەز دەکەم لە بەژنێ باریک، ئەمـان لە مـن بە مارە و تەڵاقە.

(بەحری: 164)

**نموونە: 3**

**دەربەند ئەوساڵ لە منی ماڵ وێران گەلێک بە تاقە**

لە داوێنانی دێنە دەرێ گوڵووکە مێلاقە
بەژنــێ باریــک، پــارەکەینی ئەوان دەمــانە، یــارکۆڵی خـۆم بـوو لە مـاڵە بابـان، ئەوساڵ، لە ماڵێ گولێکی دە گولەمێربان، بە مارە و تەڵاقە.

(بەحری: 179)

**نموونە: 4**

**حەمەڕەسوڵی سۆفی مینە ئەڵێ:**

ئەوە کیژ گاز دەکا: هەتیوە ماڵ وێران!
هەتا ئەمن کیژ بووم دە ماڵی دە باوان، ئەتۆ هـیچ حەول و تەقەلات لە دوای مـن نەدەدا. ئەو ساڵەکانە، ئەمن حەوت ساڵە ناوم کەوتۆتەوە داوێکی دە گـولەمێربان، هەر بە ماڵی دنیایەم دڵ لێ بەر نادا.

(بەحری: 165)

**نموونە: 5**

**نەناسراو ئەڵێ:**

کیژۆڵێ دەربەند لە من بە تاقە
ئەوە لە سەر کوێستانان شین دەبو گیابەند، لە گەرمێنێ گەرمەسێرم دەپشکووتن گوڵە مێلاقە

ئەوە حەزلێکردنی خەڵکان، لە کیژی مەمک نەهاتوو، چ بکەمێ؟ ئی من لە ژنــی بە مێرد و، مارە و تەڵاقە.

*(بەحری: 215)*

**نمونە: 6**
**نەناسراو ئەڵێ:**

کیژ وەڵامێکی بۆ دەناردە هەتیو حەیرانێ:
دەبا بێ هەڵمگرێ لە گولەکەی دە گــولەمێردان، پیســەکەی دە پیــاوان، یــان ئەوێ پایزێ دەستەکەی خۆم لێ بەردا.

*(بەحری: 210)*

## تووک – دوعای شەڕ

لە حەیران دا، کاتێ پەیوەندی کچ و کوڕ رێــگە نــادرێ بە هاوســەرگیری ئاسـایی کۆتــایی بــێ، کچــی دڵخواز و کوڕی دڵدار ناتوانن بە یەک بگەن و خێزانێکی نوێ پێــک بهێــنن، دو شــێوەی جیــاوازی رەفتــاری کۆمەڵایەتی لێ کەوتۆتەوە:

پیاو، کە دڵخوازەکەی نە دراوەتێ هەڕەشەی کردوە، کە ئەگەر بە ماڵی دنیا یــا بە تکــای پیاومــاقوڵان دڵخــوازەکەی نە دەنــێ، هەڵــی بگــرێ بــۆ وڵاتێکــی دور لە مەڵبەندەکەی خــۆی، ئەمە یــاخیبونی پیــاوەکە لە دەســەڵات و بنیــاکی لەوەی چــی ئەقەومێ، دەر ئەخا.

ژن، کە رێگەی نە دراوە لە گەڵ دڵدارەکەی بە یەک بگەن، تووک، دوعــای شــەڕی کردوە لە سەبەبەبکارەکەی، ئەگەر دایک و باوک بوبێ یان دوژمان و شــەیتان و شــــۆفار، ئەمە، خۆبەدەســــتەوەدانی ئــــافرەتەکە بە دەســــەڵات و رازیــــونی بە چارەنوسی خۆی دەرئەخا.

جۆری تووکی ئافرەت رەنگدانەوەی شێوەی ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی ئەو ســەردەمەی قارەمانەکانی حەیرانەکە بوە:

- هەندێکیان، هی کۆمەڵگای کشتوکاڵیە، کە کار بە گاجوت کراوە و، بەرهەمەکەی برنج و گەنم بوە.
- هەندێکیان، هی کۆمەڵگای ئاژەڵــدارییە، کە زاووزێی رانەکەی بە بەران و، ژیانــدنی مــێگەلەکەی لە وەرزی ئەمانی لەوەڕ دا بە قۆری گیای وشککراوە بوە.
- هەندێکیان، هی کۆمەڵگای نیشتەجێیە، کە زستان بۆ گێڕانی ســەربانەکەی لە کــاتی بــاران و، بــۆ ماڵینی بەفر لە کاتی بەفربارین دا، پێویستی بە لاوی بەتوانا بوە.
- هەندێکی تر لەو دوعایانە هەڵگرتنی ژنی کابرای ســەبەبکاری بە ئــاوات نەگەیشــتنەکەی بــوە، کە بــۆتە هــۆی تێکچــونی شــیرازەی خێــزان و ســەرگەردانی منداڵەکــانی و، پەشــێوانی کاروبــاری ناوماڵەکەی..
- هەندێکی تر لەو دوعایانە کەنەفتبونی جەستەیی بون، کە توشی هەرکەسێ بــوبێ بــوە بە بــارێکی گرانی چارەقورس بە سەر کەسوکارەکەیەوە، دەردی قێزەونی گــولی بــوە، کە دوچــاری هەرکەســێ

بوبێ لە کۆمەڵگا دورخراوەتەوە. یا توشبونی دەردی کوشندەی تـاعون بـوە کە هەمویـانی لە نـاو بردوە.

دوعاکـان لە نـاخی دڵێکـی پـڕ لە قینـی کەسـایەتیەکی تێکشـکاوەوە دەرهـاتون. بێبەزەییـانە و لە کـاتی گیرابـونی دا کـاریگەر و مـاڵوێرانکەر و کوشـندە بـون. بەڵام کـاری لە دڵـی ڕەقـی بـاوک و بـرای نەکردوە.

**نمونە:** 1

**فەقێ رووزە ئەڵێ:**

...

دەڵێم: رەبی خودایە! هەر کەسێکی دەبێتە باعیزی دوو دڵان. کوێر بێ لە چاوان، لاڵ بێ لە زمانی. زەرەند بێ لە دەستان. بە مەرەدی میرانـی چـێ. هەمـو لەشـی داوەشێ. بیگێڕن بێرە و بە ویدا.

*(بەحری: 175)*

**نمونە:** 2

**مەحمەڵ ئەڵێ:**

کچەتیـو حەیـران دەڵـێ: هەچ کەسـانێکی مەنـع بـێ، دوودڵان لێـک بکـا، رەبـی بەهارانی گای دە بەر نیری بمرێ. جستانان جحێڵـی سـەربانی. پـایزانی قـۆری سوتاو. ژن هەڵگیراو، تەمەنا دەکەم لە خودای تەبارەک: رەنج بە خەسار بێ.

*(بەحری: 159)*

**نمونە:** 3

**رەسوڵ شیرمۆخ ئەڵێ:**

ئەمن دەڵێم: هەرکەسانێ بەدگۆیی من و نازدار حەیرانی لە بەرە!
دە رەبی بەهاران گای جووتی مرێ. هاوینان ئێستری بەر باری. پـایزان بەرانـی نێو مەڕی. جستانان قۆری سووتاو بێ. ژن هەڵگیراو بێ. کوڕ مردوو بێ. لە بـۆ قیامەتێ کۆست کەوتە و ئاخ هەڵکێش. دڵ بە غەم و رەنج بە خەسار بێ.

*(بەحری: 188)*

**نمونە:** 4

**عەلی کەردار ئەڵێ:**

ئەورۆ ئەوە کیژ دەڵێ:

رەبی خودایە دایک و بابم خوداگیرم بن. پێناودارم بـن رۆژی بـازاڕی قیـامەتێ. ئەگە نەیانهێشت هەتیوە لاوەکەم، ئەوشۆکانە، لە سەر سینگ و مەمکۆڵەم پکەم بە میوانە.

*(بەحری: 163)*

**نموونە: 5**
**مام ئەڵڵا ئەڵێ:**

کوڕ دەڵێ: خوێنی بەژنی باریکم سەتە، دوو سەتە

لە خوداوەنــدی میــری مەزن دەکەم تەڵەبــێ گــولەکی دە گولەمێربانــت بمــرێ،
هەتاوەکوونێ لەبۆخۆم دەگەڵ بەژنی باریک دەگرمەوە دەستەی دەستباری

کوڕینە کێژ دەڵێ:
بابە کۆستکەوتوو بی، قەت کەست نەمێنێ
ئەگە برینجی پچێنی داڕووجانی بێنێ، ئەگە گەنمی دەچێنی زیزانەی بێنێ،
مەمدەوە بە پیرێکی لەوانی بێ ئیختیـاری حەفتاسـاڵە، ئەگە دە سـێباری شـەوێدا
پشتا خۆم پێ هەڵدەکرێنێ.
*(بەحری: 170)*

**نموونە: 6**
**خلە دەرزی ئەڵێ:**

چاوەکەم ئەمن دوعایەکی دەکەم ئەنگۆ وێکرا بڵێنەوە ئامین!
دەک رەبــی ئەو کەســانەی لە مــابەینی دووودڵانــدا دەکەن شــەیتانی و شــۆفاری،
دووزمانی، ئەوەڵی بەهارانی بمرێتەوە گاجووتی بەر دیری، پایزانی بمرێ بەرانی
نێو مەڕی، جستانانی بمرێ جحێڵی سەربانی، سواری تــاعوونی دە مــاڵی کەوێ،
لە سەر بەردی سەخرەتوڵڵایە، ئیمان دەرنەباتەوە لە بەر شەیتانی لەعین.
*(بەحری: 199)*

## لایەنی ئەدەبیی حەیران

هەرچەندە وا باوە دەقی حەیرانەکان لە دەمی کەسانێکی نەخوێندەوار یا نیمچەخوێنـدەوار بیسـتراوە، بەڵام لە رووی داڕشتنەوە ئەشێ بە دەقێکی ئەدەبی - هونەری دابنرێ.

زۆری حەیرانەکان لە سێ بەند پێکهاتوە، سەربەند، ناوبەنـد، پاشـبەند، کەمێکـی چـوار و پێـنج، هەمـو بەندەکان سەرەڕای کورت و درێژییان بە قافیەیەکی هاوئاواز پێکەوە بەستراون، یەکێتی بابەتیان تێ دایە و، مەبەستی بەندەکان بە یەکەوە بەستراون و یەکتری تەواو ئەکەن.

ئەگەر بە پێوانەی عەروزی عەرەبی شی بکرێنەوە، ناکرێ حەیران بە شیعر دابنـرێ. بەڵام ئەگەر گـوێ نە درێتە تەفعیلەی عەروزی عەرەبی و، بە تەرازوی رەگەزەکانی تری شیعر، بە تایبەتی بیرۆکەی حەیـرانەکە و، وێناکردنی بابەتەکانی و، سۆزی دەروونیی دانەرەکەی و، ئاوازی وشە و ئاهەنگی رستەکانی، کێشانە بکـرێ، لە ریزی شیعرە سەرکەوتوەکانی زمانی کوردی دا دائەنرێن. داڕشتن و هۆنینەوەی فۆلکلۆری کوردی، بە تایبەتی حەیران و لاوکـ و ستران و بەیتی کوردی، کە یەکێ بـوە لە تایبەتمەنـدیەکانی فەرهەنگـی کـوردی، رەنـگە لە داڕشتن و هۆنینەوەی لاوژە دێرینەکانی سەردەمی سـۆمەری و ئـاکەدی و بـابلی و ئاشـوری نزیکتـر بـێ تـا عەروزی عەرەبی.

**بۆ ئاگاداری زۆرتر دەربارەی حەیران بڕوانە:**

- ڕسول بێزار گەردی: بژار. بەغداد 1957.
- هەندرێن خۆشناو: خەرمانەی تەمەن (سەرجەم بەرهەمە بڵاوکراوەکانی هونەرمەنـدی گەورەی کـورد ڕەسـوڵ بێزار گەردی). هەولێر - 2012.
- جەمیل سنجاوی: حەیران و چەند بۆچوونێکی تر. هەولێر - 2010.
- حاجی سەعدوڵلای شێخانی: گۆرانی فۆلکلۆری دەشتی هەولێر. هەولێر - 2013.

عەرەبی خێڵەکی بە درێژایی زەمان ڕیچەڵەک "نەسەب" ی خۆی بە لاوە گرنگ بوە. بە سەدان کتێب لە سەر "ئەنساب" ی عەشیرەت و قەبیلەکانی عەرەب نوسراوە. هەندێکیان ڕیچەڵەکی خۆیان تاسەر ئادەم و حەوا ژماردوە. بۆ رونکردنەوەی ڕیچەڵەکی خۆیان و سەلماندنی رەسەنایەتی خۆیان، لە زەمانی عەرەبی دا، لە کۆنەوە کۆمەڵێ دەستەواژەیان بە کارهێناوە، مەعنایەکی دیاریکراو دەبەخشن، لەوانە: عائلة، اسرة، بطن، فخذ، عشیرە، قبیلة، کە هەریەکەیان نیشانەیە بۆ جێگەی گروپێ لە پلەی یەکەمی پەیژەی کۆمەڵایەتی دا تا دوایین پلەی سەرەوەی عەشیرەتەکە. *(بۆ ئاگاداری زیاتر دەربارەی ڕیچەڵەک و پەیژەی ڕێکخراوەی کۆمەڵایەتی قەبیلە و عەشیرەت لای خێڵە عەرەبیەکانی عیراق، بڕوانە: عباس العزاوی، عشائر العراق، الجزء الاول، بغداد - 1937، (ص 37 - 114))* نوسینەوەی ڕیچەڵەک و گەڕانەوە بۆ دۆزینەوەی ناوی باووباپیر، باوک بە دوای باوک دا تا کورەکانی نوح، وەکو عەرەب کردویەتی لە لای کورد، جگە لە چەند گروپێکی دیاریکراو، ئەو گرنگیەی نەبوە و ئەو بایەخەی پێ نە دراوە. لە ناو کوردا ئەوانەی ڕیچەڵەکیان بە لاوە گرنگ بوە، بریتی بون لە:

## یەکەم، بنەماڵەی سادات

کە ئەوەی محەمەدی پێغەمبەری ئیسلامن یا خۆیان بە نەوەی ئەو دادەنێن. ساداتی کورد چەندین "شەجەرە" یان هەیە، هەروەها چەندین کتێبی ئەنسابیان نوسیوە. هەندێک لەو شەجەرەی ئەنسابانە لە کۆتادا دەگەڕێنەوە سەر حەسەن و هەندێکیان دەگەڕێنەوە سەر حسەینی کوڕانی عەلی کوڕی ئەبو تالیب. دوای ئەوانیش بە پێی ناوی کورەکانی ئەوان و ئیمامەکانی شیعە دەبن بە چەند لقێکەوە، لەوانە نەوەی جەعفەری سادق، موسای کازم، ئیمام هەمزە...

## دوەم، بنەماڵەی فەرمانڕەواکانی میرایەتیە کوردەکان

ئەم بنەماڵانە بۆ ئەوەی ڕەوایەتی بدەن بە دەسەڵاتی میراتیی خۆیان، هەریەکەیان ڕیچەڵەک و بنچوبناوانی خۆیان بردۆتەوە سەر کەسێ یا بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوای کۆن. گەشتێ بە ناو شەرەفنامەدا (1596 ز) کە ئاماژەی بۆ ڕیچەڵەکی بنەماڵە فەرمانڕەواکانی کوردستان کردوە و، لەوانەیە زۆریانی لە زمانی خۆیانەوە نوسی بێ، هەریەکەیان ڕیچەڵەکی خۆی بردۆتەوە سەر کەسێ یا بنەماڵەیەکی خانەدان، ئەشێ بە چەند جۆرێ پۆلێن بکرێن:

**نموونە: 1**

**خەلیفەکانی عەباسی**

لەوانە: فەرمانڕەوایـانی هەکـاری. *(شـەرەفنامە: 233)* نامێـدی. (257) فەرمانڕەوایـانی چەمشـکەزەک. (343) ئەمانە ڕێچەڵەکی خۆیان بردۆتەوە سـەر خەلیفەکـانی عەباسـی و. فەرمانڕەوایـانی مەرداسـی. (359) حاکمی کلیس بنجوبناوانی خۆیان گێڕاوەتەوە بۆ سەر ئیمـام عەباسـی مـامی پـێغەمەر. (414). شـەرەفخان خۆی گومانی لە سەر ڕاستیی و دروستیی ڕێچەڵەکی ئەم بنەماڵانە دروست کردوە. بە زمانی هەندێ شـارەزاوە وتویەتی گۆیا یەکێ لە باپیرەکانیان ناوی عەباس بوە. بۆیە بە خۆیان ئەڵێن عەباسی.

**نموونە: 2**

**خەلیفەکانی ئەمەوی،**

لەوانە: فەرمانڕەوایـانی سـلیمانی (سـلێڤانی) خۆیـان بەنەوەی مەروانـی حیمـار دانـاوە. (472). فەرمانڕەواکانی مەحمودی خۆیان بە نەوەی مەروانی داناوە. (557).

**نموونە: 3**

**قارەمانەکانی ئیسلام**

فەرمانڕەوایانی جزیرە بنەچەی خۆیـان بـردۆتەوە سـەر خالیـدی کـوڕی وەلیـد، سـەحابەی پـێغەمەر (272). میرانی جزیرە شارەزای مێژو نەبون. چونکە خالید نەوەی نێرینەی لێ نەکەوتـۆتەوە. ئەبـو بـنەچەی خۆیان ببردایەتەوە سەر کەسێ کە نەوەی لێ کەوتبێتەوە.

**نموونە: 4**

**میللەتی عەرەب**

لەوانە: بنەماڵەی زەرقی. (438) و. هۆزی دونبولی. (569) بـنەچەی خۆیـان بـردۆتەوە سـەر عەرەبـی شام و. حاکمی سۆران بۆ سەر عەرەبی بەغدا. (484).

**نموونە: 5**

**شا و سەرکردە مێژوییەکانی ئێران**

لەوانە: میرانی بدلیس خۆیان بردۆتەوە سەر جاماسـبی کـوڕی فەیـروز پێنجەمـین کیسـرا. (680) و. فەرمانڕەوایانی ساسۆن خۆیان بە نەوەی شـاکانی ساسـانی لە ڕەگەزی کیسـراکانی ئێـران. (380) دانـاوە. گەورەکانی کەلهوڕ خۆیان بە وەچەی گیوی گودەرز. (592) و. میرانی سویدی بە وەچەی بنەماڵەی بەرمەکـی. (458) داناوە.

شەرەفخان بنچیـنەی فەرمانڕەوایـانی ئەردەڵان دەگێـڕێتەوە سـەر ڕەسـەنی خونکـارانی دیـاربەکر. کە ئەوانیش لە نەتەوەی ئەحمەدی کوڕی مەروانن. (195). بەڵام مەئمون بەگی کوڕی بـێگەبەگ. کە خـۆی یەکـێ بوە لە میرەکانی ئەردەڵان. لەو یادداشتەدا کە بۆ سوڵتانی عوسـمانی نوسـیوە ڕێچەڵەکـی خۆیـانی بـردۆتەوە سەر ئەبو عوبەیدەی جەڕاح و ئیمـام عەبـاس *(منکرات بیگە بیگ: 18)* و. کەچـی هەنـدێ لە مێژونوسـەکانی ئەردەڵان بردویانەتەوە سەر ئەردەشیری بابەکان *(مستورە: 14)*. بەڵام سانەکانی هەورامـان خۆیـان بە نەوەی ئەسفەندیار *(ئیمۆنس: 141 ع)* لە قەڵەم داوە.

## سێیەم، بنەماڵەی شێخانی تەریقەت

هەندێ لەم بنەماڵانە، ئەگەرچی نازناوی شێخیان نوسـاندوە بـە نـاوی بنەماڵەکانیانـەوە بـەڵام "سـەید" واتـە نەوەی کوڕانی عەلی نە بون، بەڵکو بە هۆی مانەوەی زۆریان لە سەر بەرماڵ بۆ نوێژ و خواپەرسـتی نـاوی شـێخیان وەرگرتوە. بەم جۆرە شێخانە وتراوە: "شێخی بەرماڵ". بۆ ئیرشاد و ڕاکێشانی مورید و مەنسـوب، بـۆ پێگەیانـدنی خەلیفە و دەروێش و سۆفی، شێخانی تەریقەتی قادری "تەکیە" و شێخانی تەریقەتی نەقشبەندی "خانەقا" یان هەبوە.

**نمونە: 1**

### بنەماڵەی بارزانی

کە بە هۆی تەریقەتی نەقشبەندییەوە نازناوی شێخایەتی‌یان بە دەس هێناوە. سەری بنەماڵەکـەیان لـە شـێخ عەبدوڕەحمانەوە، کە نیشتەجێی بارزان بوە، دەس پێ ئەکا. شێخ عەبدوڕحمان دوای ئەوەی تەریقەتی لە شـێخانی نـەهری وەرگرتـوە، بۆتـە شـێخی تەریقـەتی نەقشـی و، خـاوەنی مەدرەسـە و خانـەقا. دوای مردنـی ئەو شـێخ عەبدوسەلام جێگەی گرتۆتەوە. شێخ عەبدوسەلام خێزانی ناوک و، دوای ئەو کوڕ و نەوەکانی خێزانـی فـراوان و بەرەبابیان پێک هێناوە. شێخانی بـارزان لـە نـاو خێڵـەکانی نزیکـی خۆیـان دا، بـە تایبـەتی تیرەکـانی نـزاری، بەرۆژی، شیروانی، دۆڵەمەری، گەردی، هەرکی بنەجێ... نفوزی دینیی - کۆمەڵایەتی‌یان پەیدا کردوە. نفوزەکـەیان لە تەریقەتەوە بۆتە باوەڕێکی مەزهەبی و، لایەنگرەکانی لە بەرامبەر هەڕەشەی خێڵـەکانی دەوروبـەریان دا بونەتـە خێڵێکی یەکگرتو. لە ململانێ لە گەڵ خێڵەکانی دراوسێیان و، لە گەڵ دەسەڵاتی دەوڵەتی دا، بە چەک بـەرگرییان لە خۆیان کردوە و بونەتە خێڵێکی یەکگرتوی چەکدار. دەسەڵات و نفوزی بنەماڵەی بارزانی نـە لـە سـەر بنـەمای هاوخوێنیە و نە لە سەر بنەمای زەویداری، بەڵکو لە سەر بنەمای باوەڕی دینیە.

نازناوی بنەماڵەکە لە گوندی بارزانەوە داکەوتوە.

*بۆ ئاگاداری زیاتر دەربارەی بنەماڵەی بارزانی بڕوانە: پی ڕەش، بارزان وحرکة الوعی القومی الکردی، 1980.*

**نمونە: 2**

### بنەماڵەی نەقشبەندی،

کە بە هۆی تەریقەتی نەقشبەندییەوە نازناوی شێخایەتی‌یان بـە دەس هێنـاوە. سـەری بنەماڵەکـەیان لـە فەقێ عوسمانی کوڕی خالید ئاغاوە، کە نیشتەجێی گوندی تەوێڵە بوە، دەس پـێ ئـەکا. فـەقێ عوسـمان دوای ئەوەی تەریقەتی لە مەولانا خالید وەرگرتوە، بۆتە شێخی تەریقـەتی نەقشـی و، خـاوەنی مەدرەسـە و خانـەقا، بۆتە شێخ عوسمانی سیراجەدین. ناوکی خێزانەکەیان لەم شێخەوە دەس پێ ئـەکا. کوڕەکـانی شـێخ عومـەری زیانەدین و شێخ محەمەدی بەهائەدین هەریەکەیان خێزانی ناوک و خێزانی فـراوان و بـەرەبابیان پێکهێنـاوە. سەرەنجام بنەماڵەی شێخانی نەقشبەندی لێ پەیدا بوە. بنەماڵەی شێخانی نەقشبەندی لـە نـاو خێـڵ و تیـرەی جیاواز و لە ناوچەی جیاواز دا خەلیفە و مورید و سۆفی‌یان هەبوە. بەڵام نەبۆتە خێـڵ. دەسـەڵات و نفوزیـان بەشێکی بە هی نفوزی مەعنەوی - ڕوحانی بوە، بەشێکی بە هۆی زەویداری بوە.

نازناوی بنەماڵەکە لە ناوی تەریقەتەوە داکەوتوە.

*بۆ ئاگاداری زیاتر دەربارەی بنەماڵەی نەقشبەندی بڕوانە: بە زمانی فارسی: کتاب الاسرار ملا حامـد بیسـارانی، سیری در ریاض المشتاقین، بە تصحیح و مقدمە و حواشی و تعلیقات: ابوبکر سیراالدین، 1386.*

*تەرجومەی ئەم کتێبە بە عەرەبی: نزهـة فـی ریـاض المشـتاقین، تقـدیم وترجمـة واعـداد: عبداللـه مصـطفی صـالح وعبداللطیف مولود عبدالکریم، سلیمانی - 2012.*

*مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان، بەرگی یەکەم و دوەم.*

**نموونە: 3**

**بنەماڵەی تاڵەبانی**

کە بە هۆی تەریقەتی قادریەوە نازناوی شێخایەتی‌یان بە دەس هێناوە. سەری بنەماڵەکەیان لە مەلایەکی خێڵی زەنگنەوە، کە نیشتەجێی گوندی تاڵەبان بوە دەس پێ ئەکا. مەلا مەحمود دوای ئەوە تەریقەتی لە شێخ ئەحمەدی هندی وەرگرتوە. بۆتە شێخی تەریقەتی قادری و، خاوەنی مەدرەسە و تەکیە. مەلا مەحمودی زەنگنە و کچێکی میر ئیسماعیلی زەنگنە خێزانی ناوکیان پێکهێناوە. خێزانی ناوک بۆتە خێزانی فراوان و بۆتە چەند بەرەبابێ لە کەرکوک و کۆیە و کفری، بەڵام نەبۆتە خێڵ. دەسەڵات و نفوزی بنەماڵەی تاڵەبانی بەشێکی بە هۆی نفوزی مەعنەوی- رۆحانی و بەشێکی بە هۆی زەویداریەوە بوە.

نازناوی بنەماڵەکە لە گوندی تاڵەبانەوە داکەوتوە.

*بۆ ئاگاداری زیاتر دەربارەی ئەم بنەماڵەیە بڕوانە:*

*(ادمۆندس: 245). هەروەها:*

*د موکەرەم تاڵەبانی، دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی.*

*د نوری تاڵەبانی، جەزبەی عیشق، دیوانی شێخ عەبدورەحمانی تاڵەبانی.*

شێخ رەزا مێژوی بنەماڵەکەیانی لە شیعرێکی خۆی دا گێڕاوەتەوە. سەرەتاکەی بەمجۆرە دەس پێ کردوە:

خودا حەز کا کە رۆژێ بەندەیەکی خۆی بکا خۆشنود

لە ڕێگەی دورەوە بۆی دێ، بە پێی خۆی، شاهیدی مەقسود

بەم بەیتەش دوایی پێ هێناوە:

رەزاش لەو نەسلەیە، ببەخشە یا رەب، کە قەت نابێ

گوڵی بێ خار و بەحری بێ بوخار و ئاگری بێ دود.

## چوارەم، بنەماڵەی سەرانی خێڵەکان

بنەماڵەی سەرانی خێڵەکان، بە زۆری، لە ڕێگەی چیرۆکێکی راست یا هەڵبەستراوەوە، بنەچەی خۆیان گێڕاوەتەوە سەر کەسێکی ئازا و بەهێز و ژیر کە بە هۆی برا و خزمەکانیەوە، بەرەبابێکیان پێک هێناوە، دەستی گرتوە بە سەر شوێنی ژیان و دانیشتوەکانی دا.

**نموونە: 1**

**خێڵی شێخ بزەینی**

ئیدمۆنس لە زمانی ئاغاکانی شێخ بزەینیەوە ئەم چیرۆکەی دەربارەی بنجوبناوانی خێڵەکەیان گێڕاوەتەوە:

"شێخ بزەینی ئەوەی چوار بران بە ناوەکانی: حەسەن ئاغا، مەحمود ئاغا، حاجی حەمزە، مەلا عەباس. باوک یا باپیری ئەم چوار کەسە شێخێکی خواپەرست بوە، دەروێشێکی زۆری هەبوە. رۆژێکیان بە سواری ئێسترێ لە گەڵ یەکێ لە نۆکەرەکانی دا بە دەشتێک دا رابوردوە کۆمەڵێ جەردە ڕێیان پێ گرتوە. شێخ بە دارەکەی دەستی بە توندی لە ئێسترەکەی داوە تا خێرا بکا. هەر جارێ کە داری لە ئێسترەکەی داوە کۆمەڵێ زەردەواڵە لە گوێی وڵاخەکەیەوە دەر هاتون بە

جەردەکانیەوە ناوە. جەردەکان دەشتەکەیان پڕ کردوە لە هاوار و ناڵە. نۆکەرەکەی کە ئەوەی دیوە بۆ ئەوەی شێخ هان بدا زیاتر لە ئێسترەکەی بدا بە فارسی وتویەتی: "شیخ بزن، شیخ بزن!". واتە "شێخ لێدە! شێخ لێدە!" ناوی شێخ بزەینی لەمەوە نراوە لەو خێڵە."

*(نیکیتین، وەرگێڕانی فارسی: 48. وەرگێڕانی عەرەبی: 41)*

*بۆ ئاگاداری زۆرتر بڕوانە:*

*المحامی عباس العزاوی، عشائر العراق، الجزء الثانی، منشورات الشریف الرضی، بغداد - 1947. (ص 161 - 163)*

*العشائر الکردیة، ترجمە و علق علیە: فؤاد حمەخورشید. بغداد - 1979. (ل 111 116) ئەم کتێبە تەرجومەی راپۆرتێکی کە دەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیز "دائرة الحاکم المدنی فی العراق" نوسیویتی بە ناونیشانی: ملاحظات عن عشائر کردستان الجنوبیە (بین الزاب الکبیر ودیالی)، بغداد 1919.*

**نمونە: 2**

## خێڵی هەرکی

نیکیتین لە زمانی یەکێ لە هەرکیەکانەوە ئەم چیرۆکەی دەربارەی بنجوبناوانی خێڵەکەیان گێڕاوەتەوە:
"باپیرە گەورەی بنەماڵەی فەرمانڕەوای هەرکی لە کەسێکەوە دەس پێ ئەکا ناوی بابەکر بوە. بابەکر پیاوێکی ئازا بوە لە هیچ نەترساوە، بە تەنیا دەرهەقەتی بیست کەس هاتوە. دوژمنایەتی هەبوە لە گەڵ میر زەینەدینی میری شەمزینان. پیاوەکانی میری روت کردۆتەوە. جارێکیان بیست کەس لە پیاوەکانی میر بۆسەیان بۆ ناوەتەوە بەڵام ئەم هەر بیستی کوشتون و روتی کردونەتەوە چەک و کەلوپەلەکانی لە دو ئێستر بار کردوە بردویەتی راستەوخۆ چوە بۆ خێوەتەکەی میر.
میر نیازی راسەقینەی خۆی دەرنەبڕیوە. بەخێرهاتنی کردوە. وتویەتی پیاوەکانی من لە ژن بێ دەسەڵاتتر بون تۆ پیاوێکی هەژار و ئازای ئەمەوێ لە لای من بمێنیتەوە و پیاوێکی وەکو تۆ ببێتە سەرۆکی نۆکەرەکانم. بابەکر بە دڵنیاییەوە ماوەتە و نوستوە بەو هیوایەی بۆ رۆژی دوایی بچێ خێزانەکەی بهێنێ. شەو لە خەودا داویانە بە سەریا گرتویانە چوارپەلیان بەستۆتەوە.
بۆ رۆژی دوایی هێناویانە بیکوژن کۆتوپێوەندیان لێ کردۆتەوە. پڕی کردوە بە خەنجەری یەکێ لە پیاوەکانی میردا. میر پشتی بە دارێکەوە بوە وا بەهێز خەنجەرێکی لە سکی میر داوە لە پشتیەوە دەرچوە نوکی خەنجەرەکەی چەقیوە بە دارێکا. کە رای کێشاوە تەنیا دەسکەکەی بە دەستیەوە هاتوە، دەمی خەنجەرەکەی لە لەشی میر و دارەکەدا ماوەتەوە. چەکی پێ نەماوە گیراوەتەوە داوای کردوە پێش کوشتنی رێگەی بدەن وەسێت بۆ کوڕەکانی بکا رێگەیان پێ داوە وتویەتی:
یەکەم. دەمی خەنجەر لە مشتۆکەی مەبەستن ئەگەر تاقی نەکەنەوە.
دوەم، با هەر یەکێکتان چوار ژن بهێنێ تا وەچەتان زۆر بێ و تۆڵەم بسێنن
سێیەم. هەرگیز گوێ لە قسە شیرینەکانی بەگزادەی شەمزینان، خێزانی فەرمانڕەوا، مەگرن.
بابەکر چوار کوڕی هەبوە: مەندۆ، سەیدۆ، سەرهات، مام شێر. خێڵی هەرکی لە سێ برای یەکەم، لە مەندۆ تیرەی مەندان، لە سیدۆ تیرەی سەیدان، لە سەرهات تیرەی سەرهاتی کەوتۆتەوە."

*(نیکیتین: 202)*

*بۆ ئاگاداری زۆرتر دەربارەی خێڵی هەرکی بڕوانە:*

*العزاوی: 2/ 134 - 136.*

*العشائر الکردیة، ترجمە و علق علیە: فؤاد حمەخورشید. بغداد - 1979. (ل 70 - 73)*

**نمونە: 3**
## خێڵی دەلۆ

مستەفا نەریمان لە زمانی پیاوە پیرەکانیانەوە ئەم چیرۆکەی دەربارەی بنجوبناوانی خێڵەکەیان گێڕاوەتەوە:

"هۆزی دەلۆ تا دەوروبەری ساڵی 1850 ی ز لە هەرێمی سەنگاودا بوە. هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆمان دەربارەی نیشتمانی پێش سەنگاوی هۆزی دەلۆمان دەست نەکەوتوە. تەنها ئەوە نەبێت دەماودەم لە پیاوە بەتەمەنەکانی ئەم هۆزە بیستراوە کە دەلۆ لە بەرەبابی دە شۆڕە سواری هۆزی بڵباس بون و لە سەر سنوری ئێران و عوسمانیەکان لە نێوان سنە و قەڵاچوالان دا، بژێوییان ئەکرد و مەترسییان خستبوە سەر سنوری هەردو دەوڵەتەکەوە.

جارێکیان کۆمەڵە ڕێگرێک ڕێ بە کاروانێکی بازرگانی ئەگرن کاتێ ئەم دە برایە بەو هەواڵە ئەزانن لە چەتەکان ئەچنە پێشەوە داوایان لێ ئەکەن دەست لە بازرگانەکان هەڵگرن ئەوان بەمە قایل نابن. دە براکەش پەلاماریان ئەدەن و کاروانەکەیان لە چنگ دەرئەهێنن و ڕەوانەی موڵکی بابانی ئەکەنەوە. میری بابان کە بە ئەبەردی و جەنگاوەری ئەم دە برایە ئەزانێت زۆر ڕێزیان ئەگرێت و هەرێمی جامرێزی ناو سەنگاویان پێ ئەبەخشێت کە ئەکەوێتە نێوان شاخەکانی ئاجداغ و بەرگەچ دوە لە ڕۆژئاوای زنجیرە شاخی قەرەداغی ناوچەی سەنگاو. پەنجا ساڵێکی بە سەردا تێ ئەپەڕێت وەچەی ئەم دە برایە ئەم ئاواییانە دائەمەزرێنن: بەرگەچ، مەسۆیی، عەینکە، کارێزە، ترشاوە، باجگە، پێنج ئەنگوست. لە ناو ئەم گوندانەدا باجگەیان شوێنێکی ئیستراتیجی هەبوە کەوتوتە سەر لوتکەی چیای ئاجداغ و پارێزگاری ڕێگەی کاروانی نێوان بەغداد - سلێمانی یان تیا کردوە. کاروانسەراکەیان لە گەروی سەنگاو بۆ حەسانەوەی بازرگان و قەتارچی و ڕێبوارەکان دروست کردوە هەروەها لەو باجگەیەدا خەرج و باجیان لە قەتار و کاروانەکان وەرگرتوە." *(مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ، ل 78 - 78)*

*بۆ ئاگاداری زیاتر دەربارەی خێڵی دەلۆ:*
*العشائر الكردية، ترجمه و علق عليه: فؤاد حمەخورشيد. بغداد - 1979. (ل 44 - 48)*
*العزاوي: 2/ 171 - 173.*

### کەسانی ئەم چوار توێژە کۆمەڵایەتیە:

**سادات**، میرایەتیەکان، شێخانی تەریقەت و سەرانی خێڵەکان و، هەندێ توێژی تر شانازی بە ڕێچەڵەکی خۆیانەوە ئەکەن بۆ ئەوەی ڕەوایەتی بدەن بەو دەسەڵاتەی کە باووباپیریان لە ناو کۆمەڵ دا، لە یەکێ لە بوارەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری دا هەیان بوە و، ئەمان بە میرات بۆیان ماوەتەوە و ئەیانەوێ بە زیندویەتی بیهێڵنەوە، بە لایانەوە گرنگە چونکە:

سەید، ڕەوایەتی دەسەڵاتەکەی لە پێغەمەری ئیسلامەوە وەرگرتوە. خوای گەورە گەردونی لە بەر خاتری محەمەد خوڵقاندوە و، هەمو موسوڵمانێ لە شایەتمان دا ئەڵێ: "لا اله الا الله محمد رسول الله". ئەم پیرۆزیەی محەمەد وای لە نەوەکانی کردوە کە وەکو "ئالی محەمەد" لە پلەی کۆمەڵایەتی بەرزتر دا خۆیان لە خەڵکی ئاسایی بە شەریفتر و بەو هۆیەوە بە خاوەن مافی دەسەڵاتداری دابنێن.

میر، ڕەوایەتی دەسەڵاتی لە باپیرەی وەرگرتوە، کە لە سەردەمی دێرین دا شا یا یەکێ لە قارەمانە جەنگیە هەڵکەوتوەکان بوە. شا لە سەردەمی کۆن دا بە هەڵبژێردراوی خوا دانراوە بۆ حوکمڕانی خەڵک، ئەو ڕەوایەتیەی بۆ دەسەڵاتداری لەوەوە بە میرات، وەکو نازناوێکی کۆمەڵایەتی: خان، بەگ، ئاغا، بۆ ماوەتەوە، کە نیشانە بوە بۆ خانەدانێتی و بەرزی پلەی ئەو کەسە لە چاو خەڵکی ئاسایی دا.

**شێخ**: ڕەوایەتی دەسەڵاتی لە کەسی یەکەمی بنەماڵەکەیانەوە وەرگرتوە. شێخی یەکەم لە ئەنجامی خواپەرستی دا خەڵکی لە خۆی کۆ کردۆتەوە و، لایەنگرەکانی بە گێڕانەوەی کەرامات و مەناقیبی، ژورئاسایی، شێخەکەیان جۆرێ لە پیرۆزییان بۆ ئافراندوە. شێخ، نازناوێکی کۆمەڵایەتی بوە، لە ناو خەڵک دا بەڕێز سەیر کراوە. ئەو ڕێزە دوای چەند نەوەیەک بۆتە دامەزراوەیەکی بەردەوام و، کوڕ و نەوەکانی ئەو ڕێزەیان بە میرات بۆ ماوەتەوە.

**سەرخێڵ**: ڕەوایەتی دەسەڵاتی لە هێز و توانای خۆیەوە وەرگرتوە. سەرخێڵ پێویستی بەوە نەبوە ڕێچەڵەکی خۆی بگێڕێتەوە بۆ سەر شایەکی ئێرانی یا عەرەبی، تا کەسانی دەوروبەری دەسەڵاتەکەی ئەو قوبوڵ بکەن، بەڵکو پێویستی بەوە بوە هێزی خۆسەپاندن و ژیرایەتی بەڕێوەبردنی هەبێ.

---

**هەندێ تێبینی**

*جگە لەم چەشنە گروپانە، خەڵکی ئاسایی پرسی ڕێچەڵەک و بنجوبناوانی مێژویی خێزان، بنەماڵە، عەشیرەتەکەی بە لاوە گرنگ نەبوە، یا هەر بیری لێ نەکردۆتەوە. تا ئێستا نوسراوێکی تایبەتی کە خێڵێکی کورد مێژوی خۆی گێڕابێتەوە لە بەر دەس دا نیە.*

## خێڵی کوردی و ناو

ناوی عەشیرەتی کوردی، بە پێی ڕەوتی مێژویی دروستبونی هەر عەشیرەتە ئەگۆڕێ، جیاوازە:

یەکەم، هەندێکیان بە ناوی کەسێکەوەیە کە ڕەنگە باپیرە گەورەی ڕاستەقینە یان خەیاڵیی ئەو گروپە بێ، لەوانە: میراودەلی، نورەدینی، بابامیری، وەلەدبەگی،

دوەم، هەندێکیان بە ناوی جێ، گوند، ناوچەوەیە، لەوانە: بارزان - بارزانی، زێبار - زێباری، هەرکی - هەرکی، ساڵەیی، شوان

سێیەم، هەندێکیان بە ناوێکەوەیە کە ئێستا مەعناکەی یا بنجە زمانەوانیەکەی گوم بوە، لەوانە: جاف، مامەش، مەنگور، بڵباس، ئاکۆ... ئەم ناوانە هەرچەند لێکدانەوەیان بۆ بکرێ، هێشتا ئاگەنە مەبەستێکی سەلمێنراو.

## ژن و ناوی عەشیرەت

لە ناو خێڵەکانی کوردا هەندێ لە تیرە سەرەکیەکانی مەنگوڕ بە ناوی ئافرەتەوە بوە. تایەفەی مروەت، تایەفەی ئامان، تایەفەی زێڕین، تایەفەی شەم، تایەفەی زین. *(ابراهیم افخمی، قیام ملا خلیل و رد فرمان رضا خان، انتشارات محمدی، سقز، تابستان 68، ص 70)*

ئەمە جێگەی تێ ڕامانە. ڕەنگە ئەمە لە سۆنگەی ئەو کوشتارەوە بێ کە سەرانی مەنگوڕ لە مەراغە دوچاری بون. ساڵی 1197 ک باپیر ئاغا و سەرانی مەنگوڕ و پیاوە جەربەزەکانیان بە ناوی دەعوەتەوە بانگ کراون بۆ شاری مەراغە و، بۆ میوانداری دابەشیان کردون بە سەر ماڵەکان دا. لە کاتی نوستن دا خانەخوێیەکان میوانەکانی خۆیان کوشتون. مەنگوڕ زۆری پیاوەکانیان، بە تایبەتی گەورەی بەرەباب و تیرەکانیان کوژراون، ژنەکانیان ماون، بەڕێوەبردنی کاروباری بەرەباب و تیرەکەیان و پەروەردەکردنی منداڵەکانیان گرتۆتە دەستۆ. بەم بۆنەیەوە پیاوانی تازەپێگەیشتوی مەنگوڕ کە سەرلەنوێ خێزانیان پێکهێناوە و بەرەباب و تیرەکەیان دروست کردۆتەوە، بە ناوی دایکیانەوە ناسراون.

لە کوردەواری دا شتێکی ئاسایی بوە پیاوێ کە مرد بێ یا کوژرا بێ، لەو کاتەدا منداڵێکی کوڕ لە سکی هاوسەرەکەی دا بوبێ، دوای لە دایکبونی بە ناوی باوکیەوە ناونرابێ و، تا گەورەش بوبێ لە باتی باوکی هەر بە ناوی دایکیەوە ناسرابێ. دو کەس لە گەورەپیاوەکانی کورد حاجی مستەفا پاشای یامولکی و، جەنەراڵ شەریف پاشای خەندان، نازناوەکانیان لە دەنکیانەوە: یا مولکی و خەندان، بۆ ماوەتەوە.

## ناوی کەس و نازناوی خێڵەکی

کەسێکی سەر بە خێڵێکی دیاریکراو کە نازناوی خێڵەکە هەڵئەگری (یائی نەسەب) ناخرێتە سەر ناوی خێڵەکە بەڵکو تەنیا ناوی عەشیرەتەکە خراوەتە دوای ناوەکەی بەلام (یائی ئیزافە) خراوەتە دوای ناوی کەسەکە. وەکو: مەحمود پاشای جاف، هەمزە ئاغای مەنگوڕ، قەرەنی ئاغای مامەش، مامەند ئاغای ئاکۆ، سمکۆی شکاک

مەگەر ناوی عەشیرەتەکە خۆی یائی پێوە نیشانە بێ بۆ ناوی شوێن یا ناوی باپیرە گەورە، وەکو: بایز ئاغای گەردی، حاتەم ئاغای زراری، فارس ئاغای زێباری، عەباس ئاغای میراودەلی.

بەلام ئەوەی کە ناوی شوێن بێ و خرابێتە سەر ناوەکە یائی خراوەتە سەر وەکو خەڵکی ئەو شوێنە، تەنانە ئەگەر ئەو شوێنە ناو بێ بۆ عەشیرەتیش. وەکو: زێباری، پشدەری، هەروەکو شێخ عوبەیدوڵای شەمزینی، مەولانا خالیدی شارەزوری، وەفایی سابڵاخی، ئەولقادری پاوەیی.

ناوی هەندێ خێڵ بە زیادکردنی پاشگری (ەتی، یەتی، ایەتی) بۆتە ناوی مەڵبەندی ژیانی خێڵەکە، وەکو: خۆشناو - خۆشناوەتی، ئاکۆ - ئاکۆیەتی، مەنگوڕ - مەنگوڕایەتی، زراری - زرارەتی.

ئەوەندەی مێژوی کورد لە بیری بێ، خێزانی کوردی، وەکو خێزانی زۆر گەلی تری دنیا، کە لە سەر بنچینەی هاوسەرگیری پیاو و ژن دروست بوە، هەم خێزانێکی ناوک بوە، هەم خێزانێکی فراوان.

خێزانی ناوک بوە، چونکە پێکهاتوە لە پیاوێک و یەک ژن یا زیاتر لە یەک ژن و، منالەکانیان. پیاوی کورد ئەگەر بۆی لوا بێ زیاتر لە ژنێکی هێناوە. هەمو دینە باوەکانی ناو کۆمەڵگای کوردی: ئیسلام، ئیزیدی، یارسان، رێگەی "فرە - ژنی" یان بە پیاو داوە، بەڵام رێگەی "فرە - مێردی" یان بە ژن نە داوە. گرێبەستی نوسراو یا زارەکی هاوسەرگیریی پیاو و ژنەکە لە لایەن پێشەوا دینیەکانەوە: مەلا لە ئیسلام، پیر لە ئیزیدی، باوە لە یارسان، ئەنجام دراوە.

فرە - ژنی لە لایەکەوە نیشانەی دەسەلات و توانای دارایی و کۆمەلایەتی پیاوەکە بوە، لە لایەکی ترەوە هۆیەکی گرنگ بوە بۆ زیادکردنی سەرچاوەی مرۆیی خێزانەکە چ بۆ کار و بەرهەمهێنان، چ بۆ شەڕ و دەسەلات. هەندێ جاریش بۆ گرێدانی هاوپەیمانێتی بوە لە نێوان سەرۆکی خێلێک لە گەڵ خێلێکی تر.

نازناوی پلەی کۆمەلایەتی لای پیاوی کورد گرنگیەکی گەورەی هەبوە. بەرزی و نزمیی پایەی کۆمەلایەتی ئەو کەسەی پیشان داوە لە ناو کۆمەڵگادا. ئەمەش لە پەندی پێشینان دا رەنگی داوەتەوە.

وتویانە: "بە خۆم بڵێن ئاغا، بە ژنەکەشم بڵێن ئاغاژن".

هەروەها وتویانە: "من ئاغا و تۆ ئاغا، کێ بەرەمان بۆ راخا؟" ئاغا ئەگەر هەژار و ئەداریش بوبێ، نە زەوی هەبوبێ نە رانەمەڕ نە سامانی زۆر، لە باری سایکۆلۆجیەوە هێشتا هەر خۆی لە پلەی کۆمەلایەتی دا بە بەرزتر داناوە لە خەڵکی ئاسایی.

هەندێ لە نازناوەکان کە نیشانە بون بۆ بەرزیی پلەی کۆمەلایەتی کەس یا خێزانەکە، وەکو ناوەکانی پاشا، میر، ئاغا، بەگ، کوێخا، شێخ، سەید، لە باوەباپیرەوە بە میرات بۆ خاوەنەکانی ماوەتەوە. ئەمانە خۆیان بە خانەدان و وەجاخزادە داناوە.

وتویانە: "وەجاخزادە بە نیشارە، ناوەجاخ بە کوتەک".

هەروەها وتویانە: "وەجاخزادە هانینی گرانە، راگرتنی ئاسانە". دەستەواژەکانی وەجاخزادە و ناوەجاخ کۆمەڵگایان کردوە بە دو بەشەوە کە یەکێکیان توێژەکانی چینی سەرەوەی کۆمەڵگا، دەسەلاتدار و دەوڵەمەن، بون و، ئەوانی تریش توێژەکانی چینی خوارەوەی کۆمەڵگا، ژێردەستە و هەژار، بون.

هەندێکی تری نازناوەکان کە ئەویش نیشانە بون بۆ بەرزیی رێژەیی پلەی کەس یا خێزانەکە، وەکو ناوەکانی مەلا، میرزا، وەستا، بە رەنج و ماندوبونی خۆیان بە دەستیان هێناوە.

وتویانە: "نە کوتەک لە گەڵ ئاغایان، نە شەرع لە گەڵ مەلایان". واتە ئاغا زەبروزەنگی هەیە بە شەڕ چاری ناکرێ و مەلاش چونکە شارەزایی هەیە لە شەرع دا، بۆ دانانی ڕێوشوێنی پێکهاتن بەربەرەکانی ناکرێ.

نازناوی لەوانەش خوارتر وەکو فەقێ، خەلفە، گرنگی تایبەتی هەبوە بۆ هەڵگرەکەی. تەنانەت، هەندێ کەس، ئەگەر هیچ نازناوێکی لەو بابەتانەی نەبوبێ هەوڵی داوە پارە کۆ بکاتەوە بچێ بۆ حەج، بۆ ئەوەی نازناوی حاجی بخرێتە پێش ناوەکەی. چونکە ئەوەی هیچ کام لەو نازناوانەی نەبوبێ لە پلەی کۆمەڵایەتی دا لە خوار چین و توێژەکانی ترەوە سەیری کراوە.

هەندێ کەس بە تەنیا یەک نازناو نانەکەوتوە، هەوڵی داوە چەند نازناوێ ڕیز بکا وەکو حاجی مەلا شێخ فلان، حاجی مەلا سەید فلان، حاجی فلان بەگ، حاجی مەلا... ئاغا، بەوەش ڕێزی لە ناو کۆمەڵ دا زیادی کردوە.

لە بەرامبەر ئەو نازناوانەدا کە نیشانە بون بۆ بەرزیی ڕێژەیی پلەی کۆمەڵایەتی کەسەکە، لە لایەن چینی دەسەڵاتدارەوە ناووناتۆرە لە هەندێ کەس و خێزانی ئاسایی یان ئەویستراو داهێنراوە بۆ نیشاندانی جیاوازی چینایەتی نێوان خۆیان و ئەوان.

وتویانە: "لە گەڵ ئەسڵان هەمو فەسڵان، لە گەڵ نائەسڵان بە هیچ فەسڵان".

هەروەها وتویانە: "لە گەڵ نائەسڵان مەچۆرە کایە، ڕەنجی چەند ساڵەت ئەچێ بە زایە". مەبەست لە ئەسڵان ئەوانەن کە لە باووباپیرەوە خاوەنی ناوی زل بون و نائەسڵ ئەوانە بون کە هەژار و بێ ناوونیشانی کۆمەڵایەتی بون.

هەروەها وتویانە: "بەچکە گەدا مەخەرە تەما، بە چڵێ کەما، دێتە سەما".

هەروەها وتویانە: "حاکم بە قسەی گەدا خەڵک ئەگرێ، بەڵام بە تکای ئەو کەس بەر نادا". گەدا سواڵکەر و دەرۆزەکەر بوە، مەبەستیان ئەوە بوە کەسی هەژار زو لە خۆی بایی ئەبێ، ئەتوانێ زیان بە خەڵک بگەیەنێ، بەڵام ناتوانێ بە کەڵکی خەڵک بێ.

دەروێش، کە نیشانە بوە بۆ موریدەکانی شێخانی تەریقەتی قادری و سۆفی، بۆ موریدەکانی شێخانی تەریقەتی نەقشبەندی، بۆ ئەو کەسانەی کە هیچ نازناوێکی کۆمەڵایەتییان نەبوە، قەڵغانی پاراستن بون لە دابڕانی ناوناتۆرەی ناشیرین بە سەریان دا.

گۆڕانی هەلومەرجی ئابوری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، لە ئەنجامی شەڕێک دا کە لایەک بە سەر لایەک دا زاڵ بوبێ، یا لە ئەنجامی قەیرانی ئابوری دا هەندێ ئابوت و هەندێ دەوڵەمەن بوبن، گۆڕانی پایەی کۆمەڵایەتی ئەو کەسەی بە دوادا هاتوە.

وتویانە: "کەس بو بە ناکەس، ناکەس بو بە کەس، قەدیم وەجاخان دەرچون ڕەنج عەبەس".

هەروەها وتویانە: "هەواڵ بەرن بۆ میران، کارەکەر کارەکەر مەگیران

... وەرزێر وەرزێر مەگیران".

هەبونی نازناوی کۆمەڵایەتی لە پرۆسەی هاوسەرگیری و خوازبێنی دا بۆ ڕازیبون یا ڕەتکردنەوەی ماڵی بوک، هەروەها بۆ ڕازیبون یا ڕەتکردنەوەی زاوای تازە، خاوەنی نازناو چ بۆ ژنهێنان بوبێ بۆ خۆی یا بۆ کوڕەکانی و، چ بۆ بە شودانی کچەکانی بوبێ، کاریگەرییان هەبوە.

نەریتی نازین بە نازناوی کۆمەڵایەتیەوە تا ئێستاش لە ناو کوردا باوی ماوە. ئەگەر جاران هەندێ نازناو گرنگ بوبێ و ئێستا گرنگی کەم بوبێتەوە، هێشتا نازناو نرخی کۆمەڵایەتی گرانی هەیە. لە پاڵ ئەو نازناوە نەریتییانەدا، زنجیرەیەک نازناوی تازە کە پێشکەوتنی کۆمەڵگا خوڵقاندویەتی، گرنگییان پەیدا کردوە، وەکو پلەی خوێندنی زانکۆ دکتۆر، پارێزەر، ئەندازیار، ئەفسەر... خاوەنێتی کۆمپانیای بازرگانی، وەزیفەی بەرزی حکومەتی...

ژن دوای ئەوەی شوی کردوە بە پیاوێک، ئەگەر پیاوەکەی لە پلەیەکی کۆمەڵایەتی بەرز دا بوبێ، وەکو پاشا، میر، کاربەدەستێکی بەرزی حکومەت، سەرۆکی خێڵێکی گەورە، بە خانم ناو براوە. ئەگەر پلەیەکی تایبەتی کۆمەڵایەتی، یا پیشەیەکی دیاری هەبوبێ، نازناوی مێردەکەی وەرگرتوە. کە یەکێ بانگی کردوە، لە باتی بە ناوی خۆیەوە بانگی بکا، ناوی پلە یا پیشەی مێردەکەی پێوە نوساندوە وەکو: ئاغا - ئاغاژن، کوێخا - کوێخاژن، مەلا - مەلاژن، مامۆستا - مامۆستاژن، وەستا - وەستاژن. بەڵام ئەگەر کەسێکی ئاسایی بوبێ بە دادە مەنیج، یا خەجیج، باجی رێحان، ئایشێ خان... بانگ کراوە.

ژن دوای گواستنەوەی و جێگیربونی لە ناو ماڵی مێردەکەی دا، کاتێ کەوتۆتە سەر راپەڕاندنی کاروباری ناوماڵ پێی وتراوە کابان (کەیبانو). ئەگەر پیاوەکە لە ژنێ زیاتری هەبوبێ خێزانەکە فرەکابان بوە، کابانەکان بون بە هەوێی یەکتری و، منداڵەکانی هەر یەکێکیان بە هەنەزای ئەو یا ئەوانی تر. ئەگەر لە ناو یەک ماڵ دا پێکەوە ژیابن، ئەگەر کەسایەتی سەرگەورەی خێزانەکە بە هێز نەبوبێ، هەمیشە کێشەی ئاشکرا یا نهێنی لە نێوان کابانەکان دا دروست بوە. بە زۆری حەزیان لە چارەی یەکتری نەکردوە، کاریان لە یەکتری تێکداوە، پیلانیان لە یەکتری گێڕاوە. ئەمەش لە هەندێ پەندی پێشینان دا رەنگی داوەتەوە:

وتویانە: "ئاشی فرە وەستا، گوندی فرە کوێخا، ماڵی فرە کابان، وێران ئەبێ".

هەروەها وتویانە: "شیوی زۆر کابان، یا سوێرە یا بێ خوێیە".

هەروەها وتویانە: "خانوی فرە کەیبانو، خۆڵی تا ئەژنۆیە". چونکە ژنەکان کە بەرپرسی راگرتنی پاکی و خاوێنی ماڵەکە بون، لە رقی یەکتری و، بۆ ئەوەی شێواویی ماڵەکە بە سەر یەکتری دا بهێنن، کەسیان ماڵەکەیان نەماڵیوە و پاک نەکردۆتەوە.

خێزانی کوردی هەمیشە لە هەوڵی زیاد بون و پەرەسەندن دا بوە.

باوک، پیاو، کچ و کوڕی هەبوە. ئەگەر لە ژنێ زیاتری هەبوبێ، ژنەکان هەوێی یەکتری بون. بۆ منداڵی هەوێ باوەژن (زڕبایک) بون، هەر ژنە کچ و کوڕی خۆی هەبوە و، منداڵی هەوێکانی باوکخوشک و باوکبرای منداڵەکانی ئەم بون، بەڵام هەنەزای خۆی بون و ئەم زڕبایکی ئەوان بوە. منداڵەکان کە لە دایکی جیاواز بون زڕبرا و زڕخوشکی یەکتری بون. کەم وا بوە خۆشیان لە چارەی یەکتری هاتبێ.

بەرزی و نزمی پلەی کۆمەڵایەتی ژن لە ناو خێزانەکەدا کاری لە سەر مێرد و لە سەر منداڵەکانی هەبوە. هەم ژنەکە نزیکتر بوە لە پیاوەکەیان، هەم منداڵەکانی خۆیان بە لە پێشتر زانیوە. ئەمەش لە هەندێ پەندی پێشینان دا رەنگی داوەتەوە:

وتویانە: "کچەتیمی گەلالان، بونە کابانی ماڵان".

هەروەها وتویانە: "نە خانەی سەرشیو، نە ئاغاژنی کچەتیو". لە دەستەواژەی کچەتیو (کچەتیم) مەبەستیان کچی خێزانێکی هەژار یا بنەماڵەیەکی ئاسایی بوە.

هەروەها وتویانە: "باوکمان برایە، بەڵام من چکێ لە تۆ وەجاخزادەترم".

هەروەها وتویانە: "برام نەبێ لە دایە، قەت گریانم بۆی نایە". رەنگە ئەم پەندانە بە تەوسەوە وترابن، بەڵام رەنگدانەوەی ئەو دۆخە کۆمەڵایەتیە بون.

لە ناو کۆمەڵگایش دا هەمان جیاوازی رەنگی داوەتەوە. ژنیش بۆ ئەوەی بە چاوی کەمتر یا نزمتر لە پلەی هاوەڵەکانی سەیری نەکرێ، حەزی کردوە نازناوێکی کۆمەڵایەتی هەبێ.

بۆیە وتویانە: "بمنوێنن بە جلی گایە، پێم بڵێن ژنی ئاغایە".

هەروەها وتویانە: "بمنوێنن بە جلی تانجی، پێم بڵێن ژنی حاجی".

لە ناو کورانی خێزانەکەدا کوڕە گەورە جێگەیەکی تایبەتی هەبوە. براکانی کە لەو بچوکتر بون، لە خوار ئەوەوە دانیشتون. کاری بەردەس برابچوک کردویەتی. ئەوە نەریتێکی پیرەویکراو بوە. ئەمەش لە هەندێ پەندی پێشینان دا رەنگی داوەتەوە:

وتویانە: "نە برابچوک بی، نە ماڵت لە پاینی ئاوایی بێ". چونکە برابچوک ئەرکی زۆری خزمەتی ناوماڵ، بە تایبەتی لە کاتی هاتنی میوان دا، کەوتۆتە سەر شان.

دوای مردنی باوک، سەرگەورەی خێزان، کوڕی گەورە جێگەی گرتۆتەوە، ئەگەر خوشک و برای منداڵی هەبوبێ، ئەرکی پەروەردە و گەورەکردنیان، بە شو دان و ژن بۆ هێنانیان، کەوتۆتە ئەستۆی ئەو.

ئافرەتێ، کچ بوبێ یا ژن، کە راگیراوە بۆ خزمەتی ماڵ و خێزانەکە، پێی وتراوە کارەکەر. کە بۆ بەخێوکردن و پەروەردەی منداڵ بوبێ پێی وتراوە دایەن. کارەکەر لە پلەی کۆمەڵایەتی دا نزمتر لە پلەی ژنی ئاسایی سەیری کراوە.

بۆیە وتویانە: "بە کارەکەر بڵێیت خانم، کاسە و کەوچک ئەشکێنێ".

هەروەها وتویانە: "بە خانمانە ئەیکەن و بە کارەکەرانە ئەیرێژن".

پیاوێ، سەڵت بوبێ یا خێزاندار، کە راگیراوە بۆ خزمەتی ماڵ و خێزانەکە پێی وتراوە خزمەکار، کە بۆ شەڕ و ترساندن بوبێ پێی وتراوە پیاو، کە بۆ پەروەردەکردنی منداڵ بوبێ پێی وتراوە لەلە. کە بۆ کۆکردنەوەی مڵکانە بوبێ پێ‌ی وتراوە سەرکار. کە بۆ کرێکاریی کاتی بوبێ لە کێڵگە یا لە باخ دا پێ‌ی وتراوە سەپان یا رەنجبەر.

خێزانی باوک بە تۆڕێکی فراوانی خزمایەتیەوە بەستراوەتەوە بە کۆمەڵێ خەڵکی ترەوە، کە بە کەسوکار دانراون. هاوسەرگیری ناوخۆیی رێگەی سەرەکی دروستکردن و پاراستنی خزمایەتی بوە. خزم گرنگیەکی زۆری هەبوە بۆ خورتی و لاوازی پایەی خێزانەکە لە ناو کۆمەڵگاکەی دا. بە تایبەتی لە کۆمەڵگایەک دا کە دەسەڵاتی دەوڵەتی تێدا لاواز یا هەر نەبوبێ. چەندین چیرۆک و پەندی پێشینان لەو بارەیەوە هەن:

وتویانە: "برا لە پشت برابێ، مەگەر قەزا لە لای خوا بێ".

هەروەها وتویانە: "خزم گۆشتت بخوا ئێسقانت ناشکێنێ". ئەم پەندە جگە لەوەی خزم و بێگانەی لە یەکتری جیا کردۆتەوە، یەکێ بوە لە هۆکانی پێویستیی راگرتنی رایەڵەی خزمایەتی.

براکانی ناو خێزانی فراوان زۆر جار ئەیان توانیوە پێکەوە هەتاسەر پارێزگاری قازانجی هاوبەش بکەن. یەکێکیان هەستی بە نابەرامبەری کردوە بۆ ئەوەی برایەتیەکەیان تێک نەچێ، رێک کەوتون لە سەر دابەشکردنی بەرژەوەندیەکانیان.

بۆیە وتویانە: "برامان برایی، کیسەمان جیایی".

بە پێچەوانەی خزمی باشەوە خزمی خراپ بوە بە کێشەیەکی گەورە بۆ خێزانەکە. هەرچی خراپەیەکی کردبێ، بە تەنیا لە سەر خۆی حساب نە کراوە، بەڵکو لە سەر هەمو خێزانەکە، بنەماڵەکە، بەرەبابەکە حساب بوە. هەمویان تێوە گلاون. تەنانەت ئەگەر کەسێکی کوشت بێ، هەمو خزمەکانی لە تۆڵەی تاوانەکەی ئەودا، لە ژێر هەڕەشەی کوشتنەوەدا بون.

بۆیە وتویانە: "خزمی خراپ وەکو گونی قوڕ وایە، بیبڕی ئەتکوژێ، نەیبڕی حەیات ئەبا".

ئەرکی ژن قورس بوە. رایەڕاندنی کاروباری ماڵ لە ئەستۆی ژن دا بوە. ماڵی بێ کابان شپرزە و بێ سەروبەر بوە. لە لایەکان دا ژن بەشداری لە کار و بەرهەمهێنانی خێزانەکەی دا کردوە، بە تایبەتی لە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری دا.

بۆیە وتویانە: "ئیشی ژنان بیستوچوارن، هەر نان و هەویر دیارن".

ئەرکێکی گرنگی ژن پەروەردەکردنی مناڵ بوە. یەکەم فێرگەی منـاڵ، مـاڵی خۆیـان و ناوخێزانەکـەی خۆیان بوە. یەکەم مامۆستاش دایک بوە. قسەکردن، خـو و رەوشـت، جـۆری هەڵسـوکەوت، تەنانـەت دیـن و مەزەب، لە دایکەوە فێر بوە.

بۆیە وتویانە: "دایە ببینە دوێتە بخوازە".

هەروەها وتویانە: "بەختی دایک جیازی کچە". ئەگەر دایک شـوی بـە پیـاوێکی بـاش کردبـێ و، لای مێردەکەی و لە ناو خێزانەکەی خۆی دا رێزی هەبوبێ، ژنێکی سەلار و تێگەیشتو بـوبێ، پێگـەی کۆمەڵایـەتی کچەکەیشی بەهێز بوە، کەسی هاوشانی خۆی هاتوە داوای کردوە.

دایکی منالّی شیرەخۆر توانیوێتی چەندین خیـزان پێکـەوە گـرێ بـدا. جگـە لـە بـاوکبرا و دایکبـرا، شیربرا هەبوە. کوڕی دو خێزانی جیاواز کە شیری یەک ژنیان خواردبێ بون بە شیربرا (هاوشـیرە). کـچ و کوڕی دو خێزانی جیاوازیش ئەگەر شیری یەک ژنیان خواردبێ، ئەوانیش بون بـە خوشـک و بـرای شـیری (هاوشیرە). ئیتر بۆ هاوسەرگیری بە یەکتر نەشیاون، بەڵام میراتی یەکتریان پێ نەبڕاوە.

پێوەندی مێرد (شو) لە گەڵ باوک و دایکی خۆی بـەردەوام بـوە. پێوەنـدی ژنەکـەی لـە گـەڵ بـاوکی مێردەکەی بۆتە پێوەندی بوک و خـەزور و لـە گـەڵ دایکـی مێردەکـەی بۆتـە پێوەنـدی بـوک و خەسـو. بـۆ منالّەکانی بون بە باپیر (باوەگەورە) و داپیر (نەنک).

پێوەندی ژن لە گەڵ باوک و دایکی خۆی بەردەوام بوە. ئەو پێوەندیە بـۆ مێردەکـەی بۆتـە پێوەنـدی زاوا و خەزور و بۆ دایکی بۆتە پێوەندی زاوا و خەسو و. بۆ منالّەکانی بون بە باپیر و داپیر. منالّـەکان بـۆ ئەوان بون بە کچەزا (نەوە).

پێوەندی نێوان دایکی کوڕ (خەسو) لە گەڵ هاوسەری کوڕەکەی (بوک) لە گێڕانەوەی فۆلکلـۆری دا بـە خۆش باس نە کراوە. کەچی پێوەندی دایکی کچ (خەسو) لە گەڵ هاوسەری کچەکەی (زاوا) بـە خـۆش بـاس کراوە. خەسو هەمیشە رەخنەی لە بوکەکەی گرتوە، ئیشی زۆری پێ سپاردوە، لێـی تـورە بـوە، لـە کاتێـک دا ستایشی زاواکەی کردوە، ویستویەتی نازی بکێشێ و دڵی رابگـرێ. ئەمـەش لـە هەنـدێ پەنـدی پێشـینان دا رەنگی داوەتەوە.

چیرۆکی "دانێکە و دو هەوا"، لەو جیاوازیەوە داکەوتوە کە دایک لە نێوان زاواکەی (مێردی کچەکەی) و بوکەکەی (ژنی کوڕەکەی) دا کردویەتی.

بەڵام باوک پێی وابوە بە هۆی کوڕەکەی و بوکەکەی و نەوەکانی ئەوانەوە لە سەردەمی ژیانی خۆی دا پایەی بەرز دەبێ و، لە دوای مردنیشی وەجاخی بە رۆشنی دەمێنێتەوە، خێزانەکەی بەردەوام دەبێ. ئەمەش لـە هەندێ پەندی پێشینان دا رەنگی داوەتەوە:

وتویانە: "بە هەزار زاوا مالّم نابێ ئاوا". چونکە بە هۆی کچەکـەی و زاواکـەی و نـەوەکانی ئەوانـەوە ناوی خێزانەکەی و بەرەبابەکەی بەردەوام نابێ، بەڵکو کوێر دەبێتەوە.

هەروەها وتویانـە: "خـودا بـدا مـەرگم، زاوا نـەکا بـەرگم". مەبەسـتی ئـەوە بـوە پێویسـتی دارایـی و دابینکردنی ژیانی نەکەوێتە دەس زاواکەی، مردنی پێ خۆشتر بوە لەوەی بکەوێتە ژێر منەتی زاواکەی.

براکانی مێرد بۆ ژنەکە بون بە شوبرا (هێوەر) و ژنەکانیان بە هێوەرژن و منالّەکانیان بە هێـوەرزا و، بۆ منالّەکانی بون بە مام، منالّەکانی بون بە برازای شوبرا و بون بە ئامۆزا (پسمام و دوێتمام) ی یەکتری.

خوشکەکانی مێرد بۆ ژنەکە بون بە دش و بۆ منالّەکانی بون بە پور (میمک، پلک)، منالّەکانی بون بـە خوشکەزا (خوارزا) ی دش و بون بە پورزا (میمزا) ی یەکتری.

نش حەزی لە چارەی براژنەکەی نە کردوە. براژنەکەش حەزی لە چارەی نشەکەی نەکردوە. بەربەرەکانی یەکترییان کردوە. ئەمەش لە پەندی پێشینان دا ڕەنگی داوەتەوە:

وتویانە: "هەرچی نشێکی لە گەڵ دایە، دڕەوشێکی لە پێ دایە".

هەروەها وتویانە: "هەرکەس نشی لە دێ دایە، دڕەوشێکی لە پێ دایە".

براکانی ژن بۆ مێردەکە بون بە ژنبرا و بۆ منداڵەکانی بون بە خاڵ (لاله) و منداڵەکانی هەردولا بون بە خاڵۆزا و پورزای یەکتری.

خوشکەکانی ژن بۆ مێردەکە بون بە ژنخوشک و بۆ منداڵەکانی بە پور و منداڵەکان بون بە پورزای یەکتری.

مێرد ئەگەر ژنەکەی مردبێ و منداڵی لەو ژنە هەبوبێ و، ژنێکی تری هێنابێ. ژنەکە بۆ منداڵەکان بۆتە باوەژن و منداڵەکان بۆ ژنەکە بونەتە زڕکوڕ و زڕکچ.

ژن ئەگەر مێردەکەی مردبێ بۆتە بێوەژن. ئەگەر منداڵی لە پیاوە مردوەکە هەبوبێ، شویەکی تری کردبێ، پیاوەکە بۆ منداڵەکان بۆتە باوەپیارە (زڕباوک) و منداڵەکان بۆ پیاوەکە بونەتە زڕکوڕ و زڕکچ.

زڕ، واتە بێبەر، داری گوێز ئەگەر بەر نە گرێ پێی ئەڵێن زڕگوێز. بەم ناوەوە چەندین گوند ناو نراوە. نوساندنی زڕ بە ناوی باوک و دایک و کوڕ و کچەوە، بە جۆرێکی مەجازی هەمان مانا ئەبەخشێ. کوڕێ یا کچێ کە لە شویەکی تر. واتە لە باوکێکی تر بوبێ و لەو باوکە نەبێ، باوکەکە پێی وا بوە ئەو منداڵە بۆ ئەو خێر ناداتەوە. منداڵەکان کە زانیویانە ئەو پیاوە باوکیان نیە ئەوانیش پێیان وا بوە ئەو باوکە وەکو منداڵی خۆی بایەخ بە مان نادا. باوکەکە زڕباوک (باوەپیارە) و منداڵەکانیش زڕکوڕ و زڕکچ بون.

خێزانی باوک - ژن و مێرد و، خێزانی تازە پێکهێنراوی منداڵەکانی - کوڕ و بوکەکانی، کچ و زاواکانی، لە گەڵ نەوە (کوڕەزا و کوڕەزازا) کانی. ڕەنگە هەمویان لە یەک خانو دا پێکەوە ژیا بن، یان هەمویان لە یەک دێ دا، یان لە یەک گوندا ژیا بن. باوک - باپیرە، یا دایک - داپیرە، ئەگەرچی پیر و بە ساڵا چوش بوبن و، لە تەمەنی کارکردن دا نەمابن، لە بەر ئەوەی دەوری کاریگەریان هەبوە لە ئامۆژگاری و پەروەردە و چارەسەرکردنی کێشەکانی ناو خێزان دا، بە کۆڵەکەی ماڵ ناو براون. گەلێ جار کێشە لە نێوان بوک و خەسودا دروست بوە، پەندی: "بوکێ گوێت لێ بێ، خەسو لە گەڵ تۆمە!" نیشانەی پێکەوەژیانی خێزانی باوکانە و خێزانی بەچکەکانێتی.

هەبونی ئەو هەمو ناوە لە پێوەندی لە گەڵ خێزان و بنەماڵە و بەرەباب دا نیشانەیە بۆ بایەخدانی کورد بە ڕاگرتنی پێوەندی خزمایەتی لە سەر بنچینەی هاوخوێنی و، نیشانەیە بۆ دیاریکردنی پلەی خزمایەتی و ناسینی پلەی نزیکیی بایۆلۆجی‌یان لە یەکتری، بە تایبەتی بۆ دیاریکردنی ڕادەی حەرام و حەڵاڵ لە کاتی هاوسەرگیری دا.

خێزان فراوان بوە، لە باوک چەندین کوڕ کەوتۆتەوە، ڕەنگە بەری یەک دایک یان بەری چەند دایکێ بوبن، بەڵام لە یەک پشت بون، ئەوانیش خێزانی تازەیان دروست کردوە. هەر یەکەیان بوە بە خێزانێکی ناوک، ئەوانیش کە زیادیان کردوە و فراوان بون، بە دو شێوەی جیاواز پەرەیان سەندوە:

شێوەیەکیان، پەرەسەندنی خێزانی فراوان بوە بەرەو دروستبونی بنەماڵەیەکی دیاریکراو بە ناوی باپیرە گەورە، گوند، تەریقەت، پیشە یا بە ناوی بنەماڵە فەرمانڕەواکانی میرایەتیەکانی سەدەی نۆزدەوە ناسراون. خاوەنێتی زەوی و تێکەڵاوی‌یان لە گەڵ دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بناغەی هێزە کۆمەڵایەتیەکەیان بوە. نفوزی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابوری‌یان هەبوە، بەڵام نفوزی خێڵەکی‌یان نەبوە، ئەگەر هەیشبوبێ لاواز بوە.

شێوەکەی تریان. پەرەسەندنی خێزانی فراوان بوە بەرەو دروستبونی چەند بەرەبابێ، کـە هەریەکـەیان بـە ناوێکی تایبەتیەوە ناسراون، ئیتر ناوەکە چ ناوی باوکەکە بوبێ یا هی دایکەکـە یـا نـاوی گوندەکـەیان. هـەر لـە رەوتی ئەو پەرەسەندنەدا چەند بەرەبابێ کە هەمویان لە یەک باوک کەوتونەتـەوە، بـە نـاوێکی تـرەوە، بـون بـە تیرەیەک. چەند تیرەیەک پێکەوە، بە ناوێکی ترەوە، بون بە هۆزێک و. چەند هۆزێک، مەرج نـەبوە هـەمویان لـە یەک پشت بوبن، پێکـەوە، بـە نـاوێکی تـرەوە، یەکێتیـەک (فیدراسـیۆنێک) یـان پێـک هێنـاوە، بـون بـە خێـڵ (عەشیرەت) ێک. بنەماڵەیەکیان، کە لە هەمویان بە دەسەڵاتتر یا کۆنتر یـا خانـەدانتر بـون، یـا نزیکتـر بـون لـە فەرمانرەوایانی سەردەم، سەرۆکایەتی‌یان کردون و، لە بەرامبەر داوودەزگاکانی حکومەت دا لە باتی خێڵەکـە ئـەمان نوێنەرایەتی‌یان کردون. پێوەندی نێوان خێزانی یەکە بچوکەکان لە سەر بنچینەی هـاوخوێنی و، پێوەنـدی نێـوان یەکە کۆمەڵایەتیەکان لە سەر بنچینەی رێچەڵەکی هاوبـەش و قـازانجی نـاوکۆیی لـە مانـەوە و پێکـەوە ژیـان لـە سنورێکی جوگرافی دیاریکراودا، بناغەی هێزە کۆمەڵایەتیەکەیان بوە. لە پاڵ نفوزی سیاسی و ئابوری دا، نفـوزی خێڵەکی‌یان هەبوە، توانیویانە هەندێکیان هەزاران و، هەندێکیان سەدان کەس، لە کاتی پێویست دا، ساز بدەن.

خێڵ، لە ژێر ناوێکی گشتی دا بۆ هەمو هۆز و تیرە و بـەرەباب و خێزانـە جیاوزەکـان، کۆبونەتـەوە. خێڵ، رەوەند یا نیشتەجێ بوبێ، رێکخراوەیەکی کۆمەڵایەتی، ئابوری، فەرهەنگی، جەنگیی ناوکۆیی‌یان هەبوە. هەمویان بە یەک زمان (یەک لەهجە) داخاوتون، بەشی زۆریان لە سەر یەک دین (مـەزەب) بـون، فەرهـەنگێکی هاوبەشیان هـەبوە، لـە نـاو خۆیـان دا هاوسـەرگیری‌یان کـردوە، ناوچەیـەکی دیـاریکراوی ژیـان و چـالاکی ئابوریيان هەبوە، لە بەردەم کەس و گروپ و خێڵەکانی دەوروپشتیان دا، پێکەوە بەرپرس بون، بە ئاشـتی یـا بە شەڕ، پارێزگاری لە بەرژەوەندی خێڵەکەیان و داکۆکی لە ناووناوبانگی بکەن.

لە سەردەمی عوسمانی دا سوڵتان عەبدولحەمید، لـە سـەر شـێوەی یەکـە جەنگیـەکانی قـازاخی روسـی، سودی لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بەرەباب و تیرە و هۆز و خێڵـەکانی کـورد وەرگـرت بـۆ دروسـتکردنی یەکـە خێڵەکیە جەنگیەکانی ئالای حەمیدی (1891) کە هەتا یەکەمین جەنگی جیهانی بەردەوام بون.

لە دوای کۆتایی هاتنی یەکەمین جەنگی جیهانیەوە کە ئینگلیز عیراقی داگیر کردوە و، بۆ بەرێوەبردنی وڵاتەکە عیراقی دابەش کردوە بە سەر سیانزە یەکەی کارگێری دا، لەوانە: لیواکانی سلێمانی، کەرکوک، موسـڵ، هەروەها هەولێریشیان کردۆتە لیوایەک. لەو کاتـەوە نیتـر دەسـەڵاتی حکومـەت: کـارگێری (مـودیری ناحیـە، قایمقام)، پۆلیس، دادگا.. بە شێنەیی خزاوەتە ناوچەکەوە. دەسەڵاتی ئینگلیز سەرەڕای ئـەوەی کـە نیشـی بـە قانونەکانی سەردەمی عوسمانی کردوە، خۆیشی بۆ بـەرێوەبردنی کاروبـاری ناوچـە خێڵـەکی و دێهاتیـەکان نیزامێکی تایبەتی هێناوە کە پێشتر لە ئەفغانستان جێبەجێ کردوە.

دەسەڵاتی ئینگلیز و دوای ئەویش دەسەڵاتی پاشایەتی - هاشـمی لـە عیـراق دا هـەوڵی زۆریـان داوە، سیستەمی خێڵایەتی زیندو بهێڵنەوە و بیچەسپێنن لە بەر ئەوە چەندین هەنگاوی کارگێری، قـانونی، سیاسـی، ئابوری‌یان بەو ئاراستەیەدا ناوە، وەکو:

یەکەم، قانونی دعاوی عەشائیری.

دوەم، قانونی تەسویەی ئەرازی کە زۆری زەویوزاری کوردستانی داوە بە سەرانی خێڵەکان.

سێیەم، بەرێوەبردنی زۆری ناوچەکانیان بە سەرۆکی خێڵەکان سپاردوە و، دایان مەزراندون بـە مـودیر لە کاتێک دا هەندێکیان نەخوێندەوار یا کوڵکەخوێندەوار بون.

چوارەم، کە ئەنجومـەنی نوێنـەرانی عیـراق دانـراوە گـەلێ لـە سـەرانی خێڵـەکان بـە دەسـتێوەردان و پشتیوانی داوودەزگاکانی حکومەت، بەرامبەر بە دڵسۆزی‌یان بـۆ حکومـەت، کراونەتـە ئەنـدامی پارلەمانی عیراق.

سیستەمی دەرەبەگی و سیستەمی خێڵایەتی بە شێوەیەکی سەرەتایی دواکەوتو، کە مافی جوتیاری لە بەر چاو نەگرتبو، بە پێی قانونە کارپێکراوەکانی عیراق درێژەی هەبوە تا شۆڕشی 14 ی تەموزی 1958 قەوما. حکومەتی شۆڕش قانونی ئیسلاحی زەراعی دەرکرد. قانونەکە زۆرتر لەوەی قازانجی ئابوریی پێشکەوتنی کشتوکاڵی لە بەر چاو گرتبێ، مەبەستی سیاسی هەبوە. مەبەستی قانونەکە هەڵتەکاندنی بناغەی ئابوریی سیستەمی دەرەبەگی بوە، بە تایبەتی کە لە سەر بنچینەی کەمکردنەوەی خاوەنێتی زەوی، دانرا بوە. قانونی تازە ئەگەرچی چەند جارێ هەموار کراوە و، سیستەمی دەرەبەگی تا ئەندازەیەکی زۆر هەڵتەکاند و، دەسەڵاتی سەرۆکی عەشیرەتەکانی کەم کردەوە. بەڵام رایەڵەی پێوەندی خزمایەتی دێرینەی نێوان بنەماڵە و بەرەبابەکان، رایەڵەی پێوەندی دێرینەی خێڵایەتی هاوناویی نێوان سەرۆکایەتی خێڵ و ئەندامانی تیرە و هۆزە جیاوازەکانی خێڵەکە (نیشتەجێ و رەوەند)، رایەڵەی پێوەندی دێرینەی خێڵایەتی نێوان زەویدارانی پێشو (میر و ئاغا و بەگ و شێخ) و جوتیارەکان (کرمانج و مسکێن و گۆران)، بە شێوەیەکی تر بەردەوام بو.

حکومەتەکانی عیراق لە سەرەتای دامەزرانیەوە (1921 ز) بۆ سەرکوتکردنی بزوتنەوەی چەکداری کورد پێڕەوی هەمان تاکتیکی عوسمانی کردوە. لە سۆنگەی دوژمنایەتی خێڵەکی و ناکۆکیە کۆمەڵایەتی و ئابوریەکانی نێوان خێڵەکانی کوردەوە، لە بەرەباب و تیرە و هۆز و خێڵی کورد هێزی نیمچە سەربازی "غەیرەنیزامی" لێ دروست کردون. لە شەستەکانی سەدەی بیستەم فورسان سەلاحەدین و، لە هەشتاکانی سەدەی بیستەم دا، لە جەنگەی گەرمبونی جەنگی عیراق - ئێران و، لە گەرمەی پەرەسەندنی چالاکیەکانی پێشمەرگەکانی کوردستان دا، حکومەتی بەعس "فەوجی خەفیف" و "فەوجی دیفاعی وەتەنی" لە سەر بنچینەی سازدانی پیاوە شەڕکەرەکانی تیرە و هۆز و خێڵەکان، بە سەرکردایەتی سەرۆکەکانی خۆیان و، بە ناوی خێڵەکانی خۆیانەوە، یەکەی سەربازی لێ دروست کردن. دوای راگوێزانی دانیشتوانی گوندەکان بۆ ئۆردوگای زۆرەملێ و، شکانی عیراق لە جەنگی عیراق - ئێران و، لە جەنگی خەلیجی دوەم دا و، لە دوای راپەڕینی خەڵکی کوردستان و ئازادکردنی (ئازاری 1991)، ئەم یەکە سەربازییانە هەڵوەشان و، لە گەڵ ئەوەش دا پێوەندی کۆمەڵایەتی، سەربازی، سیاسی، ئابوری، خێڵایەتی ناو فەوجەکان شیرزەیی تێکەوت. "خێزانی ناوکی" ما، بەڵام "خێزانی فراوان" وەکو چوارچێوەی پێکەوەژیانی کۆمەڵایەتی جارانی گوندەکان، تیرە و هۆز و خێڵ وەکو یەکەیەکی کۆمەڵایەتی تەبا و پتەو، لە یەک ترازا.

**تێبینی:**

*دەستەواژەی "خێزانی ناوک" بۆ "nuclear family". و"خێزانی فراوان" بۆ "extended family". بە کار هێنراوە.*

*بۆ ئاگاداری زۆرتر لە سەر خێزانی کوردی لە باری سەرنجی زانایەکی عەرەبەوە، کە لەو بوارەدا لێکۆڵینەوەی مەیدانی کردووە، بڕوانە کتێبی: الدکتور شاکر خصباک: الاکراد دراسة جغرافية اثنوغرافيه. (بغداد - 1972) ص 453 - 479.*

*بەشێ لە پەندە کوردییەکانی لەم بابەتەدا بە کار هێنراون لەم سەرچاوەیە وەرگیراون: شێخ محەمەدی خاڵ. پەندی پێشینان. (سلێمانی - 2007)*

*بۆ ئاگاداری زۆرتر دەربارەی جۆری بەڕێوەبردنی ناوچەکانی کوردستان لە لایەن حاکمە سیاسییەکانی دەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیزەوە، دو لە حاکمەکان خۆیان یادداشتەکانیان نوسیوە. بڕوانە:*

*بە زمانی عەرەبی: های: سنتان فی کردستان، ترجمة فؤاد جميل. الجزء الاول (بغداد - 1973). الجزء الثانی (بغداد - 1973)*

*بە زمانی عەرەبی: ادمونس: کرد وترک وعرب، ترجمة جرجيس فتح الله. (بغداد - 1971)*

*بە زمانی فارسی: ادمونس: کرد وترک وعرب، ترجمه ابراهیم یونسی. (تهران - 1367)*

# ئێلی جاف (بە نمونە)

## بەشی یەکەم:

### گەڕانەوە بۆ مێژو

لە دوا قۆناغەکانی تەمەنی دەوڵەتی عەباسی دا، کە دەسەڵاتی ناوەندی لاواز بـوە، لـە کـەنارەکانی ئـەم ئیمپراتۆرە فراوانە لاوازەدا، ئەمارەتی ناوچەیی و فەرمانڕەوای ناوچەیی دروست بون، تـا ئەنـدازەیـەکی زۆر سەربەخۆ بون، هەر بە ناو سەر بە خەلیفەی عەباسی و بەغدادی پایتەخت بـون. لـە نـاو ئەوانـەش دا هەنـدێ ئەمارەتی کوردی.

هێرشی مـەغۆل و روخـانی دەوڵـەتی عەباسـی، داگیرکردنـی ناوچەکـە، لـە نـاو ئـەوەدا سەرانسـەری کوردستان، لە لایەن خێڵە تورکمانە گەورەکانی ئـاق قۆینلـو و قـەرە قۆینلـو، مێـژوی ناوچەکـە و کـوردی تـا ئەندازەیەکی زۆر ئاڵۆز و تاریک کردوە. باسی کورد لە ناو روداوەکان دا باسێکی سەرەکی نیە، بـە زۆری لـە پەراوێزی روداوەکان دا ئەخوێنرێتەوە. رەنگە تەنیا مێژو کە بۆ باسی کورد تەرخان کرا بێ، شـەرەفنامە بـێ، کە ئەشـێ بـۆ لێکۆڵینـەوەی دۆخـی سیاسـی، ئـابوری، کۆمـەڵایـەتی، کـورد و ئـەمارەت و خێڵـەکانی وەکـو سەرچاوەیەکی تایبەت بە مێژوی کورد کەڵکی لێ وەربگیرێ.

دروستبونی دەوڵەتی عوسمانی لە سەر بنچینەی ئایدیۆلۆجی سوننی و پەلهاویشتنی بـۆ دەسـگرتن بـە سەر رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا و، دوای ئەو دروستبونی دەوڵەتی سەفەوی لە سەر بنچینەی ئایدیۆلۆجی شیعی، هەمو ناوچەکەی کردە مەیدانی شەڕێکی بەردەوام. کوردستان کەوت بوە ناو چەقی ئەم مەیدانـەوە. هاوزەمـان لە گەڵ دروستبونی ئەم دو دەوڵەتەدا، لە کوردستان چەندین ئەمارەت زیندو بوبونەوە و، چەندین خێڵ خۆیـان رێک خست بوەوە. هیچ یەکێکیان ئەی توانیوە ببێتە ناوکی دەوڵەتێکی بەهێز و سەربەخۆ لـە نێـوان ئـەم دو دەوڵەتەدا، بەڵکو بە گوێرەی تەرازوی هێز لە نێوان سەفەوی و عوسمانی دا هەر یەکەیان دڵسۆزی و ملکـەچی

خۆی بۆ یەکێکیان دەربڕیوە.

جاف یەکێک بوە لە گەورەترین عەشیرەتەکانی کـورد. پێکهـاتوە لـە چەنـدین خێـڵ و هـۆز و تیـرەی گەورە و بچوک، زۆری ڕەوەند و کەمێکی نیشتەجێ، لە ناوچەیەکی فراوانی کوردسـتان دا لـە نێـوان جەبـەل حەمرینی خوارەوی کوردستان و چیای داویـدەری سـنە لە ڕۆژهەلاتـی کوردسـتان دا لـە نـاو ڕەشـماڵ دا بـە ئاژەڵداری ژیاون.

بە درێژایی سەدەکانی هەژدە و نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم لە ناوچەکانی سـنوری عوسـمانی و ئێرانی دا ساڵیان بە سەر بردوە. سنوری ئەو دو دەوڵەتە بە هێڵ و کێڵ دیاری نـەکراوە. "تەبەعیـەت" ی زۆر لەو خێڵانەش کە لە ناوچە سنوریەکان دا ژیاون دیار نەبوە. خێڵەکان هەندێکیان هەر نەیـان زانیـوە سـنوری ناودەوڵەتی چیە، چونکە بە درێژایی سـەدان سـاڵ لـە هـەردو دیـوی سـنور هـەبون و، هەنـدێکی تریـان بـۆ خۆپەڕاندنەوە لە دانی باج و سەرباز، هەر جارەی خۆیان سەر بەلایەکیان داناوە. ئەگەر ئێران تەنگی پێ هـەڵ چنی بن خۆیان بە "ڕەعیەت" ی عوسمانی و، ئەگەر عوسمانی تەنگی پێ هەڵچنی بن خۆیان بـە "ڕەعیـەت" ی ئێرانی ژماردوە. خێڵەکانی سنور هەندێ جار بونەتـە هـۆی گـرژی پێوەندیـەکانی نێـوان هـەردو دەوڵـەت و، پێکدادانی چەکداری لە نێوان کاربەدەستانی سنورەکان دا خوڵقاندوە.

## سەرەتای دەرکەوتنی ئێلی جاف

باسی ئێلی جاف لە شەرەفنامەدا (1005 ک/ 1596 ز) نە کراوە. بۆ یەکەم جار ناوی ئێلی جاف لـە پەیمانی زەهاودا هاتوە (1049 ک/ 1639 ز). ناشێ ئەم ئێلە کـە فیدراسـیۆنێکی گـەورەی چەنـدین ئێـل و هۆز و تیرە بوە لە ناوچەیـەکی فراوانـی سەرسـنوری دو زلهێـزی ناوچـەیـی دا ژیـاوە کتـوپڕ لەوسـەردەمەدا دروست بو بێ. ئەبێ پێشینەیەکی مێژویی درێژی هەبو بێ. هەندێ لە مێژونوسان ئەی گێڕنەوە بۆ سەر ئێلـی جاوان، کە لە سەردەمی عەباسیەکان دا ئێلێکی گەورە بون و، لـە جـوانڕۆوە تـا شـاری حیلـەی ئێسـتایان بـە دەستەوە بوە. *(د. مستەفا جەواد، هۆزی لە بیرکراوی گاوان، وەرگێرانی هەژار، بەغداد - 1973.)*

ئەبەردی چاڵدێران (2 ڕەجەبـی 920 ک بەرامبـەر 23 ی ئـابی 1514 ز) کـە خێڵـەکانی کـورد بـە قازانجی عوسمانی بەشداری شەڕەکە بون، بو بە سەرەتای دابەشبونی ناوچەکە، لە سەر ئەرز، بە سەر ئـەو دو دەوڵەتەدا. ئیتر ئەمارەتە کوردیەکانیشی کرد بە دو بەشەوە. بەشێکیان بونە بەشـێ لـە سـەرزەمینی ئێـران و کەوتنە ژێر دەسەلاتی ئێرانی و، بەشـێکی بـوە بەشـێ لـە سـەرزەمینی عوسـمانی و کەوتـە ژێـر دەسـەلاتـی عوسمانی.

### پەیماننامەکانی زەهاو

نادر شا (1159 ک/ 1764 ز) کە لە دوای شەڕە قورسەکانی نێوان ئەم دو هێزە بەستراون، سـنوری ئەم دابەشبونەیان هەرگیز وەکو هێڵێکی دیـاریکراو لـە سـەر نەخشـە و بـە دانـانی کێـل و نیشـانە جیـا نـە کردۆتەوە، بەڵکو لە سەر بنچینەی ناوچـە و شـارەدێ و قـەلا بـوە. خێڵـەکانی سـنور، ڕەوەنـد و نیشـتەجێ، بەرامبەر بە هەندێ باجی ساڵانە هاتوچۆیان تێدا کردوە. زۆر جار ئەوان بونەتـە مایـەی کێشـە و نـاکۆکی و شەڕ. تا گفتوگۆکـانی ئـەرزڕۆم بـە ڕێککەوتننامـەی یەکـەم (1238 ک/ 1823) و ڕێککەوتننامـەی دوەمـی ئەرزڕۆم (1263 ک/ 1847 ز) کۆتایی هات و پاشان کۆمیتەی دیاریکردنی سنور دانرا.

پەیمانی زەهاو ئەگەرچی هێڵی سنوری نێوان هـەردو دەوڵـەتی نـە کێشـاوە، بـەلام ناوچـەکانی قـەڵـەمڕەوی هەردوکیانی، بە ناو دیاری کردوە. لە پەیمانی زەهاو دا کە گۆیا پەیمانێکی دو قۆڵی بوە لە نێوان ئێـران و عوسـمانی دا، تەنیا بەڵگەیەک لە بەر دەس دایە کە وەکو پەیمانێکی یەکلایەنەی عوسمانی نوسراوە بـۆ ڕاگـەیانـدنی سـەلماندنی

ڕێکەوتنەکە بە لایەنی ئێرانی. بە پێی ئەو پەیمانە بەمجۆرە سنوری قەڵەمڕەوەکانی خۆیان دیاری کردوە:

"لە سنوری لای بەغداد و ئازربایجان دو شوێن بەناوی جەصان و بەدرە هی ئێمە بن، قەسەبەی مەندەلی تا دەرەتەنگ، کە سەرمیل بە سنوری دیاری کراوە. لە گەڵ دەشتەکانی بۆ ئێمە بێ. شاخەکەی نزیکی بۆ ئەولا بێ. میلیاشی بۆتە سنور. دەرەتەنگ و دەرنە هی ئێمەن.

هۆزەکانی زیائین و هارونی لە ئێلی جاف هی ئەعلا حەزرەتی هومایونیی ئێمەن و. پیرە و زەردویی یش بۆ لاکەی تر ماوەتەوە.

قەڵای زنجیر کە بە لوتکەی شاخەوەیە وێران بکرێ. ئەو گوندانەش کەوتونەتە ڕۆژئاوای قەڵای وێرانکراوی ناوبراو بۆ ئێمە ئەمێننەوە و ئەو گوندانەش ئەکەونە ڕۆژهەڵاتی بۆ ئەولا ئەبن.

لە نزیکی شارەزور ئەو کێوەی کەوتۆتە ئەولای قەڵای زەڵم هەر شوێنێکی بروانێ بە سەر قەڵای ناوبراو دا لە لایەنی هومایونیی ئێمەوە زەوت کراوە. قەڵای هەورامان لە گەڵ گوندەکانی دەوروبەری بۆ لایەنەکەی تر. گەرنەی چەقان دانراوە بە سنوری شارەزور. قزڵجە و دەوروبەری هی ئێمەن و مەریوان و دەوروبەری هی لایەنەکەی تر.

هەردولا بڕیاریان داوە قەڵای قوتور و ماکۆ لە سەر سنوری وان و. قەڵای مغازبرد لە لای قارس کاول بکەن."

لێکۆڵینەوەی هەلومەرجی ڕۆژگاری بەستنی ئەم پەیمانە و ناوەڕۆک و ئەنجامەکانی دەری ئەخەن:

**یەکەم:** لە کاتی نوسینی پەیمانی زەهاو دا بنەماڵەی سەفەوی حوکمی ئێرانی کردوە و. دوای ئەوان بنەماڵەی ئەفشار، زەند، ئینجا قاجار، بە دوای یەک دا حوکمیان کردوە. لە سەردەمی هەمویان دا هەم جەنگی خوێناوی لە نێوان ئێران و عوسمانی دا قەوماوە، هەم پەیمانی ڕێککەوتن مۆر کراوە. بەڵام لە هەمو سەردەمەکان و لە هەمو گفتوگۆکان و لە هەمو ڕێککەوتنامەکان دا ناوەڕۆکی پەیمانی زەهاو کراوە بە بنچینە. زەهاو کە شوێنی کۆبونەوە و ڕێککەوتنی نوێنەرانی هەردو دەوڵەت بوە، شارێکی کوردنشین بوە لە نێوان کرماشان و خانەقین دا. لەو سەردەمە دا و لە ئێستاش دا مەڵبەندی ژیانی چەندین ئێلی کورد بوە لەوانە بەشێ لە هۆزەکانی ئێلی جاف.

**دوەم:** تەرازوی هێزی هەردو دەوڵەت ڕۆڵی سەرەکی هەبوە لە دارشتنی ڕێککەوتننامەکان دا و لە دیاریکردنی سنوری ئێران و عوسمانی دا. لەوەدا گوێ نەدراوەتە پرسی نەتەوەیی، خێڵایەتی، دینی، مەزهەبی دانیشتوانی ناوچەکە. لە بەر ئەوە دیاریکردنی سنور بۆتە هۆی دابەشکردنی قەڵەمڕەوی میرایەتیەکانی کورد و مەڵبەندی ژیانی ئێلە گەورەکانی. قەڵەمڕەوی ئەم میرایەتیانە یان کەوتونەتە ناو یەکێ لەم دو دەوڵەتە، یان بەشێکی بەر ئەو دابەشکردنە کەوتوە. دوای ئەم پەیمانە ئیتر ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە یەکجاری بۆتە بەشێکی ئێران، لەوانە میرایەتیەکانی ئەردەڵان و موکریان کەوتونەتە ژێردەستی دەوڵەتی ئێران و. باشور و ناوەندی کوردستان بۆتە بەشێکی عوسمانی، لەوانە میرایەتیەکانی بابان و سۆران کەوتونەتە ژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانی. ئێلە گەورەکانی کوردیش بە درێژایی ئەو سنورە دابەش کراون بە سەر هەردو دیوی سنورەکەدا، لەوانە ئێلی جاف.

**سێیەم:** بە پێی ئەو دابەشکردنە زەمینیەی لە پەیمانی زەهاو دا لە سەری پێک هاتون، بەدرە، جەسان، مەندەلی، دەرەتەنگ و دەرنە (نزیک خانەقینی ئێستا)، قەڵای زەڵم (نزیک خورماڵی ئێستا) و گەرنەی چەقان (نزیک سەید سادقی ئێستا) و قزڵجە (نزیک پێنجوینی ئێستا) کەوتۆتە بەری عوسمانی. قەڵای هەورامان (نزیک پاوەی ئێستا) و مەریوان، قوتور (نزیک ورمێی ئێستا) و ماکۆ کەوتۆتە بەری ئێران.

دەرنە و دەرەتەنگ کەوتونەتە سنوری میرایەتی باجەڵان. قەڵای هەورامان و مەریوان کەوتونەتە سنوری میرایەتی ئەردەڵان. قەڵای زەڵم و چەقان و قزڵجە، کە پێشتر سەر بە میرایەتی ئەردەڵان بون،

کەوتونەتە سنوری میرایەتی بابان.

**چوارەم:** بە پێی ئەو دابەشکردنە ئێلاتییەی لە پەیمانی زەهاودا لە سەری پێک هاتون، تەبەعیەتی هۆزەکانی زیادینی و هارونی لە ئێلی جاف بۆ عوسمانی دیاری کراوە. لە بەرامبەردا تەبەعیەتی هۆزەکانی پیرە و زەردویی بۆ ئێران ساغ کراوەتەوە. دیارە ئەم هۆزانە لەو سەردەمەدا گەورە و گرنگ بون بۆیە لە پەیمانێکی وەها گرنگ دا ناویان هاتوە. بەڵام ئێستا هۆزێک بە ناوی زیادینی و هۆزێک بە ناوی پیرەوە نا ناسرێن. رەنگە ئەم دو هۆزە لە بەر هەر هۆیەک بێ پوکابنەوە و تێکەڵاوی تیرە و هۆزی تر بو بن. هارونی و زەردویی هەردوکیان تا ئێستاش لە ریزی هۆزەکانی جاف دا ئەژمێردرێن.

## دابەشبونی ئێلی جاف

پەیمانی زەهاو لە سەردەمی حوکمی شا سەفی سەفەوی (1038 - 1052 ک/ 1629 - 1642 ز) و سوڵتان مورادی عوسمانی (1021 - 1049 ک/ 1612 - 1640 ز) دا بەستراوە. ئێلی جاف، کە فیدراسیۆنێکی گەورەی کۆمەڵێ خێڵ و تیرە و هۆزی کۆچەر بوە، دوای ئەم پەیمانە ئیتر دابەش بوە بە سەر هەردو دەوڵەت دا. بەشێکی لە کرماشانەوە تا سنە کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی ئێرانەوە و، بەشێکی لە خانەقینەوە تا پێنجوین کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەوە. بەشی ئێرانی بە ناوی جافی جوانرۆ و بەشی عوسمانی بە ناوی جافی مرادییەوە ناسراون.

جافی مرادی ئەو هۆزانەی جاف بوە کە لە ئەنجامی پەیمانی زەهاو دا کە لە سەردەمی سوڵتان مرادی عوسمانی دا مۆر کراوە "تەبەعیەت" ی عوسمانی‌یان پێ بەخشراوە. بۆ جیاکردنەوەیان لە جافی جوانرۆ نازناوی مرادی‌یان دراوەتێ.

مەڵبەندی ژیانی جافی مرادی کەوت بوە ناو قەڵەمرەوی میرایەتی بابانەوە. میرایەتی بابان یەکێ بوە لەو میرایەتی‌یانەی سەر بە ولایەتی بەغداد و لە رێگەی وەزیری بەغدادەوە ئەویش سەر بە بابی عالی بوە. ئێلی جاف یەکێ بوە لە سەرچاوەکانی هێزی مرۆیی شەرکەرانی میرایەتی بابان.

مێژوی دێرینی ئەم ئێلە تا رادەیەکی زۆر تاریکە، چونکە لە کاتی خۆی دا، نە لە لایەن کەسێکی خۆیانەوە و نە لە لایەن مێژونوسانی ترەوە نە نوسراوەتەوە. باسی ئەم ئێلە، لە رێگەی مێژوەکانی ئەردەڵانەوە، لە سەردەمی یەکێ لە سەرۆکەکانییەوە دێتە ناو روداوەکانی ناوچەکەوە کە ناوی زایەر بەگ (ظاهر) بوە.

## ڕێچەڵەکی بەگزادەکانی جاف

بەگزادەکانی جاف، وەکو بنەماڵەیەکی دیار لە روداوەکانی ناوچەکەدا، لە سەردەمی پیاوێکەوە دەس پێ ئەکا کە ناوی زایەر بەگە. زایەر بەگ بە باپیرە گەورەی هەمو بەگزادەی جاف و، بە دامەزرێنەری یەکێتی تیرە و هۆزە جیاوازەکان دائەنرێ کە ئێلی جافی مرادی‌یان پێک هێناوە.

زایەر بەگ، وەکو هەندێ سەرچاوە ئەگێرنەوە، لە روداوێک دا کوژراوە. هۆی کوژران و شێوەی کوژرانەکەی لە سەرچاوە جیاوازەکان دا بە سێ چیرۆکی جیاواز ئەگێردرێنەوە:

### چیرۆکی یەکەم،

سەرچاوەکانی ئەردەڵان ئەڵێن، وشکە ساڵی بوە. قاتوقڕی لە سنە و دەوروبەری بڵاو بۆتەوە (1155 ک). نادر شا لە سنە، بنکەی میرایەتی ئەردەڵان، دانەوێڵەی بۆ لەشکرەکەی خۆی عەمار کردوە. خان ئەحمەد،

والی ئەردەڵان، دانەویڵەی عەمارەکانی دەرهێناوە دابەشی کردوە بە سەر خەڵک دا. نادرشا داردویەتی بۆ دانەوێڵە هەڵگیراوەکەی. خان ئەحمەد لە ترسی سزای نادر شا ئەردەڵانی بە جێ هێشتوە، هەڵاتوە روی کردۆتە خاکی عوسمانی. لە رێگەی هەڵاتن دا توشی زایەر بەگ بوە. زایەر بەگ نە کەوتۆتە تەکی، یان گوێڕایەڵی نە کردوە، یان وەکو پێویست بە پیریەوە نە چوە و رێزی لێ نەگرتوە بوە بە شەڕیان. زایەر بەگی کوشتوە. *(مستورەی کوردستانی، مێژوی ئەردەڵان، د. حەسەن جاف و شکور مستەفا کردویانە بە کوردی، بەغداد - 1989 . ل 97)، هەروەها (خسرو بن محمد بن منوچهر اردلان، لب تواریخ، از انتشارات کانون خانوادگی اردلان، تهران - مهر ماه 2536. ل 42 - 43)*

**چیرۆکی دوەم،**

بە پێی گێڕانەوەی ئیدمۆندس، زایەر بەگ لە گەڵ نزیکەی سەد رەشماڵ لە جوانرۆوە کۆچی کردوە یا هەڵاتوە بۆ بانی خێڵان (نزیک دەربەندیخانی ئێستا) لە کەناری رۆژئاوای روباری سیروان. لەم شوێنە کێوی قەرەداخ بە لای روبارەکەدا لێژ دەبێتەوە کە لە قەڵەمڕەوی بابان دا بوە.

بە پێی لێکدانەوەی ئیدمۆندس وردترین مێژو (1186 ک / 1772 ز) کە ئەحمەد پاشا میری بابان بوە لە قەڵاچوالان، پاشا بە روی خۆشەوە زایەر بەگی وەرگرتوە. بەڵام دوای ماوەیەک بە راستی یان بە ناڕاستی زایەر بەگی بە بەرپرسی تاڵان و جەردەیی گروپێکی چل کەسی زانی کە لەو ناوچەیەدا دەستیان دابویە. لە سەر ئەوە ئەویان بە بارمتە گرت تا ئەو گروپە خۆیان بە دەستەوە بدەن. قادر بەگی کوڕی زایەر بەگ ئەم گروپەی، کە ئاسایشی گشتیان شێواند بو، گرت و کوشت. بەڵام ئیتر بۆ رزگارکردنی باوکی درەنگ بو، چونکە پاشای هەڵەشە ئەوی کوشت بو. کوشتارگای چل جەردەکە لە نزیک بانی خێڵان بە گۆڕی کورگەل ناسراوە. گۆڕی زایەر بەگ لە دزایشە کە لە هەمان ناوچەدایە. پاشای بابان گوندی دزایشی لە تۆڵەی ئەو ستەمەی لە زایەر بەگی کردبو داوە بە قادر بەگی کوڕی. *(ئیدمۆندس: 155 - 158)*

**چیرۆکی سێیەم،**

کەریم بەگ هاتنی زایەر بەگ بە جۆرێکی تر دەگێڕێتەوە: "تیکرار لە پاش مودەیەکی زۆر کە تەسادوفی زەمانی زاهیر بەگ و تاهیر بەگ دەکا، ئەولادی یار ئەحمەد بەگی کوڕی سەیفوڵا بەگی کوڕی سەید ئەحمەد بەگی رەئیسی ئێلی جافن. زاهیر بەگ و تاهیر بەگ لە جوانرۆ، کە جاف زۆر دەبن و زیادی نفوسیان دەبێ. زاهیر بەگ بە خۆی و چوارسەد ماڵ لە تەک خانە بەگ دا، کە باوکی گەورەی بەگزادەی وەلەد بەگیە، دێنە بانی خێڵان." *(کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، تەئریخی جاف، لێکۆڵینەوەی دکتۆر حسەن جاف، بەغداد - 1995. ل 147 - 148)* تاهیر بەگ، لە بەر هەر هۆیەک بو بێ هەر ئەو زەمانە رۆیشتوە بۆ شام و لەوێ جێگیر بوە، نەگەڕاوەتەوە.

کەریم بەگی جاف باسی کوژرانی زایەر بەگ ناکا بەڵکو نوسیویێتی سالی 1165 بە رەحمەتی خوا چوە و گۆڕەکەی لە فەقێ جنەیە.

## جاف و باشوری کوردستان

دەشتی شارەزور، کە ئێستا سەید سادق ناوەندەکەیەتی، ناوچەیەکی بە پیت و پڕ لە شەخەڵ و، لەوەڕگای فراوان بوە. بەڵام مێشولەی مەلاریا کە بە زمانی ناوچەکە "هورە" ی پێ وتراوە و نەخۆشی مەلاریا کە بە زمانی ناوچەکە "لەرزوتا" ی پێ وتراوە، بەلایەکی کوشندە بوە. هەمو سالێ ژمارەیەکی زۆر منالی کوشتوە. نە رێگەیەکیان بۆ لەناوبردنی مێشولەکانی زانیوە و نە چارەیەکیان بۆ نەخۆشیەکەی دۆزیوەتەوە.

هاوینان هەرزاڵەیان کردوە لە سەری خەوتون و شەوان بۆ ئەوەی مێشولە لە خۆیـان دور بـخەنەوە تەپاڵەیـان سوتاندوە، بە دوکەڵەکەی ویستویانە هوڕە دور بخەنەوە. بۆ چارەسـەری نەخۆشەکانیشـیان پەنایـان بـردۆتە بەر شـێخ و مەلا نوشـتەیان بـۆ بنوسـێ. یـا لەرزوتایـان بـۆ ببـڕێ. مەلایەک بە دەم خوێنـدنی سـورەتێکی قورئانەوە پەڕۆیەکی سەوزی گرێ داوە، تا لە خوێندنی سورەتەکە بۆتەوە پەڕۆکە چەند گرێیەکی تێ کەوتوە. ئەو پەڕۆیە کـراوەتە دەسـتی نەخۆشـەکەوە، گـوایە بەوە لەرزوتـاکەی ئەپەڕێ. لە بەر ئەوە گونـدەکانی کەم و دانیشتوانی کەم بون. چەندین هۆز و تیرەی جیاوازی تێـدا بـوە لەوانە: بڵبـاس، کەڵـوڕ، مەنمـی، گەڵاڵـی. زۆرتر لە وەرزی زستان دا بۆ مانەوە و لە وەرزی بەهاردا بـۆ لەوەڕخـۆری بە کاریـان هێنـاوە. نـاوچەکە ئەو سـەردەمەی بـنکەی حـوکمڕانی ئەردەڵان لە قەڵای زەڵـم بـوە، بەشـێ بـوە لە قەڵەمـڕەوی ئەردەڵان و، دوای لەشکرکێشیەکانی عوسمانی و گوێزانەوەی بنکەی فەرمانڕەوایی ئەردەڵان بۆ قەڵاکانی حەسەناوا و پاڵنگـان و سەرەنجام بە یەکجاری بۆ سنە، نـاوچەکە بەیەکجـاری بـۆتە بەشـێکی سـەرزەمینی عوسـمانی و، قەڵەمـڕەوی میرایەتی بابان.

دوای هاتنی زایەر بەگ و جاف بۆ ناوچەکە نەخشـەی دیمـۆگرافی - خێڵەکـی دانیشـتوانی نـاوچەکە گۆڕاوە. قادر بەگی کوڕی زایەر بەگ، بیانوی بە دانیشـتوانی خـۆجێیی و کۆچەرەکـانی نـاوچەکە گرتـوە. لە چەمی شلێر (نزیک پێنجوینی ئێستا) پەلاماری داون و، وەکو دەماودەم گێڕاویـانەتەوە، چوارسـەد کەسـی لـێ کوشتون. ئەگەر ژمارەکە پێوەنانیشی تێدا بێ گەورەیی قەوارەی کوشتارەکە دەرئەخا. بەو هۆیەوە هۆزەکـانی ناوچەکە هەندێکیان پەرەوازە بون، بە یەکجاری کۆچیان کردوە بۆ شوێنانی تر، ئەوانی مـاونەوە، بە تـایبەتی هۆزی گەورەی گەڵاڵی، دەسەڵاتی بەگزادەی جافیان قوبوڵ کردوە. تێکەڵاوی ئەو فیدراسیۆنە گەورەیە بون کە بە ناوی ئێلی جافی مرادیەوە دەرکەوتوە.

زایەر بەگ دو کوڕی لە پاش بە جێ ماوە:

سلێمان بەگ و قادر بەگ.

## پێکهاتەی ئێلی جاف

ئێلی جاف لە دوای جیاکردنەوەی سنوری دەسەڵاتی ولایەتی ئەردەڵان و میرایەتی بابـان، بـون بـە دو بەشی سەرەکیەوە: جافی جوانڕۆ و جافی مرادی.

جافی جوانڕۆ، پێک هاتوە لەو هۆز و تیرە و بەرەبابانەی لە سـنوری دەسـەڵاتـی دەوڵـەتی ئێـران دا، سەرەڕای گۆڕانی زنجیـرەی بنەماڵـەی شـاهەکانیان، ماونەتـەوە، سـەر بـە ئـەمارەتی ئـەردەڵان بـون. والـیی ئەردەڵان سەرۆکەکانی دیاری کردون. زۆری ئەمان نیشتەجێ بون، کەمێکیان رەوەند بون. سەرۆکایەتی جـافی جوانڕۆ و جۆری پێکهاتەی خێڵایەتیـیان جیاواز بوە لە جافی مرادی.

جافی مرادی، پێک هاتوە لەو هۆز و تیرە و بەرەبابانەی لە سنوری دەسەڵاتـی دەوڵـەتی عوسـمانی دا، ماونەتەوە، سەر بە ئەمارەتی بابان بون. سەرۆکایەتی ئێل لە باوکەوە بۆ کوڕ ماوەتەوە، هەروەها سـەرۆکایەتی هۆز و تیرەکان لە باوکەوە بۆ کوڕ ماوەتەوە. سەرۆکی ئێل سەرۆکایەتی هۆز و تیرەکانی خۆی سـەلماندوە و، پاشای بابان سەرۆکایەتی گشتی ئێلەکەی سەلماندوە. زۆری ئەمان رەوەنـد بـون، کـەمێکیان نیشـتەجێ بـون، پێکهاتەی خێڵایەتیـیان جیاواز بوە لە جافی جوانڕۆ.

ئێلی جاف کە پێک هاتوە لە یەکگرتن (فیدراسـیۆن)ی چەنـدین هـۆزی جیـاواز، بـە چەنـدین نـاوی جیاواز و، بە چەندین پێکهاتەی جیاوازەوە، هەرگیز ئیـدیعای نـە کـردوە کـە هـەمویان لـە یـەک بـاپیرەن و، ڕیچەڵەکی هاوبەشیان هەیە و، هاوخوێنی بە یەکیانەوە ئەبەستێ. بەڵکو هەمیشە، هەر هۆزەیان خۆی بە جیا لە

هۆزەکانی تر زانیوە. بەڵام لە ژێر ئاڵای بنەماڵەی بەگزادەدا کە نەوەی کەسێ بون بە ناوی زاهیر بەگ (ظاهر بگ) ەوە کۆبونەتەوە و گوێڕایەڵی فەرمانی سەرۆکەکەی و ڕێوشوێنەکانی ئەو بون.

بەگزادەی جاف، لە گەڵ هیچ کام، لە هۆز و تیرەکانی، کە ئێلی جافیان پێک هێناوە، خزمایەتی هاوخوێنییان نەبوە و، ژنوژخوازیشییان نەکردوە. هیچکام لە هۆزە سەرەکییەکانی جاف نەوە و وەچەی ئەوان نەبون. بەڵکو هەریەکەیان هۆز یا تیرەیەکی سەربەخۆ بون.

ئێلی جاف لە ناو خۆی دا جۆرێ لە سیستەمی حوکمڕانی هەبوە. لە ناوچەکەدا حکومەتێکی ئۆتۆنۆم بوە، بەڵام حکومەتێکی ڕەوەند بوە. زۆریان کۆچەر بون. هەمو ساڵێ گەرمیان و کوێستانیان کردوە، کەمێکیان نیشتەجێ بون.

جاف بە پێی بەهێزی و لاوازی سەرۆکایەتیەکەی گەورە بوە یان بچوک بۆتەوە. گەورەبونەکەی بەوە بوە هەندێ هۆز و تیرەی تری هاتۆتە پاڵ و، لاوازبونی بەوە بوە هەندێ هۆز یا تیرەی لێ تەکیوەتەوە.

## کورد و گۆران

ئێلی جاف کۆمەڵگای دێهاتی لە باری سەرنجی خۆیەوە بە سەر دو چینی کۆمەڵایەتی دا دابەش کردوە، کورد و گۆران:

ئێلی جاف، بەگزادەکانی و هۆز و تیرە سەرەکییەکانی، بە خۆیان وتوە کورد. خۆ بە کورد دانانی جاف و ئەوانی تر بە گۆران و غەوارە ئاماژە نەبوە بۆ ناسنامەی نەتەوەیی ئێلی جاف بەڵکو ئاماژە بوە بۆ کۆچەری بون و ڕەوەندایەتی. لای ئەوان خێڵەکێتیی و نیشتەجێبون پێوەری سەرەکی دابەشکردنی پایەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵ بوە. گۆیا پیاوی خێڵەکی، جەنگاوەرێکی ئازا و ئازاد بوە. بە پێچەوانەوە نیشتەجێ، کابرایەکی ترسنۆکی ملکەچ بوە.

گۆران، بە هەمو جوتیار و گوندنشینەکانی گەرمیان و شارەزور و مەریوانی، سەرەڕای جیاوازی ڕێچەڵەکی هۆز و خێڵەکانیان وتوە گۆران.

لە پلەی کۆمەڵایەتی دا جاف خۆی لە گۆران بە بەرزتر داناوە. لە ناو خۆیشی دا بەگزادە لە سەروی تەلاری کۆمەڵایەتی ئێلەکەدا بوە، هۆز و تیرەکانی جاف لە خوار پلەی بەگزادەوە بون. جگە لە هۆزی گەڵاڵی کە سەرۆکی تیرەکانیان نازناوی "ئاغا" یان پێوە بوە، هیچ کام لە هۆز و تیرەکانی تر نازناوی بەگ یا ئاغایان پێوە نەبوە.

## هۆزەکانی جاف

هۆزەکانی جافی مرادی هەریەکەیان ناوی تایبەتی خۆی هەبوە. کوێخا و دەمڕاستی تایبەتی خۆی هەبوە، سوارە و پیادەی خۆی هەبوە، هەواری زستانە و بەهارە و هاوینە و پایزە و ڕێگای دیاریکراوی تایبەتی خۆی بۆ گەرمیان و کوێستان، هەبوە.

کەریم بەگی جاف کە خۆی لە بیستەکان و سییەکانی سەدەی بیستەم دا سەرۆکی ئێلی جاف بوە و، "تەئریخی جاف" ی نوسیوە، چەرەیەکی باش زانیاری لە سەر هۆز و تیرەکانی جاف باس کردوە. بۆ ڕونکردنەوەی ڕێکخراوەی خێڵەکیی ئێلی جاف، ئەو دەستەواژەکانی: عەشیرت، ئێل، تایەفە، فیرقە، کۆمەڵی بە کار هێناوە. هەمو هۆزە سەرەکیەکانی بە "طایفە" و، تیرەکانی هەندێ جار بە "فیرقە" و هەندێ جار بە "کۆمەڵ" و، سەرۆکی هۆز و تیرەکانی بە "گەورە" ناو بردوە و تێکڕای ئێلەکەی دابەش کردوە بە سەر "گەڕیاو" و "دانیشتو" دا.

دەربارەی ناوی هۆزەکانی ئێلی جافی جوانڕۆ و جافی مرادی نوسیوێتی:

"بەیانی عەدەدی طایفەکانی جاف لە ئێران و لە کوردستانی بابان دا کە داخڵی عێراقە. ئەم عەشیرەتە بە عومووم پێیان ئەڵێن جاف و، ئەم طایفانە ئیسمیان ئەمەیە:

## طایفەکانی جافی بابان:

ئیسمی فیرقە: مکایەڵی، شاتری، رۆغزایی، تەرخانی، باشکی، هـارونی، صـەبانی، کەمـاڵەیی، بەباخـی، عەمەلە، عیسایی، گەلاڵی، نەورۆڵی، یەزدانبەخشی، وەڵیی، نەژوێنیی، مەسۆدی، شێخ ئیسـماعیلی، صـۆفی وەنـد، تاووگۆزیی، میراوڵیی، پشتماڵە، سمایل عوزێری، بێسەریی، چووچانیی، تیلەکۆ.

ئەم چەند طایفە لە جافەکانی ئێران جـوێ بـونەوە و هـاتوونە شـارەزوور و خـاکی بابـان کە داخڵـی عێراقە و. طایفەکانی جاف کە لە ئێران ماوەتەوە ئەمەیە کە ئەینوسم:

قوبادی، باوەجانی، ئیمامی، یەناخی، قادرمیروەیسی، طایشەیی، کۆییک، ئێرژی، دەروێشی، وەڵەدبەگـی، دەلەژێری، کۆکۆیی، زەردویی، عەلی ئاخەیی، پەپلی، تاووگۆزی، دورویی، کوێرەکی." *(کەریم بەگ: 124)*

### چەند تێبینیەک:

**یەکەم:** ناوی ئەم هۆزانە یەک جۆر نین. ئەگەرچی هەنـدێکیان خۆیـان لێکدانـەوەی جۆراوجـۆری بـۆ ئەکەن بەڵام قسەکان هیچ بنەمایـەکی زانسـتی - زمـانەوانی، مێژویـی، بـەجێ و بـاوەرپێکراویـان نیـە. هـیچ بەڵگەیەکی مێژویی نوسراو لە بەر دەس دا نیە کە ئەو ناوانە لە چیەوە داکەوتون. ئاخۆ ناوەکان هـی بـاپیرە گەورەیانە، یا هی یەکەم گەورەی دەسەلاتداریان بوبێ، کە رەنگە باپیرەیان نە بو بێ، بەڵام کۆی کردونەتـەوە، هی شوێن یا هی پیشەکەیان بوە.

بە رواڵەت دەشێ ناوەکان بۆ چەند خانە پۆلێن بکرێن:

- هۆز بە ناوی کەسایەتیەوە وەکو: هارون - هـارونی، میکائیـل - مکایـەڵـی، روخ زاد - رۆغزایـی، کەماڵەیی (کەمالەیی)، بداخ - بداخی، ئیسماعیل عوزێری، شێخ ئیسماعیلی.
- هۆز بە ناوی شوێنەوە وەکو: گۆمەیی، گەلاڵی، شینکی.
- هۆز بە ناوی پیشەوە: کافرۆشی، شوانکارە، عەمەلە، شاتری، تەرخانی.

هێشتا چەند ناوێ ئەمێنێتەوە کە ناچێتە هیچ کام لەم پۆلێنەوە، لەوانە: ناوی جاف، نەورۆڵی، باشکی، سەبانی...

**شاتری:** شاتر (شاطر) بەوانەیان وتوە کە لە نێوان ناوەندی دەسەلات و شوێنەکانی تـردا پۆسـتەیـان هێناوە و بردوە. بەڵام هۆزی شاتری، ئەگەر لە بنەڕەت دا ئەمە پیشەیان بو بێ، ئەوەندەی بەشێ بون لە جافی مرادی ئەو کارەیان نەکردوە و لە لایەن هیچ دەوڵەت و میرایەتیەکەوە ئەو کارەیان پـێ نەسـپێردراوە، بـەڵکـو خاوەن ئاژەڵ بون. ئاژەڵداریەیان کردوە.

**شوانکارە:** خێڵێکی گەورە بون. ئەمارەتێکی گەورەیان لە ناوچەی فارسی ئێران دامەزرانـدوە. سـەدان ساڵ فەرمانڕەوا بون چی گەیاندونیەتیە ئەم ناوچەیە و چی لە ژێر ئاڵای جاف دا کۆی کردونەتەوە؟

**گەلاڵی:** گەلاڵی هۆزێکی کۆنی دانیشتوی ناوچەکە بـوە. "معجـم البلـدان" لـە ریـزی خێڵـە گـەورەکانی شارەزوردا ناوی بردون. بەڵام دیارە روداوەکانی رۆژگار پەرەوازە و لاوازی کردون.

**دوەم:** هەمو هۆزێکی ئێلەکە پێکهاتوە لە تیرە و بەرەبابی جیاواز. مەرج نیە هاوخوێن و هاورێچەڵـەک بو بن. بەڵکو قازانجی هاوبەش و هەندێ جار دوژمنی هاوبەش پێکەوەی بەستون. بەرەبابێکی لاوەکی رەنگە بە هۆی نە بونی لەوەڕگا، یان بەهۆی دوژمنایەتی لە گەڵ تیرەیەکی لە خۆی بەهێزتر، بەمـەوە نیشـت بێتـەوە، پاش ماوەیەک بوە بە بەشێ لە هۆزەکەی و. رەنگە پێچەوانەکەیشی روی دابێ.

بۆ وێنە هۆزی شاتری کە یەکێ لە هۆزە سەرەکیەکانی پێکهێنەری فیدراسـیۆنی جـاف بـوە، پێـک هـاتوە لـە چەندین تیرەی جیاواز، لەوانە: میروەیسی، پیـروەیسـی، کـەرەموەیسـی، وەڵـی، یوسـف جـانی. رەنگـە ئـەم تیرانـە رێچەڵەکی هاوبەشیان نـە بـوبێ، بـەڵام قـازانجی هاوبەشـیان هـەبوە، پێکـەوە کۆچیـان کـردوە، هـەواری هاوبـەش،

لەوەڕگای هاوبەش، هێزی خۆپاراستنی هاوبەش، کۆمەڵێ دەمڕاستی هاوبەشیان هەشبوە. لە بەر ئەوە یەکەیەکی کۆمەڵایەتی پتەویان هەبوە، هەندێ تیرەی لاواز بۆ خۆپاراستن داویانەتە پاڵ ئەمان، ئەمانیش بۆ خۆبەهێزکردن لە خۆیان گرتون. بە تێپەڕینی زەمان تێکەڵاوی یەکتری بون و بون بە بەشێ لە تیرەکە و، هەمان ناویان هەڵگرتوە.

**سێیەم:** هەندێ لەم هۆزانە دوای دابەش بونی جاف بە سەر مرادی و جوانرۆیی دا لە سنوری ئێران دا بە هەمان ناوەوە ماونەتەوە. هەرچەندە لەوانەیە خۆیان بە خزمی یەکتری دابنێن. بەڵام بـون بـە دو پێکهاتـەی خێڵەکی جیاواز، بە یەک ناوەوە. جگە لە نـاوی هۆزەکـە لـە هـەردو دیـو هەنـدێ گونـد و شـوێنی هاونـاوی یەکتریان ناوا کردۆتەوە.

بۆ نمونە هۆزی شێخ سمایلی بەشێکیان بە هەمان ناوەوە لـە ئێـرانن بەشـێکی تریـان لـە شـارەزوری عێراقن. بون بە دو هۆزی جیاواز. بەڵام ئەو شێخ سمایلەی کە ئەوانی بـە نـاوەوە نـاو نـراوە کـێ بـوە؟ نـە خۆیان ئاگاداریەکی باوەڕپێکراویان بە دەستەوەیە، نە مێژوی نوسراویش هیچی لە سەر وتوە.

هەروەها هۆزەکانی تیلەکۆ، زەردویی، کە لە هەردو دیو هەبون.

## پێوەندی بەگزادە و هۆزەکانی جاف

پێوەندی نێوان بنەماڵەی بەگزادەی جاف و هـۆز و خێڵـەکانی و، پێوەنـدی نێـوان سـەرانی جـاف و ئەندامانی ئاسایی جاف لە سەر بنچینەی هاوخوێنی نە بوە، هەروەها لە سەر بنچینەی زەویداریش نە بـوە. سەرانی جاف تا سەردەمی مەحمەت پاشا خـاوەنی زەوی نـە بـون. دەرامـەتی ئـەوان لـە بـەروبومی زەوی و کشتوکاڵەوە نە بوە، ئەندامانی هۆز و تیرەکانی جاف جوتیار نە بون تا کار لە زەوی زەویـدارەکان دا بکـەن و باجی زەوی - دەرەبەگیی بدەن بە سەرۆکەکانیان. سـەرچاوەی داهـاتی هـەمو ئێلـی جـاف بـە بـەگزادە و خێڵەکی ئاساییەوە، ئاژەڵداری بوە. هەر کەسەیان بەشی خۆی، کەم یا زۆر، ئاژەڵی هەبوە. لەوەڕگاکان ئـەوەی هی خۆیان بوە هاوبەش بوە و، ئەوەی هی خۆیان نەبوە بە کۆمەڵ پوشانەیان داوە بە خاوەنەکانی. پێوەندی نێوان بنەماڵەی سەرۆکایەتی و سەرۆک و ئەندامانی خێڵەکان لە سەر بنچینەی هاوقازانجی - پەتریارکی بوە.

"تەنزیمات" ی عوسمانی کە بـۆ چاکسـازی لە بەڕێـوەبردنی کاروبـاری دەوڵەت دا دانـرا بـو، دەرەنـگ گەیشتە ناوچە دورەکانی پایتەخت، یەکێ لەو ناوچانە کوردستان بو. میرایەتیە کوردییەکان ئیتر لە کوردسـتان کۆتاییـیان هات بو، دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی لە دەس کاربەدەستانی تـورک دا بـو. تـورک نەیتـوانی بـو ئەو بۆشاییە کارگێڕی، دارایی، سیاسیەی میرایەتیەکان بە جێیان هێشت بو، پڕ بکاتەوە. سەرداری ئەکرەم عومەر پاشا دوای ئەوەی بو بە والیی عێراق سەردانی سلێمانی کرد و سـەرانی هەنـدێ لە خـێڵە گەورەکـانی بینـی، هەندێ لە سەرانی خێڵی هەمەوەندی لە سێدارە دا و، سـەرانی جـاف، بە تـایبەتی مـحەمەد بەگ (دواتـر حەمە پاشا) ی کوڕی کەیخوسرەو بەگـی بینـی، نەیتـوانی لە گەڵیـان پێـک بـێ، لە سـەر نیشـتەجێکردن و لە سـەر سەربازگیری و لە سەر باجگیری. عومەر پاشا زۆر نە مایەوە لێخرا و والیەکی تری لە جێ دانرا.

ئێلی جاف لە روی ژمارەوە گەورەترین ئێلی ناوچەکە بوە، لە روی مەڵبەندی ژیـانەوە روبەرێکـی فراوانـی لە ژێر دەس دا بو. بۆیە والیەکانی عوسمانی لە هەوڵی بەردەوام دا بون بۆ راکێشانی ئەم ئێلە بە لای خۆیان دا.

### پشتماڵە

یەکێ لە کۆڵەکە سەرەکیەکانی دەسەڵاتی بنەماڵەی بەگزادە، پشتماڵە بوە. مـاڵی سـەرۆکەکانی ئێـل، کـە ئەوەی زایەر بەگ بون، لە دەوار دا ژیاون. بـەڵام دەوارەکـەیـان هەمیشـە لـە هـەمو دەوارەکـانی تـری ئێلەکـە رازاوەتر و گەورەتر بوە. بۆ ئەوەی لە ناو هەمو رەشماڵەکان دا دیار بێ و بناسرێتەوە بە "ماڵـە گـەورە" نـاو

براوە. ماڵە گەورە لە نێوی ناوەوە بە چیغ و قاڵی نایاب دابەش کراوە. چەند بەشێکی بۆ ژیانی تایبەتی خێزانی سەرئێل، ژنەکانی و کوڕ و کچەکانی. بەشەکانی تری ماڵەکە شوێنی دانیشتن و کۆبونەوەی ریشچەرمو، دەمڕاست و سەرۆک (رەئیس) ی هۆز و تیرەکان بوە. شوێنی گفتوگۆ و بڕیاردان بوە لە هەمو ئەو پرسانەی پێوەندییان بە ژیانی رۆژانەی ئێلەکە و کێشەکانی و، رێگەی خێڵەوخوار و خێڵەوژور و، پێوەندیەکانی لە گەڵ خێڵەکانی دراوسێ و، کاربەدەستانی حکومەتی ناوچەیی و ناوەندی و، کۆکردنەوەی بەرکەوتی سەرۆکایەتی ئێل لە داهاتی ئەندامانی هۆز و تیرەکانی جاف.

ئەوەی ماڵە گەورەی پاراستوە و دەسەڵاتەکەی بە سەر تەواوی ئێلەکەدا سەپاندوە پشتماڵە بوە. ئەم نەریتە لە سەردەمی زایەر بەگەوە پێرەوی کراوە. سەرۆکی ئێل لە هەر هۆز و تیرەیەکی جاف دە تا بیست خێزانی هەڵبژاردوە کە بە شێوەیەکی هەمیشەیی هاوسەفەری ماڵە گەورە بن. ژمارەیان گەیشتۆتە 500 - 600 ماڵ. ئەوانەی هەڵی بژاردون پیاوەکانیان کەسانی چالاک و جەربەزە بون، لە ناو کۆمەڵەکانی خۆیان دا بە نازایەتی و چاونەترسی ناسراو بون. دابینکردنی ژیانی خێزانەکانی پشتماڵە و دابینکردنی چەک و تفاقی جەنگی و ئەسپی سواری لە ئەستۆی سەرئێل دا بوە. وەکو هێزێکی تایبەتی و ئامادە لە بەر دەستی سەرۆکی ئێل دا بون. ئەرکی پشتماڵە بریتی بوە لە:

- پاراستنی سەرئێل و بنەماڵەکەی و ماڵ و دارایی.
- پاراستنی ئاسایشی ناوخۆی ئێلەکە و، پاراستنی ئاسایشی دەرەکی ئێلی جاف لە دەستدرێژی ئێلەکانی تر.
- جێبەجێکردنی بڕیارەکانی سەرئێل و تەمێکردنی هەرکەس و هەر تیرەیەک کە سەرکێشی کرد بێ.
- کۆکردنەوەی بەرکەوتی سەرۆکایەتی ئێل لە داهاتی ئەندامانی ئێلەکە.

بەشداری لە لەشکرکێشیەکانی ئێلەکە چ لە سەر داوای میرەکانی بابان و چ لە سەر داوای والیەکانی عوسمانی.

قادر بەگی کوڕی زایەر بەگ وەچەی لێ نەکەوتۆتەوە.

سلێمان بەگی کوڕی زایەر بەگ دو کوڕی لێ کەوتۆتەوە:

کەیخوسرەو بەگ و قادر بەگ. سلێمان بەگی باوک، قادر بەگی کوڕی بە ناوی مامەیەوە ناو ناوە.

## ریچ لە هەواری سەرۆکی ئێلی جاف دا

کەیخوسرەو بەگی کوڕی سلێمان بەگی کوڕی زایەر بەگ هاوزەمانی مەحمود پاشای بابان بوە. لە رۆژانی سەردانی ریچ دا بۆ کوردستان (1820 ز) بۆ بەخێر هێنانی ریچ لە سلێمانی بوە و، هەر لەوێ ریچ و هاوسەرەکەی بانگهێشت کردوە لە هەوارگەکانی جاف دا میوانداریان بکا، ریچ لە رۆژی 20 ی ئابی 1820 دا سەردانی کردوە. بەمجۆرە باسی پێشوازیەکەی گێڕاوەتەوە:

"ئەوەندەی دەبرد، توشی چوار لە سەرکردەکانی بەگ بوین، هەمویان قۆز و سوارچاک بون، پەڕی شینەشاهۆیان بە سەروپێچەکانیانەوە کرد بو، فەرشیشیان بە ژێر ئەسپەکانیانەوە دادوری بو، گوڵنکەی زەردیان پێدا شۆڕ بونەوە.

لە نۆ و نیودا گەیشتینە هەوارەکەی کەیخوسرەو بەگ، کە دو میلێک لە خوار زەریاچەکەوە بو. پێش ئەوەش بگەینە هەوارەکەی، بەگ خۆی، بە سواری ئەسپە جوانەکەیەوە بە پیرمانەوە هات بو. بە راستی جوانترین ئەسپێک بو، کە چەند ساڵێکی زۆر دەبو ئەسپی وام نە دی بو. هەر سێ کوڕەکەی و محەمەد بەگی برازای و قادر بەگی سەرۆکی پێشوی جافیشی لە گەڵ بون. کەیخوسرەو بەگ دڵی لەو کاتە خۆشتر بو کە لە

سلێمانی دیبوم. جلوبەرگێکی پۆشتەشی لە بەردا بو. پاڵتۆیەکی ئەستەمولی بە سەردا کرد بو. قۆپچەکانی زێـڕ بون. ئەوەندەی تر شەنگ و شۆخی کرد بـو. کـوڕە گەورەکەیشـی، کە لاوێکـی یەکجـار جـوان و شـۆخ بـو، جلێکی وەک ئەوەی باوکی بە سەر کراسێکی نایاب دا لە بەر کرد بو. ئاورێشـمی ئەوروپـایی ڕێ ڕێ بـو. بە زیو چنرا بو. دەستەیەکی سوارەی جافیش بە سەروسیمای جوانیانەوە لە تەک بەگ دا بون. ئیتر تا گەیشتنە هەوارەکە، لاوەکان جریدبازییان دەکرد و بەهرەی خۆیان دەنواند. *(ریچ. 180)*

وەلی دیـوانە هاوزەمـانی کەیخوسـرەو بەگ بـوە. وەلـی لەو شـیعرەدا کە بـۆ ئەوی نوسـیوە و داوای کۆمەکی لێ کردوە بە دەنگیەوە بچێ شەمی بۆ بخـوازێ، لە خوێنـدنەوەی شـیعرەکەدا دەسـەڵات و دەبـدەبەی دەزگای سەرۆکایەتی کەیخوسرەو بەگ دەردەکەوێ.

**خوسرەو خەیاڵێ**

ئای پەی خانخاسێ، خوسرەو خەیاڵێ

ساحێب سپا و سان، دارا ئیقباڵێ

موهەیا نە گەنج خەزێنە و لاڵێ...

*(دیوانی وەلی دێوانە: 41 42)*

**کەیخوسرەو بەگ** (؟ - 1244 ک)، پێنج کوڕی لە پـاش بـە جـی مـاوە: سـڵێمان بـەگ، قـادر بـەگ، عەبدوڵا بەگ، محەمەد بەگ، عەبدوڕەحمان بەگ.

سڵێمان بەگ جێگەی باوکی گرتۆتەوە.

**عەبدوڵا بەگ** (؟ - 1245 ک) لە شەڕێک دا لە گردەگڕوی، نزیک شـاری سـلێمانی، لـە ڕیـزی هێـزی بابان دا دژی هێزی ئەردەڵان، بە گەنجی کوژراوە.

قادر بەگ چوە بە دەنگ هەندێ لە تیرەکانی جافەوە کـە کەوتبونـە بـەر هێرشـی هێـزی ئێرانـی، لـەو ئاڵۆزیەدا ئەویش بەر گوللەی وێـڵ کەوتـوە کـوژراوە (؟ - 1248 ک). مەولـەوی "مەرسـیە" ی بـۆ نوسـیوە. *(دیوانی مەولەوی: 371. هەروەها 357)*

سڵێمان بەگ کە سەرۆکایەتی ئێلەکەی لە ئەستۆ دا بوە دوای کوژرانی قادر بەگی برای بـە مـاوەیـەکی کورت ئەویش مردوە (؟ - 1248 ک). لەو کاتەدا محەمەد بەگ (دواتر حەمە پاشا) ی برایان تەمـەنی شـانزە ساڵ بوە. هەندێ لە خزمەکانی، لە بەرەبابێکی تری بەگزادەی جاف کە خاڵوانی ئەحمەد پاشـای بابـان بـون، چاویان بڕیوەتە جێگەکـەی. بە یـارمەتی پاشـای بابـان ویسـتویانە سـەرۆکایەتی جـاف لـە دەس بنەماڵـەی کەیخوسرەو بەگ دەر بهێنن خۆیان سەرۆکایەتی ئێلەکە بگرنـە دەسـت. *(کەریـم بەگ: 155)* محەمـەد بـەگ و دەسوپێوەندەکانی کۆچیان کردوە بۆ ناوچەی سنە. بەڵام والیی ئەردەڵان بە دەنگیانەوە نەچوە. بـە ناچـاری گەڕاونەتەوە بۆ نزیک بەغدا. والـیی بەغـداد ناوچـەی قزرابـات (شـاری سـەعدیەی ئێسـتا) ی بـۆ تـەرخان کردون. دوای سێ ساڵ لە گەڵ پاشای بابان ئاشت بونەتەوە و گەڕاونەتەوە ناوچەکەی خۆیان. پێ ناچـێ لەو کاتەوە ئیتر پێوەندی ڕاستەوخۆ لە نێوان سەرانی ئێلی جاف و والیەکانی بەغدادا دروست بوبێ.

مردنی کەیخوسرەو بەگ و دانانی سڵێمان بەگ لە جێگەی بـاوکی. دیسـان مردنـی ئـەو و دانیشـتنی محەمەد بەگی برای لە جێگەی ئەو، هاوزەمان بوە لە گەڵ کێشـە ناوخۆییـە خوێناویـەکانی پاشـاکانی بابـان: مەحمود پاشا، ئەحمەد پاشا، عەبدوڵا پاشا و. ڕاکێشـانی دەسـتی ئێـران و عوسـمانی چەنـد جـارێ بـۆ نـاو قەڵەمڕەوی بابان و. هاوزەمان بوە لە گەڵ دوا سـاڵەکانی تەمـەنی میرایـەتی بابـان. سـەرانی ئێلـی جـاف لەم کەینوبەینەی نێوان میرەکانی بابان خۆیان دور ڕاگرتوە.

# بەشی دووەم:

## شێوەی ژیانی جاف

جاف، وەکو ئێلە ڕەوەندەکانی تری کورد، دوای لەوەڕاندنی ئـاژەڵـەکانیان کـەوتون. کـابرای کۆچـەر هەلومەرجی ژیانی خۆی بە پێی هەلومەرجی پێویستی ژیان و بەخێوکردنی ئاژەڵەکەی ڕێک خستوە. لە بەهار دا کە لە گەرمیانەوە بەڕێ کەوتوە بە دوای لەوەڕەوە بوە بۆ ئـاژەڵەکـەی، لـە هـەواری ئێسـتا کـە گیـا بـەرەو تەواوبون چوە گوێزاوێتیەوە بۆ هەواری ناهاتو. بەمجۆرە لە جوڵان دا بوە. لـە گـەڕانـەوەش دا هـەمان شـتی کردوە. لە هەوارێکەوە گواستویەتیەوە بۆ هەوارێکی تر، نەک لە بەر ئەوەی کەشی ئەوێ بۆ گوزەرانی خۆی و خێزانەکەی خۆشتر و لە بارتر بوە. بەڵکو لە بەر ئەوەی بۆ مێگەلەکەی باشتر بـوە. پیـاوی کۆچـەر لـە بـاتی ئەوەی ئاژەڵەکەی بۆ خزمەتی خۆی بە کار بهێنێ خۆی لە خزمەتی ئاژەڵەکەی دا بوە. ئەم تێگەیشتنە ئێلەکەی توشی چەندین کێشەی گەورە کردوە.

## ماڵی کۆچەر

خێڵ لە شوێنێک دا جێگیر نەبوە، وەکو لادێیی - گوندنشین، لە خانودا نە ژیاوە، نە بەستراوەتەوە بە گوندەوە، نە بەستراوەتەوە بە ڕەز و باخ و کشتوکاڵەوە. دیلی سنوری دێ نە بوە. لـە ڕەشـماڵ دا ژیـاوە، بـە ئاسانی جێگۆڕکێی کردوە. هەرکات ویستویەتی ڕەشماڵەکەی پێچاوەتەوە، ڕان و ڕەوەکەی داوەتە پێش خۆی و ڕۆیشتوە. شارەزای ڕێگەوبان، چیا و چەم، ناوچـەی جیـاواز، تیـرە و تایەفـەی جیـاواز بـوە. کۆچـەر، بـە پێچەوانەی گوندنشینەوە، هەلی زۆرتری هەبوە بۆ جیابونەوە و یاخیبون.

ڕەشماڵ، لە باتی چادری ئێستا بە کار هێنراوە. پێـک هـاتوە لـە چەنـد تەختـەیـەکی چنـراو لـە مـوی ڕێسراوی بزنی ڕەش. پانیی هەر تەختەیەکی نزیکەی نیو مەتر و درێژیی چەند مەترێ بوە. چەند تەختەیەک بە بەن و سوژن بە یەکەوە دورواوە و، دیرەگێ لە ناوەڕاستی دا لە سەر چەند ئەستونێ بـە بـەرزی دو مـەتر هەڵ دراوە، چوار دەوری بۆش بوە بە چیغ دیواری دەرەوەی گیراوە و دیوی ناوەوەی دابەش کراوە. لـە هـەر چوار لایەوە بە پەت و سنگ بە ئەرز دا داکوتراوە.

ڕەشماڵی سەرۆکی خێڵ گەورەتر بوە لە هی خێڵەکی ئاسایی. گەورەیی و پچوکی ڕەشماڵ بـە ژمـارەی ئەستونەکانی دیاریکراوە. بچوکترینیان سێ ئەستون و گەورەکەیان دوانزە ئەستون یا زیاتر بوە.

رەشماڵ، لە ناو رەوەندەکان دا ناوی جۆراوجۆری هەبوە وەکو: سیاماڵ، سیایانە، دەوار، کوین، تاوڵ.

وەلی دێوانە لە یەکێ لە شیعرەکانی دا رو بە خۆشەویستەکەی ئەڵێ: "هەی عەنبەرین خاڵ، سۆسەنی کلاف/ هەی خانی خاسان سیاماڵی جاف".

هەر ئەو، شەمی خۆشەویستی بەمجۆرە بانگ کردوە: "شای سیایانان.../ شۆخی شیرین شەوق، شای سیایانان/ شەمی شفابەخش، شادی پەروانان/ دەلیلەی قەتار دیدە قەترانان".

مەولەوی لە سەر سیاماڵ وتویەتی: "گۆشەی سیاماڵ هۆرداو دیاوە/ چون مانگ نە گۆشەی هەور سیاوە".

بەڵام شێخ رەزا، کە شارنشین بوە، لە سەر دەوار وتویەتی: "کاری کە فیراق و خەمی دوریت بە منی کرد/ سەرما بە هەتیو یا بە دەواری شڕی ناکا".

## ئاژەڵداری

ئاژەڵ بریتی بوە لە مەڕ و بزن. ئاژەڵ بە پێی تەمەن و جۆر و شێوە و رەنگ ناوی جیاوازی هەبوە و، لە وەرزی تێکبەردان و زاین و بڕینەوەی خوری دا بۆنەی تایبەتی هەبوە.

وڵاخ بریتی بوە لە گا و مانگا و کەر و ئێستر. ئەویش بە پێی تەمەن و جۆر و شێوە و رەنگ ناوی جیاوازی هەبوە.

- ئەسپ و ماین، ئەویش بە پێی تەمەن و جۆر و شێوە و رەنگ ناوی جیاوازی هەبوە.
- زەمانی ئاژەڵداری لە ناو جاف دا زەمانێکی دەوڵەمەند بوە.
- جاف جگە لە ئاژەڵ چەندین گیانداری تری راگرتوە:
- گا، بۆ گواستنەوەی بار لە هەوارێکەوە بۆ هەوارێکی تر.
- ئەسپ، بۆ سواری و رمبازێن و هاتوچۆ.
- پەلەوەر، بۆ هێلکە و خواردن.
- سەگ، بۆ پاراستنی ران لە گورگ و، بۆ پاسی ماڵ لە دز.
- تانجی، بۆ راوی مەل، بە تایبەتی پۆڕ، و کەروێشک و ئاسک.
- تولە، بۆ راوی بەراز.

سەگ، ئەگەرچی بە گڵاو دانراوە، بە رۆژ شوان لە گەڵ رانەکەی بردویەتی بۆ لەوەرگا و شەو لە گەڵ رانەکە هاتۆتەوە بۆ نزیکی رەشماڵی خاوەنەکەی. دوژمنی گەورەی ئاژەڵ گورگ بوە. گورگ ئەگەر کەوت بێتە ناو رانەوە، بە خواردن یا بە کوشتنی تەنیا مەڕێ دانەکەوتوە، بەڵکو چەندی فریا کەوت بێ ملی مەڕەکانی شکاندوە و کوشتونی. سەگ بۆیە راگیراوە رانەکەی لە گورگ پاراستوە و، ئەگەر توانی بێتی گورگەکەی راو ناوە یا پەلاماری داوە بیخنکێنێ. زۆر جار یەکێکیان ئەوی تری کوشتوە یا هەردوکیان بە سەختی بریندار بون. لە گەڵ ئەوەی سەگ ئەم کارە گرنگەی پێ ئەنجام دراوە هەر بە گڵاو دانراوە. هەرچەند دەمی بەر دەفرێ یا شتێ کەوت بێ، بە گڵاویان لە قەڵەم داوە، بۆ ئەوەی گڵاویی دەر بکەن بە قوڕی سور "بیسمیل" یان کردوە. سەگی نێر پێی وتراوە گوڵ و ئەگەر بە تەمەن بوبێ گەماڵ و سەگی مێ دێڵ و بەچکەکانی توتەڵە. هەمو رۆژ کە نانیان بۆ خواردنی خۆیان برژاندوە، بۆ خۆراکی سەگ "گێتکە" یان برژاندوە.

ئەم گیاندارانە بە جۆرێ تێکەڵاوی ژیانی خەڵک بون لە سەدان پەندی پێشینان و لە دەیان چیرۆکی فۆلکلۆری دا بونەتە بابەتی سەرەکی و، بونەتە بەشێ لە فەرهەنگی زمان. بۆ نمونە: بۆ جیاکردنەوەی دەنگی گیاندارێ لە گیاندارێکی تر بۆ هەر دەنگە ناوێکی تایبەتی لێ نراوە. وتویانە: مەڕ ئەباڕێنێ، بزن ئەقاڕێنێ، گا ئەبۆڕێنێ، ئەسپ ئەحیلێنێ، کەر ئەزەڕێ، سەگ ئەوەڕێ، گورگ ئەلورێنێ، رێوی ئەواقێنێ، پشیلە ئەمیاوێنێ، کەڵەشێر ئەقوقێنێ، مر ئەگارێنێ، چۆلەکە ئەجریوێنێ، هەڵۆ ئەچریکێنێ...

## کەلوپەلی ناوماڵ

کۆچەر بۆ ئەوەی بە ئاسانی ماڵ و کەلوپەلەکانی بار بکا و بگوێزێتەوە بێ ئەوەی بشکێ، زۆری دەفر و کەلوپەلەکانی لە پێست، خوری، مو، دار و تەختە دروست کردوە:

- لە پێستی ئاژەڵ: مەشکە، بۆ ژەندنی ماست.
- لە پێستی مەڕ: هیزە، بۆ هەڵگرتنی رۆن و دۆشاو، هەمانە، بۆ هەڵگرتنی شتومەکی وشک.

لە پێستی بزن: کوندە، بۆ گواستنەوەی ئاوی خواردنەوە، پێشینان وتویانە: "کەر لە کوێ کەوتوە، کوندە لە کوێ رژاوە؟". جەوەندە، بۆ گواستنەوەی ئاوی خواردنەوە لە کوندە پچوکتر بوە.

- لە موی بزن: رەشماڵ و گوریس.

لە خوری: لباد (تەحتێ) بۆ دانیشتن و نوستن لە سەر ئەرز راخراوە. کەپەنک، شوان کە بە شەو لە کەژ ماوەتەوە بۆ خۆ پاراستنی لە باران و سەرما لە بەری کردوە، پێشینان وتویانە: "لە پاش باران کەپەنک".

- لە بەنی رێسراوی خوری و مو: بەن، تێر، هۆر، جەواڵ چنراوە. ئەمانە هەم بۆ پاراستن و هەڵگرتنی شتومەک لە ناو رەشماڵەکەدا هەم بۆ گواستنەوەی لە هەوارێکەوە بۆ هەوارێکی تر لە پێویستیەکانی خێزانەکە بون:

گوریس، بۆ پێچانەوەی کەلوپەل و بارکردن. پێشینان وتویانە: "کەر و جەواڵ و گوریسم داوە، بۆ سوژنێک و تاڵێ بەن کارەکە تێک نادەم". هەروەها وتویانە: "گوریس بە یەک لۆنە نە ئەهاتەوە، ئینجا دۆرەی دو لۆنەیە".

جەواڵ، دەفرێکی یەکتایی بوە لە بەنی رەنگاورەنگی خوری و مو دروست کراوە دانەویڵەی تێ کراوە. پێشینان وتویانە: "ئەوی لە مشک بێ جەواڵ ئەدڕێ". هەروەها وتویانە: "تا نەچێتە جەواڵ نابێ بە ماڵ".

هۆر، دەفرێکی دوتایی بوە لە بەنی رەنگاورەنگی خوری دروست کراوە بۆ باربردن، دەرگاکەی لە سەر باری پانی بوە.

تێر، دەفرێکی دوتایی بوە لە بەنی رەنگاورەنگی خوری دروست کراوە بۆ باربردن. جیاوازی لە گەڵ هۆر، دەرگاکەی ئەم لە سەر باری درێژی بوە.

جاف بۆ گواستنەوەی رەشماڵ و کەلوپەلەکانی بە زۆری گای بە کار هێناوە. لە کاتی رۆیشتن دا بۆ پاراستنی منداڵی بچوک، کاری کۆریە و بەرخی ساوا، خراونەتە ناو تای تێرەوە.

خورج، جۆرێک بوە لە تێر.

## خۆراک

خواردنی جاف بە زۆری نان و بەرهەمی شیری ئاژەڵ بوە.

نان رۆژانە کراوە. نانکردن ئیشی ژنی ماڵ بوە. ئارد بە بێژنگ بێژراوەتەوە. کەپەکی لێ جیاکراوەتەوە. کەپەک بۆ خواردن دانراوە بۆ ئەسپ و گا و مانگا. ئاردەکەی لە تەشت دا لە گەڵ ئاو شێلراوە، بۆ ئەوەی هەڵ بێ، ئەگەر ئاردەکەی بێ پێز بو بێ، هەویرترشی تێ کراوە. دوای شێلانی ماوەیەک هێڵراوەتەوە ئەوسا پڕ بە مشت گونکی لێ براوە. بە دەست و تیرۆک لە سەر پنە (دەرخۆنە) بە تەنکیی پان کراوەتەوە. بۆ برژاندن دراوە بە سەر ساجی داخ دا. نان لە سەر ساج برژێنراوە.

لە شیری ئاژەڵ چەند جۆر خۆراک بەرهەم هێنراوە:

**پەز (مێ)**، لە دوای زانی، رۆژی سێ جار دۆشراوە. بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە. شیرەکەی لە مەنجەڵ (قازان) دا کۆ کراوەتەوە. کراوە بە ماست.

**ماست**. شیر بە شەو تا پلەیەکی دیاریکراو کوڵێنراوە. هەوێنی تێ کراوە. سەری داپۆشراوە. بۆ بەیانی مەیوە بوە بە ماست. ماست، دوای ئەوەی ئاوی تێ کراوە رۆژانە بە مەشکە ژەندویانە، کەرە و دۆی لێ جیا کراوەتەوە.

**دۆ**. چەوری تێدا نەماوە. بە نانەوە خوراوەتەوە. بۆ ئەوەی تامی خۆش بێ فەریکە قەزوانی تێ کراوە.

**دۆکوڵیو**. دۆ یا ماست تێکەڵاو کراوە لە گەڵ برنج یا ساوەری کوڵاو. پێکەوە لە سەر ئاگر کوڵێنراون. بۆ خۆشکردنی تامەکەی هەندێ جار گۆشت یا گیای کێوی تێ کراوە.

**کەرە**. بەشێکی بە روتی یان لە گەڵ هەنگوین، دۆشاوی تری، گەزۆ، خورما خوراوە. بەشەکەی تری لە سەر ئاگر قاڵ کراوە بۆتە رۆنەزەنگ و لە هیزەدا هەڵگیراوە.

**رۆن**. هەندێکی بۆ لێنانی چێشت و هەندێکی بۆ فرۆشتن دانراوە.

**شیریژ**. دۆی خەست کراوە.

**کەشک**. دۆ لە سەر ئاگر کوڵێنراوە تا خەست بۆتەوە ئەوسا کراوە بە سەلک لە بەر هەتاو هەڵخراوە تا وشک بۆتەوە.

**دۆینە**. دۆ و برویش تێکەڵاو کراوە. لە سەر ئاگر کوڵێنراوە تا خەست بۆتەوە. کراوە بە سەلک لە بەر هەتاو هەڵخراوە تا وشک بۆتەوە.

**پەنیر**. لە شیری کوڵاو و هەوێن، کە بە زۆری ریخۆڵەی ئاژەڵ بوە، دروست کراوە. بە تازەیی کراوە بە سەلک و خوراوە. بەشێکی لە پایزدا کراوەتە پێستەوە هەڵگیراوە بۆ زستان.

**فرۆ**. شیری مەڕ، بزن، مانگا، لە سێ رۆژی هەوەڵی دوای زاین دا کەمێ گەرم کراوە و خوراوە.

## زەماوەند

ئافرەتی جاف بە هۆی سروشتی ژیانی خێڵایەتی و بەشداری لە کاروباری رۆژانەدا تا ئەندازەیەکی زۆر سەربەستی تێکەڵاوبونی هەبوە لە گەڵ پیاوانی هۆزەکەی. ژن روپۆشی نە پۆشیوە. کچ و کوڕ یەکترییان ناسیوە. لە هاوسەرگیری دا ئامۆزا بۆ ژنهێنان و شوکردن لە پێش بوە. ژن بە ژن لە ناو هۆزەکانی ئێلی جاف دا شتێکی ئاسایی بوە. هەندێ جار هاوسەرگیری، بە تایبەتی ژن بە ژن، لە نیوان دو تیرە یان دو هۆز دا ئەنجام دراوە، بە مەبەستی دروستکردنی خزمایەتی و هاوپەیمانی. ژنهەڵگرتن و رەدوکەوتنی پیاو روداوێکی دەگمەن بوە. ئەگەر روی دابێ مایەی سەرشۆڕی و ریسوایی هەردو خێزان بوە. ئەگەر دەستیان پێیان گەیشتبێ بە کوشتن شۆردویانەتەوە. بنەماڵەی بەگزادە کچیان نە داوە بە غەیری بەگزادە بەڵام ژنیان لە غەیری بەگزادە هێناوە.

خێزان ژنی بۆ کوڕەکەی هەڵبژاردوە. سەرەتا ژنان چون بۆ خوازبێنی. ئەگەر کەسوکاری کچ رازی بو بن ئینجا پیاوان چون بۆ خوازبێنی. ئەگەر رازی بو بن شەکراویان خواردۆتەوە و شیرینیان دابەش کردوە بە سەر دۆست و ناسیاوەکانیان دا. دوای مارەکردنی، زەماوەندی گویزانەوەیان گێڕاوە. هەردو ماڵ، ماڵی هەردو زاوا، خزم و دۆست و ناسیاوەکانیان بانگ کردوە بۆ بەشداری لە ئاهەنگی گوێزانەوە دا. دەهۆڵ و زورنا لێ دراوە. هەڵپەڕکێ کراوە. کچ و کوڕ، ژن و پیاو، بە جیا و بە رەشبەڵەک بەشداری هەڵپەڕکێ بون. هۆرە گۆرانی تایبەتی ئێلی جاف بوە. دەمەو ئێوارە سوارەکانی هەردولا خۆیان ئامادە کردوە. بوک سوار کراوە و تارای بە سەردا دراوە. تیپی سوارە بوکیان بە سواری لە گەڵ خۆیان بردوە. لە نیوەی رێگا هەردو

تیپ بە یەک گەیشتون. دوای ماوەیەک خۆنواندن بە ڕمبازێن و نەڕە و هەرا بوکەکانیان گۆڕیوەتەوە. هەر لایەک بوکی خۆی بردوە زاوا لە چاوەڕوانییان دا بوە. بوک ژنێکی لە گەڵ بوە فێری کردوە شەوی یەکەم چۆن ڕەفتار لە گەڵ مێردەکەی بکا. پیاوەکە برازاوای لە گەڵ بوە فێری کردوە شەوی یەکەم چۆن ڕەفتار لە گەڵ بوک بکا.

شەو بوک و زاوا چونەتە پەردەوە. لە دەرەوە بەربوک و برازاوا و هەندێ لە خزم و دۆستەکان چاوەڕێ بون. هەر کات زاوا ئیشەکەی تەواو کرد بێ هاتۆتە دەرەوە بە تفەنگ یا بە دەمانچە گوللەیەکی تەقاندوە. ئەوە نیشانەی سەرکەوتنی زاوا و ڕوسوری کچەکە بوە. بەربوک پەڕۆی خوێناوی وەکو بەڵگەی کچێتی بوک بردۆتەوە بۆ ماڵی باوک. زەماوەن کۆتایی هاتوە. یان ئەگەر ماڵی زاوا زەنگین بو بێ شایی چەند ڕۆژێ درێژەی کێشاوە.

مەولەوی تێکەڵاو بوە لە گەڵ بەگزادە و گەورەپیاوەکانی جاف دا. چەند قەسیدەیەکی بە بۆنەی زەماوەندی جیا جیاوە هۆنیوەتەوە. ڕەنگە خوێندەواری ئەم سەردەمە لە ڕێگەی ئەو شیعرانەوە هەندێ دیمەنی شایی و هەڵپەڕکێ و گۆرانی ئەو سەردەمە و خشڵ و خۆڕازاندنەوەی ژنانی بێتە بەرچاو، لەوانە:

یەکێ لە شیعرەکانی بە بۆنەی ژنهێنانی مەحمود پاشاوە داناوە، سەرەتاکەی بەمە دەس پێ ئەکا:
موبارەکت بۆ بەزم ئەو وە خەیر/ توخوا تەنخوای من خاس خاس بکەر سەیر. *(دیوانی مەولەوی: 391)*

شیعریکی تری لە وەسفی شاییەکی تردا هۆنیوەتەوە سەرەتاکەی بەمە دەس پێ ئەکا: نامەی ئەفتینت یەک ڕۆ باد ئاوەرد/ کلێەی بلێسەی کورەم زیاد کەرد. *(دیوانی مەولەوی: 411)*

## منداڵبون

منداڵ دیارییەکی بەنرخی خوایی بوە، هەرچەند زۆر بو بێ بۆ باوک هێزێکی گەورە بوە بۆ شەڕ و کار و پایەی کۆمەڵایەتی و دەسەڵات لە ناو خێزانەکانی تردا. بەڵام منداڵ زۆری مردون. هەندێ جار ژن کوڕی نەبوە، پیاوەکە بۆ ئەوەی کوڕی بێ ژنی تری هێناوە.

لە ناو جاف دا نە پزیشک و نە خزمەتی تەندروستی نە بون. منداڵ لە ژێر سەرپەرشتی مامان دا لە دایک بوە. مامان ژنێکی نەخوێندەوار، بێ ئاگا لە کاروباری تەندروستی و پاک و خاوێنی، بەڵام خاوەن ئەزمون بوە. مامان ناوکی منداڵەکەی بڕیوە و، ئاگاداریی زەیستانەکەی کردوە.

زۆری منداڵی نەوزاد لە تەمەنێکی کەم دا مردون. یان زەیستانەکە بە سەر منداڵەکەوە مردوە. خێزانەکە هۆی مردنەکەیان بە زۆری گێڕاوەتەوە بۆ هەندێ باوەڕی ناڕاست. بۆ مردنی منداڵەکەیان پێیان وا بوە شەوە گرتویەتی و بۆ مردنی زەیستانەکە پێیان وابوە هاڵ کوشتویەتی. بۆ پارێزگاری لە زەیستاکە و منداڵەکەی شەوارەیان بۆ گرتوە.

باوەڕیان وابوە، هاڵ، ژنێکی درێژە دڵی زەیستاکە دەرئەهێنێ ئەی با بۆ سەر کانی و ئاو، ئەی شواتەوە و ئەی خوات. ئەگەر پیاوەکان ئاگایان لێی بێ هاڵ ناتوانێ دزە بکا بۆ ناو ماڵەکە و ئەو کارە بکا، یا تەنانەت ئەگەر دزەشی کرد ئەگەر پیاوەکان فریا بکەون بچنە سەر کانیەکە و بە خەنجەر ئاوەکە بشەڵەقێنن، زەیستانەکە لە مردن ڕزگاری ئەبێ.

بۆ منداڵیش باوەڕیان وا بوە، شەوە، ژنێکی ڕەش و ڕەشپۆشی ئەزۆکە، منداڵی نابێ، بەڵام منداڵی زۆر خۆش ئەوێ. هەر کە منداڵێکی تازە لە دایک بێ خۆی ئەگەیەنێتێ. منداڵەکە ئەکاتە باوەشی لە خۆشەویستی دا ئەوەندە هەڵی ئەگوشێ تا شین ئەبێتەوە و ئەخنکێ.

بۆ ئەوەی ئەو کارەساتانە ڕو نەدەن، هەر کە منداڵ لە دایک بوە، قورئانێ ئەگەر هەبو بێ، یا پارچەیەک نانیان لە ژێر سەری منداڵەکە دا داناوە. باوەڕیان وا بوە ئەوە شەوە ئەترسێنێ ئیتر ناوێرێ لێی نزیک

بکەوێتەوە. هەر بۆ پارێزگاری لە منداڵەکە و زەیستانەکە تا حەفتەیەک شەوانە ماڵەکەیان بە قەڵەبالغی، ژن و پیاو، خزم و دۆستی خێزانەکە لە ماڵەکە دا ماونەتەوە بۆ ئەوەی نە هاڵ و نە شەوە نەوێرن توخنی ماڵەکە بکەون. لە گەڵ ئەمانەش دا زەیستان هەر مردوە و منداڵ مردوە، چونکە هۆی تەندروستی هەبوە بۆ مردنیان نەک هاڵ و شەوە.

## ناونانی منداڵ

پاش حەفتەیەک باوکی نەوزادەکە، ئەگەر لەو نزیکانە هەبو بێ، مەلایەک و چەند کەسێکی لە دۆست و ناسیاو بانگ کردوە بۆ نانی ناونانی منداڵەکەی. دوای نانخواردنی نانی ئێوارە مەلاکە بە ئامادە بونی میوانەکان بانگی "ئیسلامیی" بە گوێی منداڵەکەدا داوە. ناوی ناوە و ئیتر منداڵەکە بەو ناوەوە ناسراوە. لە نزیکترین هەل دا "دەلاک" خەتەنەی کردوە.

ئەوەی جێگەی تێبینیە لە ناو جاف دا ناوی "حەمە" کە کورتکراوەی ناوی محەمەدی پێغەمەری ئیسلامە و. "وەیس" کە ناوی پیاوچاکێکی ئەفسانەییە، بۆ فەڕ و پیرۆزی، لە گەڵ زۆر ناودا لێک دراوە، بۆتە ناوێکی دوانە. حەمە خراوەتە پێش ناوەکە، وەکو: حەمە کەریم، حەمە رەحیم، حەمە عەزیز، حەمە سەعید، حەمە رەشید.. وەیس خراوەتە دوای ناوەکە، وەکو: حەمە وەیس، با وەیس، شا وەیس، عەلی وەیس، مراد وەیس، میر وەیس، پیر وەیس، ئاغا وەیس... تەنانەت هەندێ لەم ناوانە بۆتە ناوی بەرەباب و تیرەکانیان.

سەرەرای ناوی راستەقینەی خۆیان و نازناوی هۆز یا تیرەکەیان، چەند جۆرێ ناو و ناتۆرە خراوەتە پاڵ هەندێ لەم ناوانە:

- جۆرێکیان لە بەر نازداری و خۆشەویستی کەسەکە بوە.
- جۆرێکی تریان لە بەر لاساری و بەدرەفتاری، بە قسەی خۆیان لە بەر بێفەڕی، ناتۆرەیان داوەتە پاڵی.
- جۆرێکی تریان لە بەر کەمئەندامی، شەلی، گۆجی، کوێری، لاڵی، کەچەڵی، خێلی، ناتۆرەی پێوە نوسێنراوە.
- هەندێکی تر کە باوکی مردوە بە ناوی دایکیەوە ناوبانگی دەرکردوە.
- هەندێکی تریش کە چونەتە سەر تەریقەتی قادری یا نەقشی بە پێی پلەی پێوەندییان لە گەڵ شێخەکەیان دا پێشناوی: خەلیفە، سۆفی، دەروێش، دێوانە، خراوتە پێش ناوەکانیانەوە. ئەمەش پاراستونی لە ناتۆرەی خراپ.

## ترس و ترساندن

یەکێ لە بابەتە سەرەکیەکانی پەروەردەی منداڵ لە ناو خێزانی کورد دا لە لایەن دایک و باوکەوە ترس و ترساندن بوە. منداڵ فێر کراوە لە خوا، لە قەبر و قیامەت بترسێ. لە پاڵ ئەوەدا راهێنراوە لە جنۆکە و شەیتان، لە دێو و درنج، لە خێو و تاپۆ، بترسێ. راهێنراوە لە شەوی تاریک، لە شوێنی چۆڵ، لە قسن و گۆرستان بترسێ، راهێنراوە لە گورگ و چەقەڵ، لە مار و دوپشک، لە سەگ و پشیلە، لە مارمێلکە و مشک، بترسێ. راهێنراوە لە لافاو و رەهێڵە، لە هەورەتریشقە بترسێ. راهێنراوە لە کارمەند و فەرمانبەری حکومەت، لە پۆلیس و سەرباز، لە شێخ و سەید، لە بەگ و ئاغا، لە کوێخا و گزیر بترسێ.

بە گشتی کورد سڵی لە گۆڕستان کردوە، بە تایبەتی لە شەو دا. سامی هەبوە نەیان وێـراوە هـاتوچۆی پێدا بکەن. هەر لە بەر ئەوە درەختی گۆڕستانی نە بڕیوە و داری ئەوێی بۆ سـوتاندن بـە کـار نـە هێنـاوە. گۆڕی پیاوچاک لای جافی کۆچەر جۆرێ لە پیرۆزی هەبوە. هەمو جار کە گەرمیان و کوێستانیان کردوە یـان مەترسی شەڕ و تالانی کەوت بێتە سەر هۆزەکە، کەلوپەلی زیادە کە بە ئاسانی بۆیان نە گوێزرا بێتەوە، یان لە رۆیشتن دا پێویستیان پێی نە بوبێ، لە گۆڕستانێ لە تەنیشت گۆڕی پیاوچاکەوە دایان ناوە. بـە زۆری ئـەو کەلوپەلە پارێزراو بوە، کەم وابوە دەستی تێوە درا بێ.

**پرسە**

یەکێ لە نەریتەکانی جاف پرسەی مردو بوە.

ئێلی جاف بە درێژایی رێگەی خێڵەوژور و خێڵەوخوار، لـە هەنـدێ جێگـە گۆڕسـتانی تایبـەتی خـۆی هەبوە، کە یەکێکیان مردوە لە نزیکترینیان ناشتویانە. یەکێ لە گۆڕستانەکانیان لە گەرمیان لە گونـدی سـەیـد خەلیل و یەکێکی تریان لە شارەزور لە سەید سادق بوە. ئاییینی پرسەی بەگزادەی جاف و سەردار و سەرۆکی هۆزەکان جیاواز بوە لە هی جافی سادە. جافی سادە بە شێوەیەکی ئاسایی، بە پێی ئاییینی ئیسلامی، بە خاک سپێردراوە و پرسەیەکی ئاسایی بۆ دانراوە. بەڵام:

قوریان بۆ سەرۆک و سەردارەکانیان پێواوە، لە بەردەم شـوێنی دانـانی پرسـەکە دا پێخوێـیەک قـوڕ گیراوەتەوە، هەرکەس چو بێ بۆ بەشداری لە پرسەکەدا نەختێ قوڕیان داوە لە شانی. چەنـد رۆژێ ئـەم قـوڕە بە جلەکانیەوە ماوەتەوە، وەکو نیشانەی خەمگینیی پرسەداری.

کۆتەڵیان بۆ سەرۆک و سەردارەکانیان گێڕاوە، ئەسپی مردوەکەیان هێناوە جلوبـەرگ و چـەکوچۆڵ و کەرەستەی شەڕ و ڕاوی کابرای مردویان کردۆتە بەری قەوارەیەکی دارین و بە سواری ئەسپەکەیـەوە بـە نـاو خێڵەکە دا بە دەم لاوانەوە و گریان و لە خۆدانەوە گێڕاویانە. بە درێژایی رۆژانی پرسە ئەم نەریتـە بـەردەوام بوە.

مەولەوی لە یەکێ مەرسیەکانی دا کە بە بۆنەی کوژرانی کـوڕی یەکـێ لە پیـاوە ناسـراوەکانی جـافەوە دایناوە، ئاماژە بۆ کۆتەڵەکەی ئەکا. ئەڵێ: "پەنهانەن سیمای سیمین وارەکەت/ شێوەی کۆتەڵەن یادگارەکەت."

پێ ئەچێ ئەم نەریتە لە ناو هەندێ شـوێنی تـری کـوردەواری دا بـاو بـو بـێ. سـالم لە لاوانـدنەوەی ئاغایەکی شێوەکاڵ دا، هەم باسی قوڕپێوان ئەکا، هەم باسی کـۆتەڵەکەی ئەکـا. ئەڵـێ: "بـو بە زێبـی کۆتەڵـت ساتیرەکەی پادشای ڕۆم/ بۆ نەبەم لەم حەسرەتە ئەنگوشتی حیرەت بۆ دەهان." *(دیوانی سالم: 90 - 91)*

قوڕپێوان و کۆتەڵ دو نەریتن لە گەڵ لێکـدانەوەی ئیسـلام بـۆ ژیـان و مـردن نـاگونجێن، ئەشـێ ئەم دو نەریتە هی پێش ئیسلام بێ لە ناو هەندێ لە خێڵاتی کورد دا بە زیندویی مابێتەوە و پارێزگارییان لێ کرد بێ.

## کۆچەری و ڕاووڕوت

کـابرایەکی رەمەکـی جـاف، وەک هەر کـۆچەرێکی تـری کـورد، دینـداریی لە دزی و جەردەیـی جیـا کردۆتەوە. توانیویتی هەم دیندار بێ، بە مەعنای بەجێهێنانی فەریزەکانی نوێژ و رۆژو و حەج، لە هەمان کـات دا دزی و جەردەیی و ڕاووڕوتیش بکا. کۆچەر دزیی ماڵانی بە زیرەکی و جەردەیی ڕێگاوبانی بـە ئازایـەتی و ڕوتکردنەوەی کاروانی بە دەسکەوت زانیوە. لە ناو هەندێ تیرەدا هەرکەس نەیتوانی بێ دزی و جـەردەیـی بکا، کچیان نەداوەتێ، چونکە بە کابرایەکی دەستوپێ سپی و بێدەسەڵاتیان داناوە کە لە لێقـەومان دا نـاتوانێ خێزانەکەی بژێنێ.

کۆچەر بە هەر لایەک دا تێپەڕی بێ ئەگەر هەلێکی بۆ هەڵکەوت بێ، ڕێبوارێ ڕوت بکاتەوە، یا دزی لە ماڵی گوندیەک بکا، کەرێ، ئەسپێ، مەڕێ لە تیرەیەکی تر، یا لە گوندێکی سەرڕێ، لە گەڵ خۆی ببا، هەڵی لە دەست نەداوە. هەندێ جار پیرەکان بە شانازیەوە، نەک بە شەرمەوە، چیرۆکی دزیی زیرەکانەی خۆیان یا جەرەبیی ئازایانەی خۆیان لە دانیشتنەکانیان دا بۆ کوڕ و نەوەکانیان گێڕاوەتەوە، هانیان داون ئەوانیش چاویان لێ بکەن.

دەماودەم زۆر لەو چیرۆکانە ئەگێڕنەوە. یەکێ لەو کەسایەتی‌یانەی، لە ڕێگەی گێڕانەوەکانی پیرەمێرد و عەلائەدین سجادیەوە، ناوی چۆتە ناو ئەدەبی کوردیەوە، قسەکانی و کارەکانی بە نمونە بۆ خۆشی نوسراوەتەوە، کابرایەکی ڕۆغزایی بوە بە ناوی لالە سەرحەدەوە.

ئەگێڕنەوە: "لالە سەرحەدی ڕۆغزایی تۆبەی کرد بو وازی لە دزی و ڕێگری هێنا بو. ڕۆژێک لە سەر گردی بێکەسە هەڵیان دا بو. کوڕەکانیشی دەوریان لێ دا بو. ڕانێکی شاربازێڕی بە وێ دا تێپەڕی، ئەویش بەرماڵی ڕاخست بو لە سەر بەرماڵ نوێژ و تەزبیحاتی ئەکرد. سەیری کرد کوڕەکانی هیچیان لە شوێنی خۆیان نابزون، بە دەم تەزبیحاتەوە وتی: "لا ئیلاهی هی لەڕ دا، سپی بینن هی ڕەش دا، بۆ بەرماڵی باوکتانە!" تەماشای کرد کوڕگەل هەر ناجوڵێن. ئینجا چاری ئەما وتی: "ئەرێ بێ فەڕینە، کوڕگەل گایینە، من دەستی شێخگەلم گلاو کردگە ئێوە چی؟ ئەوە ڕانی شاربازێڕی لە کەلەکە چو بەو دیوا، خۆ ئەم دیواخانە وە تڕ ڕاناگیرێ!" *(عەلائەدین سجادی، ڕشتەی مرواری، چاپی دەزگای سەردەم: 1/86)*

هەروەها ئەگێڕنەوە: "ساڵێک لالە سەرحەدی ڕۆغزایی ماڵیان لە پێواز ئەبێ تەماشا ئەکا لە دورەوە کاروانێک ڕەت ئەبێ و کوڕگەلیش هەرکەس لە ماڵی خۆی دانیشتوە و هیچی ناچێ بۆ ڕاووروت، بانگ ئەکا: "ئای هەتیوەل خۆ من تەوەم کردگە ئێوە بۆ دانیشتگن؟ تەماشا کەن ئەو کاروانە بە خوا ڕەنگوێ کوتاڵ و وشکە و شتی خاسیان پێ وێ!" کوڕگەل لە گەڵ ئەمەیان بیست بە جاری تاویان دایە سەر کاروان. لالە سەرحەدیش تەسبیحەکەی بە دەستەوە بو هەر زیکری ئەکرد و چاویشی لە کاروانەکە بو.

کوڕگەل گەیشتنە کاروان هەندێ قسەیان کرد ئیتر بە بێ ئەوەی هیچ بێنن ڕاست گەڕانەوە. لالە سەرحەد هات بە پیریانەوە پرسی ئەوە چی بو، بۆچی هەروا گەڕانەوە؟ وتیان: "بە خوا لالە چوین ڕوتیان بکەینەوە کەچی سوێندیان خوارد وتیان خەڵکی قەرەچێوارین و پیاوی شێخین. ئێمەش لە ترسی ئەوە نەوەک شێخ حەسەن توشی موجیزەیەکمان بکات ئیتر وازمان لێ هێنان". لالە وتی: "بڕۆن بڕۆن هەی عەمرتان نەمێنێ، هەتیوێ ئەوەندە بێ فەڕ وێ بپرسێ ئەرێ زوارەکە لە کوێوە دێن، بۆ کوێ ئەچن و پیاوی کێن؟ هەڵوەت ئەوانیش یەژن پیاوی شێخین. ڕۆحم وە فیای وێ، جارێکی کە وەمجۆرە وە حیزی بچن و بێنەوە سەری ئەو شێخی قەرەچێوارە لێتان قویل ناکەم، هەرچی خراپە پێتان یەژم!" *(ڕشتەی مرواری: 1/100)*

هەر لە زمانی لالە سەرحەدەوە ئەگێڕنەوە: "یەکێ لە کوڕەکانی چەرچیەک ڕوت ئەکاتەوە. چەرچیەکە ئەچێ بۆ لای لالە سەرحەد بۆ شکات لە دەس کوڕەکەی، داوای لێ ئەکا کەلوپەلە زەوتکراوەکەی بۆ بسێنێتەوە. لەو کاتەدا لالە سەرحەد زۆر پیر و کەنەفت و چاوی کز بوە. لە ژورێکی نزمی تاریک دا، قەندەیەکی درێژی بە دەستەوە ئەبێ. چەرچی سکالاکەی خۆی لە لای ئەو کردوە. لالە سەرحەد بانگی کردۆتە پێشەوە بە دەستی چەپ ملی کابرای گرتوە بە دەستی ڕاست قەندەیەکی سرەواندۆتە ملی، وتویەتی: "کەرانباوگاو شوکری خوا بکە، بەس نیە نەکوژراوی!"

کورد بە گشتی لەم بابەتەوە خۆشناو نیە. هەر گەڕیدەیەک و ڕێبوارێکی بێگانە ڕێگەی کەوتبێتە کوردستانەوە باسی دزیی و ڕێگریی و ڕوتکردنەوە یەکێ بوە لە تێبینیەکانی. تەنانەت هەندێ جار بێگانەکە تا لە ماڵەکەی ئەودا میوان بو بێ ڕێزی لێ گرتوە و دەستی بۆ کەلوپەلەکانی نەبردوە. کە ماڵەکەی بە جێ

هێشتوە و کەوتۆتە ڕێگا. ڕێگەی پێ گرتوە و ڕوتی کردۆتەوە. بە مانە وتراوە: "بە شەو جەردە، بە ڕۆژ مەردە". یان خۆی لە گەڵ کاروانەکەدا بوە بەڵام بە نهێنی هەواڵ و زانیاری بۆ دەستە جەردەکانی هاورێی ناردوە. بەمانە وتراوە: "ڕەفیقی قافڵەیە و شەریکی دزە". هەروەها وتویانە: "لە گەڵ گورگ گۆشت ئەخوا و لە گەڵ مەڕ شیوەن ئەکا." کابرای دز هەمو جار بەخت یاری نەبوە بە سەلامەتی و بە دەسکەوتەوە بگەڕێتەوە هەندێ جار کوژراوە. بۆیە وتویانە: "دایکی دز ڕۆژێ سنگ ئەخوا، ڕۆژێ سنگ ئەکوتێ."

**بۆ نمونە بڕوانە:**

تویژەری ڕوسی، ب. لیرخ: دراسة حول الاکرد، ترجمة: د. عبدی حاجی، دمشق 1992، ص 20.

بازرگانی فەرەنسی، رحلة دوبريه الى العراق (1807 - 1809 م)، ترجمة: الاب د. بطرس حداد، بيت الوراق للنشر 2011، ص 31.

ریچ، لە گەشتەکەی دا چەند جارێ ئاماژەی بەوە داوە، تەنانەت دزی لە کاروانەکەی خۆی کراوە.

مارک سایکس، هۆزەکانی کورد، وەرگێڕان و ئامادەکردنی حسین جاف، بەغداد - 1992. سایکس ئەم کارەی داوەتە پاڵ زۆربەی ئەو هۆزانەی لە ئەلبومەکەی دا ناوی هێناون.

لە ناو جاف دا لە ئاخافتن دا هەندێ وشە بە کار هێنراوە ئەشێ لایەنێکی ڕوانینی ئەوان بۆ ژیان دەر ببڕێ، بۆ نمونە:

لە باتی وشەی "کڕین" وشەی "سەندن" بە کار هێنراوە. کابرایەکی جاف هەرچیەکی کڕی بێ و بە هەرچەندێکی کڕی بێ و لە هەرکەسێکی کڕی بێ، نەیوتوە فڵانە شتم کڕیوە، بەڵکو وتویەتی فڵانە شتم سەندوە. دیارە کڕین جۆرێ لە ڕێکەوتنی ئارەزومەندانەی دولایەنەی تێدایە بەڵام سەندن جۆرێ لە زۆرلێکردنی تێدایە.

هەروەها لە باتی وشەی "هێنان" بۆ نرخی کەلوپەل وشەی "ژیان" بە کار هێنراوە. کابرایەکی جاف هەرچیەکی کڕی بێ بە تەمەنی کاڵاکەی نرخی بڕیوە، لە بەر ئەوە نەیوتوە ئەوەندە ئەهێنێ بەڵکو وتویەتی ئەوەندە ئەژی.

## جاف و زیانیی

زیانیی ڕادانی مێگەل یا گاگەل بوە بۆ ناو مەزرای جوتیارێ یا گوندێ. مەزراکە ئەگەر وشکەدان بو بێ یا تەڕە کاڵ.

زیانیی یەکێ لە کێشەکانی جاف لە گەڵ گوندنشینەکان بوە، بە تایبەتی لە کاتی تێپەڕینی کاروانی ئێلەکەدا بەرەو کوێستان یان لە گەڕانەوەی دا بەرەو گەرمیان لە گەڵ مێگەلەکانیان بە لای ئاوەدانی و کێڵگە و باخی جوتیارەکان دا. هەمو جار کە زیانییان کردوە ناکۆکی لە نێوان ڕەوەند و نیشتەجێ دا دروست بوە، هەندێ جاریش بۆتە هۆی شەڕ و کوشتنی تێدا قەوماوە.

ئەگێڕنەوە: ڕانەمەڕی کابرایەکی جاف چۆتە ناو پەلەگەنمی گۆرانێکەوە. گۆرانەکە داوای لە جافەکە کردوە ڕانە مەڕەکەی دور بخاتەوە. جافەکە لە وەڵام دا وتویەتی: "گوڵەکەی بگرە با لاسکەکەی بخوا!"

هەروەها ئەگێڕنەوە: ڕانەمەڕی کابرایەکی جاف چۆتە ناو پەلەیەک گاڵی گۆرانێکەوە. جوتیارەکە هاواری لە شوانەکە کردوە ڕانەکەی دور بخاتەوە. جافەکە پێی وتوە: "من ڕانەکەم دور ناخەمەوە تۆ گاڵەکەت بگوێزەرەوە!"

## خێڵەکیی کۆچەر و جوتیاری گوندنشین

خێڵەکی بە چاوی سوک لە گوندیی روانیوە. جوتیاریی بە کاری ترسنۆک و پیشەی بە ئیشی پیاوی بوەڵە داناوە. ئەوانی بە عەشیرەت نە ژماردوە. جاف بە خۆی وتوە کورد و بە دانیشتوانی گوندەکانی وتوە گۆران.

هەندێ قسە بە زمانی جافەوە لە سەر گۆران ئەگێڕنەوە گۆیا:

منداڵە جافێ گریاوە. باوکی پێی وتوە: "مەگری، مەگری! بەچکە گۆرانێکت بۆ تێرم گەمەی پێ بکەی!"

لە مانە هەموی سەیرتر، لە گەرمای هاوین دا کابرایەکی جاف گۆرانێکی راگرتوە وتویەتی: "نەبێ بە پێوە رابوەستی سێبەرم بۆ بکەی من لە بەری دا بخەوم!"

ئەم جۆرە روانینە پێوەندیی نێوان کورد و گۆران، کۆچەر و گوندنشینی، هەمیشە گرژ و ناساز هێشتۆتەوە. بە چاوی دوژمن سەیری یەکتریان کردوە. زۆر جار زەرەری گەورەی لە بەرهەمی کشتوکاڵ داوە.

## جاف و دین

هۆزەکانی ئێلی جاف بە گشتی موسوڵمانی سوننی - شافیعی مەزەب بون. لە هاوسەرگیری، ژنهێنان و تەڵاق، مردن و ناشتن و پرسە، دابەشکردنی میرات و کەلەپوردا، پێڕەوییان لە رێوشوێنەکانی دینی ئیسلامی کردوە. هەندێکیان حەجیان کردوە. تا ئەندازەیەکی زۆر لە ژێر کاریگەریی خورافات و ئەفسانە و ترس لە دێو و درنج، خێو، ئاڵ و شەوە، جنۆکە و تاپۆ دا بون. ئەوەش لە هەلومەرجێکی وەک ئەو ژیانە دا دروست بوە کە بە گشتی نەخوێندەوار و بەشی زۆری کاتی خۆیان لە گەڵ ئاژەڵ دا، بە رۆژ لە چۆڵەوانی و بە شەو لە تاریکی دا، دور لە ئاوەدانی و ئاوەندی زانستی، بە سەر بردوە.

هۆزەکانی جاف، بەشی گەورەی رەوەند بون. بەشێکی کەمی نیوە رەوەند و بەشێکی نیشتەجێ بون. بنەیان لە هەندێ لە گوندەکانی مەڵبەندی ژیانی ئێلەکە دا هەبوە. ئەوانەی رەوەند بون، مزگەوت و مەدرەسە و مەلایان نە بوە. بە رەمەزان بۆ بەڕێوەبردنی مەراسیمی رەمەزان مەلا یا فەقێیان راگرتوە. پێشنوێژی بۆ کردون، وەعزی داداون. رابەری تەراوێحی شەوانەی بۆ کردون. بە پێی تێگەیشتنی خۆی لە بیری ئیسلام ئامۆژگاری کردون.

بە زمانی جافێکی رەوەندەوە کە مەلایەتی بە لاوە کارێکی بەرێز بوە وتویانە: "گام بە بارەوەیە، دۆینەم بە دارەوەیە. مەلا کوڕم فێری مەلایی بکە!"

ئەو بەشەی هۆزەکانی جاف کە نیشتەجێ بون، یان بنەیان هەبوە، مزگەوت و مەدرەسە و مەلایان هەبوە. مەلای ناودار و زانای گەورە و شاعیری رۆمانسییان تێدا هەڵکەوتوە، لەوانە: مەولانا خالیدی نەقشبەندی، خانای قوبادی، مەلا وەڵەد خان، وەلی دێوانە، نالی.

## حەج و جاف

لە ناو کەسایەتیەکانی جاف دا لە کۆنەوە کە ناو ئەهێنرێن بە سەدان حاجییان تێدایە. حەجکردن لە سەردەمێک دا کە بە پێ و بە کاروان لە کوردستانەوە رۆیشتون بۆ مەکە و مەدینە لە حیجاز، سەفەرێکی ئاسان نەبوە. حەجکردن جگە لەوەی فەریزەیەکی دینیی بوە، ئەوانەی توانای دارایییان هەبوە بە پێویستیان زانیوە بیکەن، لە هەمان کات دا نیشانەیەک بوە بۆ بەرزبونەوەی پلەی کۆمەڵایەتی کەسەکە لە ناو تیرەکەی و

هۆزەکەی دا. بە تایبەتی بۆ ڕاوێژ پێ کردن و پرسورا و سوڵح. بۆ ئەوەش وەکو حاجی بناسرێتەوە. خەڵک ڕێزی حاجی لێ بگرێ، هەمیشە سەرپێچێکی زەرد "کەشیدە" ی بە سەری خۆیەوە بەستوە یا کردویەتی بە پشتێن.

دەیان چیرۆکی خۆش لە سەر حاجیانی جاف ئەگێڕنەوە. هەندێکی ڕوداون و هەندێکی هەڵبەستراون. بەڵام هەمویان سادەیی کابرا و بێ ئاگایی لە دنیای دەرەوەی ئێلەکەی دەرئەخەن.

ئەگێڕنەوە: "کابرایەکی میروەیسی جارێک ئەچێ بۆ حەج. دەختێ پەلە ئەکات و زو ئەڕوا کە ئەگاتە کەعبە، خێرا پەلامار ئەدا و قوڵفی کەعبە ئەگرێ و ئەڵێ: خوایە بم وە ساقەت خێرا لە خۆم و باوک و دایکم خۆش بوە تا خێڵ بەرۆکی نە گرتگی. *(رشتەی مرواری: 19/4)*

لە زمانی میر لیوا مستەفا یاملکیەوە ئەگێڕنەوە: حاجی مسەفا پاشا وتی: "ئەمیری حەج بوم. بە سەر حاجیەکانەوە ئەگەڕام. سەیرم کرد وا ئە بەر کەعبەدا کابرایەکی سوری قەڵەوی ڕیشسپی کەوتوە. ئاو ئەکەن بە سەریدا. بە جلوبەرگەکەیدا زانیم کوردە. چوم بە لایەوە. ئەو ساڵەش حەج کەوت بوە مانگی تەموزەوە گۆشتی کاڵ ئەخرایە سەر لەمەکە دەبرژا. کابرا چاوی بەرز کردەوە هەناسەیەکی درێژی هەڵ کێشا. لە پاشا سەری بەرز کردەوە و ڕوی کردە ئاسمان وتی: "ئەری خوا! تۆ بۆچ چاوت نەبو لەو دەشتی گەلگەی ئاوداری هەوا فێنکەدا ماڵ بۆ خۆت دروست کەی؟ ئەمە شوێن بو تۆ ئاوتەوە؟ ئەگەر جارێکی تر ڕوم کردەوە ئەم شوێنە بزانە من کوری خلک نیم." وتی: "لە پاشا پێم وت کابرا ناوت چیە و خەڵکی کوێیت؟" وتی: "حاجی قادری ڕۆغزایی." گەلگە، دەشت و گردێکە لە لای پێنجوێن. *(رشتەی مرواری: 79/1)*

هەر لە زمانی ئەوەوە ئەگێڕنەوە: "کابرایەکی کورد ساڵێک ئەچێ بۆ حەج. لە کاتی تەوافدا جامانەکەی لێ ئەدزن. حاجی مستەفا پاشا وتی وا ڕێ کەوت بو من لە پشت ئەو کابرایەوە بوم، گوێم لێ بو هەر ئەیوت: "بینایی چاوان! ئەمجارە هاتم بۆ خزمەتت فەرموت جامانەکەم بدزن. ئەگەر جارێکی کە منت لێرە چاو پێ کەوت بفەرمو هەرچی دەمونگانم هەس بیشکێنن بە سەر یەکا." *(رشتەی مرواری: 21/4)*

## جاف و میرایەتی ئەردەڵان

هەڵوێستی والیەکانی ئەردەڵان و کاربەدەستەکانی مەریوان و جوانرۆ لە جافی مرادی دۆستانە نەبوە. بەشێ لە هەوار و لەوەڕگا هاوینەکانی جافی مرادی کەوت بوە ناو خاکی ئێرانەوە. ئەو سەردەمە پێوەندی ناودەوڵەتی هێشتا لە ئاستێکی دیپلۆماسی و قانونی ئەوتۆدا نەبوە. هاتوچۆی ئێلات لە نێوان ئێران و عوسمانی دا بە جۆرێ ڕێک بخات، لە باتی ئەوەی کێشەی سیاسی و ناکۆکی قانونی لێ دروست بێ، قازانجی ئابوری لێ بکرێ. ڕەنگە سەرانی ئێلی جاف و، سەرانی هۆزەکانی نەیان زانی بێ ڕێککەوتننامەی ناودەوڵەتی چیە و، دەرەنجامە پێوەندیدارەکانی بەوانەوە چیە. ئەو زەمانە خێڵەکان بە گشتی دەسەڵاتی حکومەتیان وەکو دوژمن سەیر کردوە، چونکە سودێکی ئەوتۆیان لێ وەرنەگرتوە، بە پێچەوانەوە حکومەت هەمیشە بۆ سەندنی باج و گرتنی سەرباز چۆتە سەریان.

جافی مرادی، لە دوای پەیمانی زەهاوەوە پێوەندی هاولاتیبونیان لە گەڵ دەوڵەتی ئێران نەماوە، بەم پێیە نە ڕەعییەتی ئێران بون، نە هی والیی ئەردەڵان. بەڵکو ئەوان ئیتر ڕەعییەتی دەوڵەتی عوسمانی بون و، پێوەندییان لە گەڵ میرایەتی بابان هەبوە. سەرانی جاف هاتوچۆی میرەکانی بابانیان کردوە لە قەڵاچوالان و دواتر لە سلێمانی. باجیان بەوان داوە و لە لەشکرکێشیەکانی ئەوان دا بەشدارییان کردوە. هۆی سەرەکی دوژمنایەتی لە گەڵ جافی مرادی لەوەوە دەستی پێ کردوە، بەڵام والیەکانی ئەردەڵان کێشەکەیان لە ڕەگەزی سیاسی ڕوت کردۆتەوە، خستویانەتە قالبی سکاڵای خەڵک لە گەیاندنی زیانیی بە ئابوری کشتوکاڵی ناوچەی

مەریوان و جوانرۆ و بانە. جاف خاوەنی ران و رەوەی گەورە بون و زەنگین بـون. زۆر جـار کاربەدەسـتان چاویان برپوەتە سامانەکەیان. جاف خۆیشی لە کۆچورەوەکانی دا بیانوی بە دەستەوە داوە. هـەر ئەوەشـیان کردوە بە بیانو بۆ رێگرتن لە هاتن و، بۆ تاڵانکردنی رەوە و رانـەکانیان و گرتنـی پیـاو و خێزانـەکانیان و سەپاندنی سزای سەخت. مێژوەکانی ئەردەڵان لەم بارەیەوە چەندین روداو ئەگێرنەوە، لەوانە:

ساڵی 1206 ک لە سەردەمی ئەورحمان پاشای بابان دا، والیی ئەردەڵان چەند گوندێکی لە مـەریوان، کە وەکو ئەوان نوسیویانە، لە ساڵانی رابوردو دا خەڵکی شارەزور و بابان داگیریان کردوە و تیـا نیشـتەجێ بون، تاڵان کردوە و سوتاندوە و، چەند کەسێکی لە بەگزادە "شرورەکان" ی کوشتوە و هەندێکی لـێ بـە دیـل گرتون. هەواڵی ناردوە بۆ ئەرەحمان پاشا کـە ئیتـر رێگـە نـادا ئێلی جـاف و رانـەکانی پـێ بنێنـە خـاکی کوردستانەوە.

ئەو ساڵە ئێلی جاف نە چونەتە ناوچەی مەریوان. بەشی زۆریان لە شارەزور ماونەتـەوە. تـەنیا 200 ماڵ لەوانەی خزمیان هەبوە لە مەریوان لە گەڵ ران و رەوەی جاف بـۆ لـەوەرخـۆری چونەتـە کوێسـتانەکانی ئەوێ. خانی ئەردەڵان داوێتی بە سەریان دا مێگەلەکانی زەوت کردون و خێزانەکانی بە گیراوی بردۆتە شاری سنە، هەر چەند خێزانێکی دابەش کردوە بە سەر بنەماڵەیەکی سنەدا. *(میرزا شکرالله سنندجی فخر الکتاب. تحفەی ناصری در تاریخ وجغرافیای کردستان. امیر کبیر. تهران 1366. ص 175 - 176)*

هەروەها ساڵی 1236 ک ئێلی جاف کە چۆتە کوێسـتانەکانی ئـەردەڵان. ئـەمانوڵا خـان بـە بیـانوی ناکۆکی نێوان مەحمود پاشا و عەبدوڵا پاشای بابانەوە گۆیـا بـە هانـدانی ئـەوان ئێلـی جـاف "شـەرارەت و هەرزەگی" یان کردوە، پەلاماری داون هەندێکی لێ کوشتون و هەندێکی لێ گرتون و نزیکەی دو "کـرور" ران و رەوە و دارایی جافی لێ زەوت کردون. هەر بەو بۆنەیەوە هێرشی کردۆتە سەر شارەزور تا نزیکی سلێمانی تاڵان کردوە. وەدا لە هێزەکەی دا بڵاو بۆتەوە ئینجا کشاوەتەوە. *(تحفەی ناصری: 193)*

**والیەکانی ئەردەڵان هەڵوێستیان لە جافی جوانرۆش دۆستانە نەبوە.**

ساڵی 1170 ک والی ئەردەڵان بە ناوی راو و شکارەوە سەرانی ئێلی جافی جوانرۆی بانـگ کـردوە بۆ لای خۆی، خەسرەو بەگ و میـر عەلـی سـوڵتان کە گەورەی جـاف بـون هەردوکیـانی کوشـتوە. *(تحفەی ناصری: 150 - 151)*

تەنانەت بۆ سوکایەتی پێ کردن ساڵی 1247 والیی ئەردەڵان هێزی ناردۆتە سـەر بـارام بـەگ، ئیـل بەگی جافی جوانرۆ. خۆی و کورەکانی و چەند دەمراستی جافیان گرتوە. بارام بەگ و چـوار لـە کورەکـانی دارکاری کردوە ئینجا هێناویانە سەگێکی رەشیان بە پەت بەستۆتەوە بە ملیەوە و بە ناو شاردا گێراویـانە. بە پارانەوە و تکای گەورەپیاوەکانی سنە و جوانرۆ دوای ئەوەی چوار هەزار تمەنی لێ سەندوە، ئینجا بـەرەڵای کردوە. *(تحفەی ناصری: 206 - 207)*

لە سیستەمی دەرەبەگایەتی دا خاوەنێتی زەوی، سەرچاوەی بەرهەمی ئابوری بوە. جۆری پێوەندی ئاغا و جوتیاری دیاری کردوە. لە بەر ئەوەی زەوی موڵکی ئاغا بوە جوتیار لە موڵکی ئـەودا کـاری کـردوە، ئاغـا توانیوێتی بە ئارەزوی خۆی مەرجەکانی بە سەر کابرای جوتیار دا بسەپێنێ و، تا ئەندازەیەکی زۆر ئازادی و بەرهەمی لێ زەوت کردوە.

لە سیستەمی خێڵایـەتی دا خـاوەنێتی ئـاژەڵ، سـەرچاوەی بەرهـەمی ئـابوری بـوە. جـۆری پێوەنـدی سەرۆک و خێڵەکی دیاری کردوە. لە بەر ئەوەی هەمو ئاژەڵی خێڵ موڵکی سەرۆک نەبوە بە تەنیا، بەڵکو هـەر یەک لە ئەندامانی خێڵەکە، کـەم و زۆر ئـاژەڵـی خـۆی هـەبوە، سـەرۆک نـەی توانیـوە بـە ئـارەزوی خـۆی مەرجەکانی بە سەر ئەندامانی خێڵەکەی دا بسەپێنێ و، ئازادی و بەرهەمی لێ زەوت بکا.

بنەماڵەی دەرەبەگ بە چاوی رەعییەت - مسكێن، كرمانج، گۆران، سەیری جوتیارەكانی كردوە، بێگاری پێ كردون، چەوساندونیەتیەوە، بە زۆر گوێڕایەڵی و ملكەچیی بە سەردا سەپاندون، بەڵام بنەماڵـەی سـەرخێڵ بە چاوی هاوعەشیرەت سەیری ئەندامانی خێڵەكەی كردوە، نـەی توانیـوە سـوكایەتیان پـێ بكـا و، بـە زۆر گوێڕایەڵی و ملكەچیان بە سەردا بسەپێنێ.

# بەشی سێیەم:

## گۆڕانی پێوەندی پاتریارکی بۆ دەرەبەگی

ساڵی 1258 ک دەوڵەتی عوسمانی "ئەرازی قانوننامەسی" دەرکردوە. بە پێی ئەم قانونە بۆ یەکەم جار سەرەتای "تاپۆ" یان هێناوەتە بواری خاوەنێتی زەویوزارەوە. عوسمانیەکان لە جێبەجێکردنی ئەم قانونەدا چەند مەبەستێکیان هەبوە لەوانە:

**یەکەم**، نیشتەجێکردنی ئێلە کۆچەرەکانی عەرەب و کورد و. ناچارکردنیان بۆ گۆڕینی شێوەی ژیانیان لە ئاژەڵداری و حوشترداریەوە بۆ کشتوکاڵ.

**دوەم**، بۆ ئەوەی بیانهێننە ژێر دەسەڵاتی حکومەت و. داهاتی حکومەت زیاد بکا و بتوانن سیستەمی سەربازگیری جێبەجێ بکەن.

ئەم قانونە گۆیا بەشێ بوە لە ئەنجامدانی ئەو چاکسازیە سیاسی، کارگێڕی، لەشکریەی کە بۆ بەجێهێنانی "تەنزیمات" دانراوە. تەنزیمات، دەوڵەتانی ئەوروپایی بۆ ئەوەی رێگە لە هەرەسی دەوڵەتی عوسمانی بگرن بە سەر بابی عالیدا سەپاند بو. والیەکانی بەغداد تا ساڵانێکی زۆر نەیان توانیوە هیچ کام لە بابەتە سەرەکیەکانی، بە تایبەتی باجگیری و سەربازگیری، جێبەجێ بکەن چونکە سەرەڕای گەندەڵی داودەزگاکانی کارگێڕیی و بەڕێوەبەرایەتی، سەرانی ئێلەکان نە ئەچونە ژێر باری جێبەجێ کردنیەوە.

لە دوای کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی میرایەتی بابان و. هاتنی دەسەڵاتی راستەوخۆی تورک، کاربەدەستانی عوسمانی بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییە پڕ بکەنەوە، هەوڵیان داوە ئێلە کوردەکان بە گشتی و ئێلی جاف بە تایبەتی بە لای خۆیان دا رابکێشن. بەڵام پێوەندی نێوان ئێلی جاف و دەسەڵاتی عوسمانی، تا ساڵانێکی درێژ بە گرژی و دانەمەزراوی ماوەتەوە.

دەوڵەتی عوسمانی، لە دوای بڵاوکردنەوەی خەتی شەریفی گوڵخانە (1255 ک/ 1839 ز)، بە نیازی چاکسازیی زنجیرەیەک "تەنزیماتی" ی دەرکردوە بۆ نیشتەجێکردنی خێڵە کۆچەرەکان. لە مەش مەبەستی ئەوە بوە، دەسەڵاتی داوەندی بچەسپێنێ، سەربازگیری و باجگیری بە جۆرێکی راستەوخۆ لە ناوچەکان دا جێبەجێ بکات.

سەرداری ئەکرەم عومەر پاشا، والی عوسمانی لە عیراق، لە سەردانەکەی دا بۆ ناوچەی سلێمانی (1274 ک) بە نیازی دامەزراندنی دەسەلاتی ناوەندیی تورکی و، هێنانەژێرباری خێڵە کوردییەکانی ناوچەکە، هەندێ لە پیاوە ناسراوەکانی هەمەوەندی کوشتوە. لە گەڵ سەرانی جافیش، بە تایبەتی لە گەڵ محەمەد بەگ (دواتر حەمە پاشا) ی کوڕی کەیخەسرەو بەگ گفتوگۆی کردوە بەڵام ڕێک نە کەوتون. خۆیشی لە عیراق دا ئەوەندە نە ماوەتەوە تا بتوانێ برێ لە بڕیارەکانی حکومەت بسەپێنێ.

دوای ئەو مستەفا نوری پاشا (1276 ک)، ئەحمەد تۆفیق پاشا (1277 ک)، محەمەد نامیق پاشا بۆ جاری دوەم (1278 ک)، تەقێ دین پاشا (1284 ک) بە دوای یەک دا هاتون و هەریەکەیان بۆ ماوەیەک بون بە والی. بەڵام هەمویان بە هەمان ئەنجامەوە گەڕاونەتەوە.

ساڵی (1286 ک) مەدحەت پاشا، کە بو بە والی. وەکو والیەکانی پێش خۆی هەوڵی جێبەجێکردنی قانونەکەی دا. دەس کرا بو بە تۆمارکردنی ئەرز بۆ تاپۆ. دەس کرا بو بە فرۆشتنی ئەرزی ئەمیری بە "موزایەدە" بۆ تەفویز لە خۆراسان، خانەقین و کفری.. (عزاوی: 14/8)

مەدحەت پاشا کە هاتوە، ویستویەتی "ئەرازی قانوننامەسی". بە نیازی هاندانی دانیشتن و نیشتەجێبونی رەوەندەکان، جێبەجێ بکا. بۆ یەکەم جار فرۆشتنی زەویوزاری ئەمیری و تاپۆ کردنی هێناوەتە کایەوە. ئەویش لە گەڵ ئێلی جاف نەگەیشتوتە ڕێککەوتن. محەمەد بەگ، سەرۆکی ئێلی جاف، کۆچی کردوە بۆ ئێران. مەدحەت پاشا لە گەڵ زۆری خێڵە کوردی و عەرەبیەکانی تریش توشی شەڕ و لەشکرکێشی بوە.

ساڵی 1289 ک مەدحەت پاشا لابرا. محەمەد رەئوف پاشا لە جێگەی دانرا بە والیی عیراق. رەئوف پاشا درێژەی دا بە هەمان سیاسەتی نیشتەجێکردنی ئێلاتی کۆچەر و فرۆشتنی ئەرزی ئەمیری. فرۆشتنی ئەرزەکان بە "موزایەدە" لە رۆژنامەی "زەورا" دا بڵاو کراوەتەوە. ئەوسا بە دەگمەن لە ناو ئێلە کۆچەرەکان دا خوێندەوار هەبوە تا ئاگای لە ئیعلانی رۆژنامەی زەورا و قازانج و زەرەری "ئەرازی قانوننامەسی" و تۆماری "تاپۆ" بێ.

**ساڵی 1290 ک رەدیف پاشا کراوەتە والی.**

ئەم هەمو ئاڵو گۆڕە، لەو ماوە کورتەدا، لە لوتکەی دەزگای کارگێڕیی عیراق دا خۆی نیشانەی نائارامی و دانەمەزراوی بوە.

ئێلی جاف کە لە لایەن عوسمانیەوە گوشاری بۆ هێنراوە روی کردۆتە لەوەرگاکانی ئێران و کە لە لایەن ئێرانیشەوە تینی بۆ هات بێ روی کردۆتەوە لەوەرگاکانی عوسمانی. بەمجۆرە خۆی پاراستوە لە شەڕ و پێکادانی چەکدار، هەروەها لە دانی باج و سەرباز. کێشەکەیان بە چارەسەرنەکراوی ماوەتەوە.

ساڵی 1285 ک رویان کردۆتە ئێران. خەریکی گفتوگۆ بون لە گەڵ کاربەدەستانی سنە. مەحمود بەگ (دواتر مەحمود پاشا) ی کوڕی محەمەد بەگ، لە باتی هەمو ئێلەکەی بەڵێنی داوە بە کاربەدەستانی ئێرانی کە لە کاتی کۆچوڕەوی ئێلەکەیان دا نە هێڵن کەسێ لەوان زەرەر بە دانیشتوانی ئێران بگەیەنێ. (*دفتر مطالعات سیاسی و بین المللی (1313 - 1271 ه. ق)، گزیده اسناد سیاسی ایران و عثمانی، جلد دوم، تهران، 1369. سند شماره 338. 11 ربیعی سانی 1285 ه ق*)

هەروەها دەربارە نامەکاریی نێوان کاربەدەستانی ئێرانی و عوسمانی دربارەی سکاڵا و گازاندە لە جاف، (*سەنەدەکانی ژمارە: 342، 344، 345*).

لەو سەردەمەدا میرایەتی ئەردەڵان نەماوە. کوردستانی ئێران راستەوخۆ لە لایەن کاربەدەستانی دەرباری قاجارەوە بەڕێوە براوە. هەڵوێستی کاربەدەستانی ئێران لە سەردەمی میرایەتی ئەردەڵانەوە لە ئێلی جاف دۆستانە نە بوە. لە لایەکەوە هێزی مرۆیی جاف لە خزمەتی میرایەتی بابانی نەیاری میرایەتی ئەردەڵان

دا بوە. لە لایەکی تریشەوە ئێلی جاف هەمو ساڵێ لە کۆچ‌وڕەوی هاوینەدا زەرەر و زیانی زۆریان لە کشتوکاڵ و دارایی دانیشتوانی مەریوان و بانە و سەقز و سنە داوە.

ئێلی جاف سەرەڕای هەردو ڕێککەوتنی یەکەم و دوەمی ئەرزرۆم و دابەشکردنی ناوچەکە، بەردەوام بون لە سەر خێڵەوخوار و خێڵەوژور. لە گەڵ حکومەتی ئێران، وەکو خۆیان ویستویانە و بەو مەرجانەی ئێران بۆی داناون، پێک نەهاتون، رویان کردۆتەوە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی.

ساڵی 1290 ک رەدیف پاشا والیی عیراق، بۆ ئەوەی ئێلی جاف بهێنێتە ژێر رکێفی دەوڵەتی عوسمانیەوە چەندین پلە و پایەی بەخشیوە بە سەرۆکی ئێل و کوڕ و خزمەکانی، لەوانە:

حەمەبەگی کەیخوسرەو بەگ پلەی پاشا و ئەمیر لیوای دراوەتێ. لە هەمان کات دا دانراوە بە قایمقامی گوڵعەنبەر (خورماڵی ئێستا). گولعەنبەر لەو سەردەمەدا ناوەندی کارگێری و بەرێوەبەرایەتی ناوچەکە بوە.

لە هەمان کات دا کوڕەکانی: مەحمود بەگ، عوسمان بەگ، سلێمان بەگ، حەسەن بەگ و خزمەکانی: بارام بەگ، قادر بەگ، عەزیز بەگ، محەمەد بەگ... هەمویان پلەی فەرمییان دراوەتێ. *(عزاوي، العراق بين الاحتلالين. 20/8. ئەویش لە رۆژنامە زەورای وەرگرتوە.)* روتبەی ئەو سەردەمە جگە لە پایەی کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتی فەرمی، موچەی مانگانەشی لە گەڵ بوە.

کاربەدەستانی تورک بۆ ئەوەی دەس بگرن بە سەر ناوچەکە و دانیشتوانی دا هەمیشە هەوڵیان داوە ناکۆکی لە ناو بنەماڵە دەسرۆیشتوەکان دا دروست بکەن و سەرانی ئێلەکان بکەن بە گژ یەکتری دا. هەر بەو شێوەیە گەورەترین ئەمارەتی خواروی عیراق، کە بنەماڵەی سەعدون بوە، بە فیتی والیەکانی عوسمانی، لە سەر نیشتەجێبون و خاوەنێتی زەویوزار، *(بطاطو: 101/1)* کراون بە گژ یەکتری دا. لە گەڵ ئێلی جافیش هەمان کاریان کردوە. *(حنا بطاطو، العراق - الطبقات الاجتماعية والحركات الثورية من العهد العثماني حتى قيام الجمهورية، الكتاب الاول، ترجمة عفيف الرزاز، بيروت - 1995.)*

لە بەرامبەر ئەو پلە و ئیمتیازانەی تورک دابویان بە حەمە پاشا، داواکارییان لێ هەبوە، بە تایبەتی دەربارەی نیشتەجێبون، ملدان بۆ دانی سەرباز و باج، بە پێی قانونەکانی دەوڵەتی عوسمانی.

جگە لەو داواکارییانە هاوزەمان لە کاتی گفتوگۆ لە گەڵ سەرۆکی گشتی ئێلەکە دا، کاربەدەستانی تورک لە بەغداد راستەوخۆ لە گەڵ سەرانی هەندێ لە هۆز و تیرەکانی جاف، بە تایبەتی هەندێ لە سەرانی شاتری و هارونی، جیا لە بنەماڵەی بەگزادە، کەوتونەتە پێوەندی و گفتوگۆ بۆ نیشتەجێ کردنیان. بەشێ لە ئەرزەکانی شارەزوریان وەرگرتوە و، بەڵێنیان داوە نیشتەجێ بن و، خۆیان راستەوخۆ باجی ساڵانە بدەن بە حکومەت.

ساڵی 1290 حەمە پاشا لە گەڵ کاربەدەستانی عوسمانی نە گەیشتۆتە ئەو ڕێککەوتنەی خۆی ویستویەتی. لە بەر ئەوە بۆ دەربڕینی نارەزایی لە دەوڵەتی عوسمانی بڕیاری داوە خۆی و هەمو ئێلی جاف کۆچ بکەن بۆ ئێران، ببن بە "رەعیەت" ی دەوڵەتی ئێران. جاف ئەگەرچی هێزێکی مرۆیی گەورە بوە و، توانای جەنگیی زۆری هەبوە، بە گوێرەی هەڵسەنگاندنی ریچ لە کاتی پێویست دا هەزار پیادە و سێ سەد سوارەی پێ ساز دراوە، (ریچ، 287) بەڵام هەرگیز نارەزایی خۆی بەرامبەر دەسەڵاتی عوسمانی و ئێرانی بە چەک دەرنەبڕیوە و، پەنای نەبردۆتە بەر بەکارهێنانی چەک.

لەم کۆچەدا بەشێ لە تیرەکانی شاتری و هارونی لە گەڵی نەچون بۆ ئێران. لە شارەزور ماونەتەوە. لە گەڵ دەسەڵاتی عوسمانی پێک هاتون، خۆیان راستەوخۆ رەفتار لە گەڵ حکومەت بکەن. ئەرزیان لێ وەرگرتون و بەڵێنیان داوە باج بدەن. رۆژنامەی زەورا کە رۆژنامەی فەرمیی ولایەتی بەغداد بوە هەواڵەکەی بە گرنگ زانیوە بۆ تێکدانی یەکێتی ناو ریزی تیرەکانی جاف، بۆیە بەم جۆرە بڵاوی کردۆتەوە:

"بەر گوێمان کەوتوە کەوا سەرۆکەکانی هەردو تیرەی شاتری و هارونی لە هۆزی جاف هـاتون بۆ مەڵبەندەکانی حکومەت بۆ سوپاسگوزاریی تایبەتی بەرانبەر بەو یارمەتی و هەڵاوێـردنەی لە چـاکەی شـاهانەوە پێیـان گەیشـتوە و، بینـا لە سـەر ئەوەی کە داوایـان کـردوە کە لەمەولا ڕاستەوخۆ موراجەعەت بە حکومەت ئەکەن و دا لە مەولا مامەڵە لە گەڵ ئەوانیش وەک مـامەڵەی هەمو ڕەعیەتی تر بێ، ئەم داوایەیان لەم بارەوە پەسەند کراوە. جا بۆ ئەوەی کاروبـاری ئەم دو تیـرەیە و دەربڕینـی خسوسـیەتی خۆیـان و کـۆکردنەوەی زەکـاتی ئاژەڵیـان بە ئاگـاداری موتەسەڕیف و قایمقامەکانی ئەو شوێنانە بێ کە ئەمانەیان لێن. فەرمانی پێویست نوسراوە بـۆ موتەسەڕیفیەتی شارەزور و سلێمانی و، فەرمانیش درا بە سەرەکەکانی هەردو تیـرە و زانیـیـان کە شاهی مەزن چ یارمەتی و چاودێریەکی کردون و سوپاسی ئەم مامەڵە و بانگکرانەیـان کـرد کە ڕاستەوخۆ مـوراجەعەتی حکـومەت بـکەن و مامەڵەیـان وەک خەڵکـی تـر لە گەڵ بکـرێ. لە کاتێک دا کە زەویوزار بۆ نیشتەجێکردنی جاف بە خۆڕایی دەدرا، سەرەکەکانی ئەم دو تیرەیە گفتیان دا کە لە بەرانـبەری ئەو زەویـوزارەدا پێیـان ئەسـپێردرێ، شـتێ بە گەنجینـەی دەوڵەت پێشکەش بکەن. ئەم حاڵەتـانە بەشـێکن لە نیشـانەی دیـار و ئاشـکرای دادپەروەری پیـرۆزی شـاهانە کە هەمـو ڕەعـیەت و خەڵکـی خـوای گرتـۆتەوە. کاربەدەسـتی تـایبەتییش دانـرا بـۆ پیشاندانی ئەو شوێنانەی پێویستن بۆ کشتوکاڵ تێداکردنی ئەم نـاوبراوانە و لە چوارچێـوەی دانی سەنەدی تاپۆدا بە هەر کەس بە ناوی خۆیەوە."

*(ڕۆژنامەی زەورا، ژمارە 337 ی 10 سەفەری 1290 ی کۆچی بەرامبەر 9 ی 4 ی 1873 ی زایینی، لە تەئریخی جاف وەرگیراوە)*

ئەمەش تێکدانی یەکێتی ڕیزەکانی ئێلی جاف و، دەرچون بوە لە دەسەڵاتی سەرۆکایەتی ئێلەکە، کە تـا ئەو سەردەمە تەنیا لایەنی دەسەڵاتداری ناو ئێلی جاف بوە بۆ پێوەندی لە گەڵ دەسەڵاتی کـارگێڕی دا، چ لـە سەردەمی دەسەڵاتی میرایەتی بابان و ئەردەڵان و چ لە سەردەمی دوای دەسەڵاتی ئەوان لە گەڵ حکومەتـەکانی عوسمانی و ئێرانی دا.

هەمو ئێلی جاف، جگە لە هەندێ تیرەی شاتری و هارونی، هەمویان لە گەڵ حەمە پاشا چون بۆ ئێران. حەمە پاشا ڕوی کردۆتە ناوچەکـانی جـوانڕۆ، سـەر بە ولایەتـی سـنە و، نـاوچەی زەهـاو سـەر بە نـاوچەی کرماشان. کەوتۆتە گفتوگۆ لە گەڵ کاربەدەستانی ئێران. حەمە پاشا خۆی چۆتە تاران و سەردانی ناسـرەدین شای قاجاری کردوە. لەو سەردەمەدا ئێران و عوسمانی هێشـتا پێـک نە هـاتبون لە سـەر دیـاریکردنی هێڵـی سنوری نێوان هەردو دەوڵەت. هەر لایەکیان هەوڵـی داوە بـۆ ئەوەی ئەرزی ئەوی تـر بکەوێـتە نـاو سـنوری وڵاتەکەیەوە، ئێلاتی سنور بە لای خۆی دا رابکێشێ. لە نـاو کاربەدەسـتانی ئێرانـی دا دو بۆچـونی جیـاواز هەبوە لە سەر جۆری ڕەفتارکردن لە گەڵ حەمە پاشا و ئێلی جاف:

**بۆچونی یەکەم،**

فەرهاد میرزا معتمد الدولە، والی سنە و مـامی ناسـرەدین شـا، نـوێنەرایەتی کـردوە. ویسـتویەتی بە مەرجێ داڵدەی جاف بدرێ کە قبوڵ بکەن وەکو هەمو ڕەعیەتەکانی تری ئێران نیشتەجێ بن. واز لە گەرمیـان و کوێستان بهێنن، خەریکی گوندنشینی بن. باج و سەرباز بدەن. بە پێچەوانەوە، ئەگـەر ڕازی نـەبون، داڵـدە نە درێن و ڕێگە نە درێن بێنە خاکی ئێرانەوە بگرە بە زۆر ڕەوانەی خاکی عوسمانی بکرێنەوە. ئێلی جاف لە هاوینان دا بۆ لەوەڕخوری چونەتە کوێستانەکانی مەریوان و سنە و سـەقز. هەمـو سـاڵێ زیـانیی زۆریـان لە دانیشتوانی ناوچەکە کردوە. خەڵکی ناوچەکە دادوبێدادیان بوە لە دەستیان.

**بۆچونی دووەم،**

هی هەندێ لە گەورەکاربەدەستی دەربـاری قاجـار بـوە. لەوانە میـرزا حوسـەین خـانی سپاسـالار. کە لایەنگری دانەدانی جاف و مانەوەیان بون بە کۆچەری لە ئێران.

کاربەدەستانی دەربار لە چاو کاربەدەستانی سنەدا نەرمتر بون. ویستویانە ئێلی جاف بە لای ئێران دا رابکێشن. بە فەرمانی ناسرەدین شا لە شەعبانی 1290 ک دا حەمە پاشا هـەم نازنـاوی "خـان" ی دراوەتـێ. هەم کراوە بە حاکمی زەهاو. لە داهاتی ناوچەکە کە ئەبو خۆیان کۆی بکەنەوە. موچە بـۆ خـۆی و هەنـدێ لـە بەگزادەکانی خزمی براوەتەوە.

حەمە پاشا لە زەهاو جێگیر بوە. بەڵام مەحمود بەگی کوڕی (دواتر مەحمود پاشا)، لە دیـوی عوسـمانی ماوەتەوە و بە ماڵەوە چۆتە بەغداد نیشتەجێ بوە. مەحمود بەگ خۆی پێشتر چەند جارێ لـە ئێـران بـوە و سەردانی تارانی کردوە و. شارەزای هەڵوێستی ئێرانیەکان بوە بەرامبەر ئێلی جاف.

دوای ئەوەی حەمە پاشـا کراوەتـە حـاکمی زەهـاو. ناسـرەدین شـا ئینجـا سـاڵی 1292 ک موچـەی ساڵانەی بۆ پاشا و خزمەکانی بریوەتەوە. بە پێی هەندێ لەو بەڵگانە جگە لە پاشا خـۆی، ئـەم بەگزادانـەش موچەی ساڵانەیان بۆ دیاری کراوە:

- قادر بەگی کوڕی حەمە پاشا 200 تمەن.
- مەحمود بەگی کوڕی حەمە پاشا 60 تمەن.
- کەیخوسرەو بەگ 200 تمەن.
- محەمەد ئەمین بەگی ئامۆزای پاشا 60 تمەن.
- محەمەد ساڵح بەگ 40 تمەن.

حەمە پاشا، مەحمود بەگ (دواتر مەحمود پاشا) ی کوڕی ناردۆتە بەغـداد. لە بەغـداد نیشـتەجێ بـوە. مەحمود بەگ کەسێکی خوێندەوار، شـارەزای کاروبـاری دەوڵەت، ئەدیـب بـوە. لە گەڵ شـاعیر و ئەدیبەکـانی هاوچەرخی خۆی، لەوانە: مەولەوی، کاک ئەحمەدی مەجزوب، سـەید فەتـاحی جەبـاری، شـێخ رەزای تاڵەبـانی، پێوەندی دۆستانەی هەبوە. پاشای باوکی بەردەوام پارەی بۆ ناردوە. لە بەغداد هەم خەریکی گفتوگـۆ بـوە لە گەڵ کاربەدەستانی عوسمانی، هەم خەریکی کرینی زەویوزار بوە. تەنـانەت بەشـێ لە کەشـکۆڵەکەی، وەکـو لە پەراوێزەکانی دا نوسیویەتی، لە بەغداد نوسیویەتیەوە. چەند جارێ لە نێوان باوکی و کاربەدەستانی عوسـمانی دا پەیام و راسپاردەی هێناوە و بردوە.

ساڵی 1292 ک عەبدوڕحمان پاشا بۆتە والی. لە سەردەمی ئەم والیەدا پێوەندی نێـوان حەمە پاشـا و سەرانی ئێلی جاف و دەسەڵاتی عوسمانی باش بوە و. ئیتر بە یەکجاری جێگیر بوە.

مەحمود پاشا لە پەراوێزی کەشکۆڵەکەی دا چەند هەواڵێکی بە زمـانی فارسـی لەو بـارەیەوە نوسـیوە لایەنێکی روداوەکان رون ئەکاتەوە:

لە پەراوێزی لاپەڕەیەکی دا، لە 17 ی شەوالی 1291 ک دا نوسـیویتی: کە خـۆی بە مـاڵەوە مـوقیمی بەغدادە باوکی هیجرەتی فەرموە بۆ ئێران. *(کەشکۆڵی مەحموود پاشای جاف، بەرگی دوەم، بنکەی ژین: 190)*

لە پەراوێزی لاپەڕەیەکی تردا، لە 10 ی رەمەزانی 1291 دا لە بەغداد نوسیویتی: "خط بماند یادگار: 194"

لە پەراوێزێکی تردا، لە 1292 ک نوسیویتی: بە ماڵەوە موقیمی بەغداد بوە باوکی هیجرەتـی فەرمـوە بۆ ئێران. داوای لە خوداوەندی عالەم کردوە بە مەرحەمەت ئەو تەفرەقەگیە جەمع بفەرمـوێ. لەم پەراوێـزەی دا باسی نامەیەک و چوار بەیت شیعری مەولەوی ئەکا کە بە تایبەتی بۆ ئەوی نـاردوە. *(کەشـکۆڵ: 244. دیـوانی مەولەوی: 23)*

لە پەراوێزێکی تردا، لە 1292 ک دا نوسیویێتی: لە بەغداد بە ئەمری عەبدوڕحمان پاشا والی بەغداد چوە بۆ زەهاو بۆ لای باوکی. لە گەڕانەوەی دا لە شەکمەیدان لە گەڵ ئەشرەف پاشای موتەسەڕیفی سلێمانی پێکەوە چون بۆ هەڵەبجە. لەوێشەوە چونەتە گوڵپ بۆ سەردانی سەرکار شێخەکەی شێخ محەمەد نەفەندی. لەوێ لە یەک جیا بونەتەوە ئەشرەف پاشا گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و مەحمود بەگ چۆتەوە بۆ بەغداد. (کەشکۆڵ: 172)

سەرەنجام لە گەڵ کاربەدەستانی عوسمانی گەیشتۆتە پێکهاتن. قەناعەتی بە حەمە پاشای باوکی کردوە کە بە یەکجاری بگەڕێنەوە بۆ خاکی عوسمانی و. هەمویان گەڕاونەتەوە بۆ شوێنی پێشوی خۆیان. سەرزەمینێکی فراوانیان لە نزیکی مەندەلیەوە تا پێنجوین بە تاپۆ وەرگرتوە. بۆیە بە خۆی و هەمو ئێلەکەیەوە گەڕاوەتەوە دیوی عوسمانی. ساڵی 1958 کە ڕژێمی پاشایەتی روخاوە و ڕژێمی جمهوری "قانونی ئیسلاحی زەراعی" دەرکردوە زۆرایەتی ئێلی جاف جوتیار بون و بەگزادەی جاف. یەکێ لە بنەماڵە زەویدارە هەرە گەورەکانی عیراق بون. پێنجسەد و سیونۆهەزار و سێ سەد و سیوسێ (539333) دۆنم ئەرزیان هەبوە. (حنا بطاطو 1/ 81)

حەمە پاشا پیاوێکی هەڵکەوتو بوە. سەرۆکی گشتیی هەمو ئێلی جاف بوە. ئەگەرچی لە گەڵ ئێلەکەی گەرمیان و کوێستانی کردوە، لە سەر قەڵای شیروانە، کە کەوت بوە ناوچەرگەی گەرمیانەوە، کۆشکێکی گەورەی دروست کردوە. زستانان لەوێ ژیاوە. حەمە پاشا، سەرۆکی ئێل، خاوەنی سامانێکی زۆر بوە. خاوەنی ران و رەوەیەکی گەورە بوە. لە هەمان کات دا بازرگانێکی گەورە بوە. شارەزای کاروباری دەوڵەتی بوە.

حەمە پاشا گفتوگۆی سەرانی شاتری و هارونی بە جیا لە گەڵ کاربەدەستانی بەغداد و، نەچونی خۆیان و هۆزەکانیان بۆ ئیران، بە هەڵگەڕانەوە و. تێکدانی یەکێتیی فیدارسۆنی دێرینەی ئێلی جاف داناوە. تا ئەو سەردەمە سەرۆکی جاف لە باتی هەمو هۆز و تیرە و بەرەبابەکانی فیدراسیۆنی جاف، نوێنەرایەتی جافی کردوە لە بەرامبەر دەسەڵاتی میرایەتی بابان و کاربەدەستانی عوسمانی و ئیرانی دا. هیچ کام لە سەرانی هۆزەکان بۆیان نەبوە لە پشتی ئەوەوە پێوەندی لە گەڵ هیچ لایەک بکەن. ئەوەی سەرانی شاتری و هارونی کرد بویان، دەرچون بو لەو نەریتە. حەمە پاشا، عەزیزی شاوەیس و هەندێ لە سەرانی شاتری گرتوە. گیراوەکان لە زیندان دا مردون. کەسوکاریان پێیان وا بوە لە زیندان دا دەرمانخوارد کراون و کوژراون. بڕیاریان داوە لە تۆڵەی خوێنی سەرۆکەکەیان دا حەمە پاشا بکوژنەوە و، کوشتویانەتەوە (1299 ک).

کوژرانی حەمە پاشا وێستگەیەکی سەرەکی بوە لە گۆڕینی ژیانی سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، ئێلی جاف دا. دوای ئەم روداوە سیستەمی خێڵایەتی - پاتریارکی لە ناو ئێلی جاف دا گۆڕا بەرەو سیستەمی دەرەبەگی - زەویداری.:

**یەکەم:** سزادانی تیرەی کەرەمەیسی بکوژی حەمە پاشا ئەوەندە سەخت بو، هەموانی چاوترسێن کرد. ئیتر لە ناو ئێلی جاف دا کەسێ یا تیرەیەک نەما پرکێشی بکا لە فەرمان و ڕێنماییەکانی بنەماڵەی سەرۆک یاخی بێت یان لە پشتی ئەوانەوە پێوەندی لە گەڵ کاربەدەستانی عوسمانی یا قاجاری بکا. بنەماڵەی بەگزادەی جاف، بە تایبەتی سەرۆکەکەیان. کە دوای حەمە پاشای باوک، کوڕەکانی: عوسمان پاشا و مەحمود پاشا جێگەیان گرتۆتەوە، نوێنەرایەتی هەمو ئێلەکەیان کردوە لە لای کاربەدەستانی هەردو دەوڵەت.

**دوەم:** هەمو زەویوزاری مەڵبەندی ژیانی هۆز و تیرەکانی فیدراسیۆنی جاف و لەوەڕگای رەوە و رانەکانیان، کە لە نزیک خالس و سەعدیە و خانەقینەوە تا هەڵەبجە و پێنجوینی گرتۆتەوە، بە فەرمی کەوتۆتە

دەست بنەماڵەی بەگزادەی جاف و. بە تاپۆ بوە بە موڵکی ئەوان و. ساڵ لە دوای ساڵ تیرە و هۆزە کۆچەرەکان ناچار بون گوند ئاوا بکەنەوە، نیشتەجێ بن. دەس لە ئاژەڵداری هەڵبگرن. خەریکی کشتوکاڵ بن. لە خێڵەکیی رەوەندەوە ئەبون بە جوتیاری گوندنشین. بە تایبەتی کە رێککەوتنەکانی ئەرزڕۆمیش کەوت بونە بواری جێبەجێ کردنەوە.

**سێیەم:** پێوەندی پاتریارکی - خێڵەکی نێوان سەرۆکی ئێل و ئەندامانی خێڵەکەی لە ئاژەڵداری گەڕۆکەوە گۆڕاوە بۆ پێوەندی نێوان دەرەبەگی - زەویدار و جوتیاری - بێزەوی.

## پاشکۆ – 1 –

### سەرچاوە

چەندین نوسەر باسی هۆز و تیرەکانی ئێلی جافیان کردوە گرنگەکانیان بریتین لە:

کلۆدیۆس جێمس ریچ، گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان 1820، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە محەمەد حەمەباقی، چاپی ئاراس، هەولێر - 2002. (ل 256 - 257)

مارک سایکس، هۆزەکانی کورد، وەرگێڕان و ئامادەکردنی حسێن جاف، بەغداد - 1992. (ل 27).

مێجەر ئی. بی. سۆن، چەند سەرنجێک دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خوارو، لە ئینگلیزیەوە وەرگێڕانی نەجاتی عەبدوڵڵا، بنکەی ژین، سلێمانی - 2007. (ل 63 - 73)

العشائر الكردية، ترجمه و علق عليه: فؤاد حمەخورشيد. بغداد - 1979. ئەمە تەرجومەی راپۆرتێکە کە دەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیز "دائرة الحاكم المدني في العراق" بە ئینگلیزی بۆ ئەفسەرەکانی خۆی نوسیوە بە ناونیشانی: ملاحظات عن عشائر كردستان الجنوبيه (بين الزاب الكبير وديالى)، بغداد - 1919.

ادموندز، كردها، تركها، عربها، ترجمه ابراهيم يونسى، تهران - 1367. (ص 154 - 171)

ادموندز، كرد و ترك و عرب، ترجمة جرجيس فتح الله، بغداد - 1971. (ص 129 - 143)

باسيلي نيكيتين، الكرد - دراسة سوسيولوجية وتاريخية، ترجمة الدكتور نوري طالباني، بيروت - 2001. (ص 268 - 272)

واسيلى نيكيتين، كرد و كردستان، ترجمه محمد قاضى، تهران - 1366. (ص 367 - 371)

لە ناو عەرەبی عیراقی دا:

عباس العزاوي، عشائر العراق، الجزء الثاني، بغداد - 1947. (ص 28 - 83)

الدكتور شاكر خصباك، الاكراد - دراسة جغرافية اثنوغرافية، بغداد - 1972. (ص 368 - 378)

----، العراق الشمالي دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية، بغداد - 1973.

جگە لەمان، لە ناو کوردا

کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، تەئریخی جاف، لێکۆڵینەوەی دکتۆر حەسەن جاف، بەغداد - 1995.

محمد امین زکی، تاریخی سلیمانی و وڵاتی، بەغداد - 1939. (ل 176 - 186)

حمزه عبدالله، العشائر الكردية، دەسنوس.

## پاشکۆ – 2 –

### خەتی شەریف گوڵخانە

ساڵی 1255 ک (1839 ز) سوڵتان عەبدولمەجیدی عوسمانی (1823 - 1861 ز) لە کۆشکی گوڵخانە لە بەردەم وەزیر و گەورەکاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی دا ڕاگەیاندنێکی خوێندەوە وەکو سەرەتای دەستپێکردنی "تەنزیمات" بۆ ئەنجامدانی چاکسازی لە داودەزگاکانی دەوڵەتەکەی دا. مستەفا ڕەشید پاشا (1800 - 1858 ز)، کە چەند جارێ وەزیری کاروباری دەرەوە و چەند جارێ سەدری ئەعزەم بوە، لە ژێر کاریگەریی سەرەتاکانی شۆڕشی فەرەنسی دا، ڕا گەیاندنەکەی ئامادە کرد بو.

ئەمەی خوارەوە دەقی ڕاگەیاندنەکەیە:

هەمو دنیا ئەزانێ لە ڕۆژانی یەکەمی دەوڵەتی عوسمانیەوە، کە سەرەتا بەرزەکانی قورئان و ئەحکامەکانی شەریعەت هەمیشە بە تەواوی پێڕەوی کراون. سەڵتەنەتی بەرزی ئێمە گەیشتۆتە

بەرزترین پلەی هێز و دەسەلات و، هەمو ئەتباعەکانی گەیشتونەتە خۆشی و ئاسودەیی. بەلام لە سەدوپەنجا ساڵی رابردودا بە هۆی دژواریی یەک لە دوای یەک و هۆکاری جۆراوجۆرەوە، نە شەریعەتی غەرا گوێڕایەڵی کراوە و نە قانونە باشەکان پێڕەویان کراوە. لە ئەنجام دا، بەهێزیی و ئاسودەیی پێشو گۆڕاوە بۆ لاوازی و کڵۆڵی. دیارە هەر وڵاتێ بە قانونەکانی شەریعەت حوکم نەکرێ ناتوانێ بمێنێ.

لە رۆژانی یەکەمی جلوسی ئێمەوە لە سەر تەخت، بیری ئێمە بە تەنیا چوە بۆ گەشەپێدانی ئیمپراتۆری و پتەوکردنی ئاسودەیی خەڵک. لە بەر ئەوە، ئەگەر شوێنی جوگرافی ولایەتەکانی عوسمانی و، پیت و بەرەکەتی ئەرزەکەی و، ژیریی و هۆشی دانیشتوانی رەچاو بکرێ، دەری ئەخا، بە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی رێگەی گونجاو، ئەنجامی ویستراو، بە یارمەتی خوا، لە ماوەی پێنج یا دە ساڵ دا بە دەس ئەهێنرێ. بۆیە، دڵنیا لە یارمەتی خوا و پشتیوانی پێغەمەرەکان، وا ئەزانین پێویست و گرنگە لە ئێستاوە تەشریعاتی نوێ پێشکەش بکرێ بۆ ئەوەی بگەینە بەرێوەبەرایەتی کارای حکومەتی عوسمانی و ولایەتەکانی. بۆیە سەرەتاکانی تەشریعاتی ویستراو بریتیە لەم سێیە:

1. بەڵێندانی دابینکردنی ئاسایشی تەواوی ژیان، شەرەف و، دارایی.
2. سیستەمێکی رێکخراوی خەملاندنی باج.
3. سیستەمێکی رێکخراوی یەکسان بۆ سەربازگیری هێزی پێویست و ماوەی خزمەت.

لە راستی دا لەم دنیایەدا هیچ شتێ نیە لە ژیان و شەرەف بە نرختر بێ. مرۆڤ چەندە سروشتەکەی دژی توندوتیژی بێ، (چۆن) ئەتوانێ رێگری لە خۆی بکا پەنا بباتە بەر توندوتیژی و، بەوەش حکومەت و وڵاتەکەی بریندار بکا، ئەگەر ژیان و شەرەفی بکەوێتە مەترسیەوە؟ ئەگەر، بە پێچەوانەوە، ئاسایشی تەواوی هەبێ، ئاشکرایە کە دور ناکەوێتەوە لە رێگەکانی دڵسۆزی و هەمو کردەوەکانی بەشدار ئەبێ لە ئاسودەیی حکومەت و خەڵک دا.

ئەگەر ئاسایشی دارایی نەبێ، هەمو کەس بێدەربەست ئەبێ بەرامبەر دەوڵەت و کۆمەڵگاکەی، کەس گوێی خۆی نادادە ئاسودەیی وڵاتەکەی، بە گرفت و پەژارەکانی خۆیەوە سەرقاڵ ئەبێ. بە پێچەوانەوە، ئەگەر مرۆڤ بەرامبەر داراییەکانی هەست بە ئاسایشی تەواو بکا، ئەوسا خەریک ئەبێ بە کاروبارەکانی خۆیەوە و، هەوڵی فراوانکردنیان ئەدا و، بۆچون و خۆشەویستی بۆ دەوڵەتەکەی و کۆمەڵگاکەی بەردەوام گەشە ئەکا و، بە بێگومان ئەبێتە ئەندامێکی بە کەڵکی کۆمەڵگا..

خەملاندنی باج یەکێکە لە گرنگترین بابەتەکانی کە ئەبێ رێک بخرێ. دەوڵەت، بۆ پاراستنی قەڵەمڕەوەکەی، دیارە پێویستی بە راگرتنی سنورەکانێتی. خەرجی ئەویش هەر بە سەپاندنی باج لە سەر رەعیەتەکانی دابین ئەکرێ. سوپاس بۆ خوا، ئیمپراتۆریتەکەمان رزگاری بو لە پاوانکردن. جێبەجێکردنی زەرەربەخشانەی ئیلتیزام، کە هیچ کاتێ ئەنجامێکی بەرباری نەبوە. لە بەر ئەوە پێویستە لە ئێستا بە دواوە، هەمو رەعیەتێکی سەڵتەنەت بە پێی دەسکەوت و کەرەستەکانی باج بدا، بەوەش رزگاری ئەبێ لە سەرانەی ئیزافی. کەواتە پێویستە بە قانونی تایبەتی خەرجیەکانی وڵاتەکەمان و هێزی دەریاییمان دیاری بکرێ.

بابەتە جەنگیەکان، وەکو ئێستا رون کرایەوە لە کارە هەرە گرنگەکانی دەوڵەتە، ئەرکی ناچاریی هەمو خەڵکە سەرباز ئامادە بکەن بۆ پاراستنی نیشتمان بۆیە پێویستە رێنمایی دابنرێ بۆ هەر گروپێ هەمو ناوچەیەک تاسیسی بکا بە پێی پێویستیەکانی کاتەکە و، بۆ کورتکردنەوەی ماوەی خزمەتی سەربازی بۆ چوار یا پێنج ساڵ. قانونێکی وەها کۆتایی دێنێ بەو رێوشوێنەی پێشو کە هێشتا لە کار دایە بۆ

سەربازگیری بێ گوێدانە قەوارەی دانیشتوان. لە هەر ناوچەیەک دا زۆرتر سەربازگیری لە هەندێ شوێن و کەمتر لە هەندێ جێگەی تر. ئەم کردەوەیە کشتوکاڵ و بازرگانی خستۆتە پشێویەکی زیانبەخشەوە.. سەرەڕای ئەوەش. ئەوانەی بۆ هەمو تەمەن کراونەتە سەرباز بۆ خزمەتی سپایی بۆتە مایەی نائارامی و چۆڵبونی وڵات لە دانیشتوان.

بە کورتی. لایەنی کەم ئەم ڕێنماییە دەرئەچێ. دەسەڵات، ئاسودەیی. ئاسایش، ئاشتی. نابێ چاوەڕێ بکرێ. سەرەتا بنەڕەتیەکان ئەبێ ئەوانە بێ کە لە سەرەوە ژمێردران.

بۆیە، لە ئێستا بە دواوە، هەمو تاوانبەپاڵدراوێ ئەبێ ڕێگە بدرێ بۆ گوێلێگیرانی گشتی بە پێی ئەحکامەکانی شەریعەت، دوای لێکۆڵینەوە و پشکنین. بە بێ وتنی حوکمی قانونی نابێ هیچ کەسێ بە نهێنی یا بە ئاشکرا یەکێکی کە، بە ژەهر یا بە شتێکی تر. بکوژێ. نابێ هیچ کەس ڕێ بدرێ دەستدرێژی بکاتە سەر شەرەفی کەسێکی تر، هەمو کەس ئەبێ دارایی پارێزراو بێ و بتوانێ بە ئازادی بە بێ ڕێگری کەسێکی تر، جا هەر کەسێ بێ. بە گەڕی بخا. کەسانی بێ تاوانی خزمی تاوانبار، لە ئەنجامی زەوتکردنی دارایی تاوانبارەکەدا، نابێ بێ بەش بکرێن لە مافی میرات. ڕەعیەتە موسوڵمان و ناموسوڵمانەکانی سەڵتەنەتەکەی ئێمە، بێ جیاوازی. سود لە ئیمتیازە ئیمپراتۆریەکانی ئێمە ئەبینن. لە بەر ئەوە ئێمە ئاسایشی تەواوی ژیان، شەرەف. دارایی، ئەبەخشین بە هەمو دانیشتوانی ئیمپراتۆریەتەکەمان بە پێی قانونی داسکراو.

وەکو بۆ خاڵەکانی تر، بڕیارەکان ئەبێ بە زۆرایەتی دەنگ بدرێن. بۆ ئەم ئەنجامە، ئەندامەکانی "مەجلیسی ئەحکامی عەدلیە"، ئەگەر بە پێویست زانرا، ئەندامی نوێی بۆ زیاد ئەکرێ، بەوانەی لە ڕۆژانی دیاریکراودا بەشدار بن وەزیرەکانی خۆمان و کاربەدەستانی باڵای ئیمپراتۆری، بڕیار ئەدەین، کۆ ئەبنەوە بۆ مەبەستی دارشتنی قانون بۆ ڕێکخستنی ئاسایشی ژیان و دارایی و خەملاندنی باج. هەرکەسێ بەشداری مەجلیس بکا بیروباوەڕ و ئامۆژگاریەکانی بە ئازادی دەرئەبڕێ.

# هەمەوەند (بە نمونە)

لە دوای کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی خۆجێیی - کوردی لە قەڵەمڕەوی بابان دا، دەسەڵاتی بێگانەی تورکی جێگەی گرتەوە. ئیسماعیل پاشا، جەنەراڵێکی ئۆردوی عوسمانی، دانرا بە یەکەم قایمقامی سلێمانی و، ڕاستەوخۆ بەسترایەوە بە والی بەغدادەوە. لەوە بەدوا تا داگیرکردنی باشوری کوردستان لە لایەن هێزی بەریتانیەوە لە جەنگی جیهانی یەکەم دا هەمیشە قایمقام و دواتر موتەسەریفەکانی لیوای سلێمانی بە دوای یەک دا هەمو تورک بون. *(بۆزانینی ناوی موتەسەریفەکانی تورک بڕوانە: زکی، تاریخی سلێمانی، ل 202 - 204)*

بە پێی تەشکیلاتی ئیداریی تورک باشوری کوردستان بەمجۆرە دابەش کرا بو:

- لیوای سلێمانی پێک هات بو لە قەزاکانی: گولعەنبەر (خورماڵ)، بازیان، شارباژێڕ، قەرەداغ، مەرگە، هەڵەبجە.
- لیوای کەرکوک پێک هات بو لە قەزاکانی: ڕەواندز، ئەربیل، سەلاحیە (کفری)، کۆیە، ڕانیە.
- لیوای موسڵ پێک هات بو لە قەزاکانی: موسڵ، ئامێدی، زاخۆ، سنجار، دهۆک، ئاکرێ.
- قەزای خانەقین بەسترا بوەوە بە لیوای بەغدادەوە.

*(عزاوی، 168/7)*

داوودەزگای بابان، سەرەڕای هەمو کەموکوڕیەکانی و، ململانێی خۆبەخۆیان، هەڵگەڕانەوەیان لە دەسەڵاتی عوسمانی و قاجاری و، هێنانی ئۆردوی تورک و لەشکری قاجاری بۆ سەر یەکتری، دەسەڵاتێکی کوردی بو، لە لایەن دانیشتوانی ناوچەکەوە قبوڵ کرا بو. بە نەمانی ئەم، بۆشایی دەسەڵات دروست بو. ئەگەرچی شێخانی تەریقەتی نەقشبەندی و قادری هەلیان بۆ ڕەخسا کەڵک لەم بۆشاییە وەربگرن، بەڵام هەرگیز نە بە ئەوان و نە بە کاربەدەستانی تورک پڕ نەکرایەوە. ئاسایش کە مەرجی یەکەمی گەشەکردنی ئابوری و ئاوەدانکردنەوەی وڵاتە، دابین نە کرا.

لە ڕوباوەکانی نیوەی دوەمی سەدەی نۆزدەهەم دا تا یەکەمین جەنگی جیهانی. یەکێ لەو دیاردانەی کە لە ناوچەی سلێمانی، بە تایبەتی سنوری پێشوی میرایەتی بابان دوبارە بۆتەوە، ڕێگری و جەردەیی و ڕوتکردنەوەی کاروان بوە. زۆری خێڵەکانی ناوچەکە بە ئاشکرا یان بە نهێنی ئەم کارەیان کردوە. لە ناو ئەو خێڵانەدا، ڕەنگە لە هەمویان زیاتر باسی هەمەوەند بکرێت.

هەمەوەند، وەکو خۆیان ئەگێڕنەوە، لە "خوداد" ی باپیرە گەورەیانەوە دەس پێ ئەکا کە چوار کوڕی هەبوە بە ناوەکانی ڕەمەزان، ڕەشید، سەفەر و یادگار، کە بون بە ناوکی پێکهێنانی تیرە سەرەکیەکانی ڕەمەوەند، ڕەشەوەن، سەفەرەوەند، چەلەبی بەگزادە.

هەمەوەند، کە نوسەرانی ئێرانی بە "ئەحمەدەوەند" ناویان بردوە، لە چاو هەندێ ئێلی تری ناوچەکەدا بە ژمارە کەمتربون. ڕیچ کە ساڵی 1820 سەردانی سلێمانی کردوە و ئاماری ئێلەکانی ناوچەکەی تۆمار کردوە، ژمارەی ئێلی هەمەوەندی بە 200 خێزان داناوە و، لە ڕیزی ئێلە ڕەوەندەکان دا ژماردونی. بە درێژایی گەشتەکەی لە بەغدادەوە بۆ سلێمانی و لە گەڕانەوەی دا لە سلێمانیەوە بۆ بەغداد، باسی مەترسی هەمەوەندی نەکردوە. پێ ئەچێ لەو سەردەمەدا ئارام و هێمن بوبن، هیچ کارێکی ئەوتۆیان نەکردبێ ببێتە هۆی پەشێوانی ئاسایشی ڕێگاکان.

کە میرایەتی بابان ڕوخاوە و عەزیز بەگی بابان ویستویەتی لەشکری عوسمانی بە شەڕ لە سلێمانی دەر بکا (1266 ک)، بەشێ لە هێزەکەی هەمەوەند بوە و، پێ ئەچێ عەزیز بەگ کە دوای شکانی لە ناوشاری سلێمانی کشاوەتەوە بۆ ناوچەی زەهاو، پشتنەستور بوبێ بە هەمەوەند، کە شارەزای ناوچەی زەهاو بون. *(عبدالقادر ابن رستم البابانی، تاریخ و جغرافیای کردستان موسوم به: سیر الاکراد، باهتمام محمد رؤوف توکلی، تهران 1366 ش: 169)* عەزیز بەگی بابان سەرەنجام خۆی داوە بە دەست عوسمانیەوە، لە کوردستان دورخراوەتەوە. بەڵام هەمەوەند بە یاخێتی ماونەتەوە. بە دوای ئەوەدا ئیتر بەردەوام لە دۆخی یاخیبون و بەرەنگاری دەسەڵاتی عوسمانی و ئێرانی دا بون. دوای ئەم ڕوداوە ئیتر بەردەوام ناوی ئەم هۆزە وەکو فاکتەری نائارامی و پەشێوانی ئاسایشی ناوچەیەکی فراوان، باس کراوە.

هەمەوەند لە ناوچەیەکی دیاریکراودا نیشتەجێ و جێگیر نەبون. لە نێوان بازیان - خانەقین - قەسری شیرین - کرماشان دا جموجوڵیان کردوە. زۆر جار بۆ ڕاووڕوت و تاڵان پەلیان بۆ ئەم لا و ئەولاش کێشاوە. هیچ نیشانەیەک نیە بۆ ئەوەی کشتوکاڵ یان ئاژەڵداری سەرچاوەی داهات و ژیانیان بوبێ. بەڵکو وەکو شەرکەری پیشەیی ژیاون. دوای ڕێککەوتنی دوەمی ئەرزڕۆم (1263 ک) یەکێ بون لە هۆکانی تێکچونی ئاسایشی سنور و کێشەی نێوان حکومەتەکانی قاجاری و عوسمانی. چەند جارێ لە ئاستی ناوچەیی هەردو حکومەت و لە ئاستی ناوەندی هەردو دەوڵەت دا بابەتی گفتوگۆی نێوان هەردولا بون. کە هێزی عوسمانی چۆتە سەریان کشاونەتەوە ناوچەی زەهاوی کرماشان لە دیوی ئێران و کە هێزی ئێرانی چۆتە سەریان گەڕاونەتەوە ناوچەی بازیانی نێوان سلێمانی و کەرکوک لە دیوی عێراق. کە ئێران تەنگی پێ هەڵچنیبون خۆیان بە "ڕەعیەت" ی عوسمانی و، کە عوسمانی تەنگی پێ هەڵچنیبون خۆیان بە "ڕەعیەت" ی ئێرانی داناوە.

## والی بەغداد لە سلێمانی

والی بەغداد ڕەشید پاشا کە نەخۆش کەوت و مرد تەمەنی لە پەنجا تێ نەپەڕی بو. لە جێگەی ئەو لە ئەستەموڵەوە سەرداری ئەکرەم عومەر پاشا دانرا بە والی بەغداد (1274 ک). عومەر پاشا بە ڕەچەڵەک هەنگاری و ناوی میخائیل بوە، لە تەمەنی بیستوهەشت ساڵی دا موسوڵمان بوە، ناوی خۆی گۆڕیوە بە

عومەر. عومەر چۆتە ریزی لەشکری عوسمانیەوە. لە جەنگی قرم دا ئازایەتی زۆری نوانـدوە بـۆیە گەیشـتۆتە پلەیەکی بەرزی سەربازی. عومەر پاشا کە هاتۆتە بەغداد لە گەڵ خـۆی نـزیکەی چـوار هەزار کەسـی هێنـاوە. هەندێکیان لەوانە بون لە جەنگی قرم دا لە گەڵ خۆی بـون. عـومەر پاشـا نێـردراوەتە عیـراق بـۆ سـەپاندنی "سەربازگیری: تەجنیدی ئیجباری". کە ئەوسا پێی وتراوە "عەسکەرنیزام". تەجنیدی ئیجباری بەشـێ بـوە لەو "تەنزیمات" ە کە دەوڵەتی عوسمانی بۆ نوێکردنەوەی خۆی، خەریکی ئەنجامدانی بوە.

سەربازگیری لە ناو خەڵکی عیراق دا، بە تایبەتی لە ناو عەشـائیری عەرەبـی عیـراق دا، زۆر ترسـناک و قێزەون بـوە. رقـی زۆریـان لەم کـارە بـوە و ملیـان نە داوە بـۆ جێبەجێکردنـی. پـێ ئەچـێ عـومەر پاشـا هەوڵی دابێ ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆ. دوای گەیشتنی بە عیراق، لە بەغدادەوە دەستی پـێ کـردوە. بـۆ ئەوەی کارەکەی ئاسان بکا، پێشەکی پارەی بە سەر زاناکانی بەغدادا بەشیوەتەوە. هەر یەکەیـان بە گـوێرەی پـلەکەی پارەی داوەتێ. ئینجا کۆبـونەوەی پـێ کـردون و فەرمـانەکەی بـۆ خوێنـدونەتەوە. زاناکـان پێشـوازییان لە فەرمانەکە کردوە. بۆ دەربرینی گوێڕایەڵی و پشتیوانیی جێبەجێکردنی فەرمانەکە، کورەکـانی خۆیـان هێنـاوە کردویانە بە عەسکەرنیزام. لە پێش هەمویانەوە محەمەد فەیزی زەهاوی، موفتی عیـراق، کـوڕێکی خـۆی داخـل کردوە. ئەوانی تریش چاویان لەو کردوە. بەوجۆرە لە چەند رۆژێک دا لە بەغـداد نـزیکەی 500 کەسـی کـۆ کردۆتەوە.

سەرکەوتنی کارەکەی لە بەغداد هانی داوە لە ناوچەکانی تریش هەمان کار دەست پێ بکـا. وایزانـی لە شوێنەکانی تریش سـەرکەوتو ئەبـێ. بەڵام ئەوەی لە بەغـداد بـۆی چـۆتە سـەر لە شـوێنەکانی تـری عیـراق روبەروی بەرگری و بەرەنگاری بوە. لە ناو خێڵە عەرەبیەکانی دیالە، حلە، نەجەف، کەربەلا، دیـوانیە، سـەماوە، شامیە دا.. یاخیبون و هەڵاتن و مانگرتن دەستی پێ کردوە. عومەر پاشا لە بـاتی هەوڵـی نوانـدنی نەرمـی و رازیکردن پەنای بردوە بۆ بە کار هێنانی زەبروزەنگ و، لەشکرکێشی یەک لە سەر یەک بۆ سەر ناوچەکان و خێڵەکان. ویستویەتی بە زۆر بیانهێنێتە ژێر باری گوێڕایەڵی. عومەر پاشا زەبروزەنگ و تونـدوتیژیی زۆری بە کار هێناوە و، بۆ هەر ناوچەیەک ژمارەیەک عەسکەرنیزامی دیاری کردوە کە پێویست بوە ئامادەی بـکەن. بەڵام کارەکانی ئەنجامی خواستراوی بە دەس نە هێناوە.

لەو کاتەدا کە ئەمان خەریکی ئەمە بون، ناسرەدین شا بـۆ گەشـتوگوزار سـەردانی سـنەی کـردوە. لەم گەشتەدا زیاتر لە پێنج هەزار کەسی لە گەڵ بوە. خەڵکی سنورەکان گومانی ئەوەیان کـردوە ئێـران گەرەکێتـی کەڵـک لە نائـارامی نـاوخۆی عیـراق وەربگـرێ. عـومەر پاشـا بەرەو سـلێمانی چـوە. تـا ئەو گەیشـتوە شـا گەڕاوەتەوە تاران و مەترسیەکەیان رەویوەتەوە.

عـومەر پاشـا چەنـد رۆژێ لە سـلێمانی مـاوەتەوە. لە سـلێمانیش هەوڵـی داوە "تەجنیـدی ئیجبـاری" بسەپێنێ. ژمارەی عەسکەر نیزامی بۆ هەر یەکێ لە ناوچەکان و خێڵەکان دیـاری کـردوە. بـۆ ئـازوقە و پـارە تەنگی بە دانیشتوانی ناوچەکە هەڵچنیوە، بە زۆر لێی سەندون. بۆ نمونە داوای عەسکەر نیزامی لە شێخ عەلـی عەبابەیلێ، مودیری قەزای گولعەنبەر کردوە. شێخ عەلی بۆ چارەسەر چۆتە بیارە بۆ لای شێخ عوسـمان ترسـی خۆی و پەرێشانی وڵاتەکەی دەربڕیوە. *(ریاض المشتاقین: 335)*

هەندێ لە هەمەوەندی گرتوە و بێ رەزامەندی دەزگاکانی سەروی خۆی ئیعـدامی کـردون. دوای چەنـد رۆژێ بە شەو سلێمانی بە جێ هێشتوە. وا بڵاو بۆتەوە کە چۆتە سەر خێڵی هەمەوەند و جـاف. راسـتیەکەی هەواڵی یاخیبونی هەندێ عەشیرەتی عەرەبـی پـێ گەیشـتوە و بە پەلە گەڕاوەتەوە بەغـداد بـۆ سـەرکوتکردنی ئەوان. بەڵام دوای چەنـد رۆژێ فەرمـانی عەزلـی دەرچـوە (1276 ک). کەمتـر لە دو سـاڵ لە والیەتـی دا ماوەتەوە.

لە بارەی هۆی عەزل کردنیەوە قسەی جیاواز هەیە:

هەندێک ئەڵێن: لە سۆنگەی هەڵواسینی گروپێ هەمەوەندەوە بوە کە بێ وەرگرتنی ئیزنی مەقاماتی بەرزی دەوڵەتەکەی لە سێدارەی داون. گۆیا مەترسییان هەبوە کە هەمەوەند پەنا بۆ ئێران ببەن و ببنە هاووڵاتی ئێران. لەو سەردەمەدا هێشتا کێشەی جیاکردنەوەی ناوچە سنوریەکان و یەکلاییکردنەوەی "تەبەعیەت" ی هەندێ لەو خێڵانەی لە نێوان ئێران و عوسمانی دا ناکۆک بون. چارەسەر نە کرا بون. بە پێی مادەی هەشتەمی ڕێککەوتننامەی ئەرزرۆمی دوەم (1263 ک) ئازادی درا بو بەو خێڵانە یەکێ لەم دو دەوڵەتە هەڵبژێرن. ڕەنگە هەر بۆ ئەو مەبەستەش بوبێ لە نزیک مەریوان لە گەڵ ئەمانوڵا خانی والی ی ئەردەڵان یەکترییان دی بێ.

*(تحفەی ناصری: 264. حدیقەی ناصری: 198)*

هەندێکی تر ئەڵێن: لابراوە لە بەر ئەوەی لە ئەرکەکانی دا سەرکەوتو نەبوە. بە هۆی بەکارهێنانی توندوتیژیەوە بەرامبەر خەڵکی عیراق. نارەزایی و پشێوی و یاخیبون دژی دەوڵەت زیادی کردوە. بە لابردنی ئەو. ویستویانە ناوچەکە ئارام بکەنەوە.

*بۆ ئاگاداری زیاتر دەربارەی ئەم بابەتە بڕوانە:*
*الدکتور علی الوردی: لمحات اجتماعية من تاريخ العراق. الجزء الثاني. (ص 224 - 232)*
*عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين. الجزء السابع. (ص 116 - 127)*

شوێنی ژیان و جوڵانی هەمەوەند ناوچەیەکی فراوانی گرتۆتەوە کە گرنگی بازرگانی. ئایینی و سیاسی. هەبوە. چ لە باکوری عیراق دا و چ لە نێوان ئێران و عیراق دا. لەوانە:

- ڕێگەی کاروانە بازرگانیەکانی نێوان سلێمانی - کەرکوک
- ڕێگەی کاروانە بازرگانیەکانی نێوان سلێمانی - بەغداد
- ڕێگەی کاروانە بازرگانیەکانی نێوان کرماشان - بەغداد
- ڕێگەی کاروانەکانی زائیرانی ئێرانی لە نێوان کرماشان - پیرۆزگاکانی شیعە لە کازمیە. سامەڕا. نەجەف و کەربەلا.

هەمو ئەم ڕێگا و شوێنانە بەردەوام لە ژێر هەڕەشەی تالانکردن. ڕوتکردنەوە. کوشتن دا بون. نەیانتوانیوە بە هێمنی و بە بێ ترسی پەلاماری جەردەی هەمەوەند بە ڕێگاکانی خۆیان دا بڕۆن. لە بەر ئەوە هەر والیەک بۆ بەغداد دانرابێ یەکێ لە خەمەکانی. دابینکردنی ئاسایشی ئەو ناوچانە بوە کە مەترسی هەمەوەندیان لە سەر بوە و. چارەسەری کێشەی سەلامەتی ڕێگا و بان بوە. بۆیە هەر والیەک کە دانراوە هەوڵی چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەی داوە. هەم بە ڕێگەی "عەفو" کردن و قسەی خۆش و هەندێ جار دامەزراندنیان بە زەفتیە و ئەفسەر لە ڕیزی هێزەکانی عوسمانی دا و. هەم لە ڕێگەی بەکارهێنانی زەبروزەنگەوە. لە ڕێگەی لەشکرکێشی گەورە و پەلاماردان و کوشتن و گرتن و ئیعدام کردنەوە. بێ ئەوەی هیچکامیان ئەنجامی ویستراوی دابێ بە دەستەوە.

ساڵی 1274 ک سەرداری ئەکرەم عومەر پاشا کراوەتە والی ی بەغداد.

لە کاتی هاتنی دا بۆ سلێمانی هێزی ناردۆتە سەریان چەند کەسێکی لێ گرتون و ئیعدامی کردون. بەڵام کێشەکەی بۆ چارەسەر نەکراوە بەڵکو بە سەر خۆی دا شکاوەتەوە.

ساڵی 1286 ک مەدحەت پاشا کراوەتە والی ی عیراق.

مەدحەت پاشا بە باوکی ئازادیخوازان و بە پێشەوای بزوتنەوەی چاکسازی ناسراوە. یەکێ لە کارەکانی دامەزراندنی چاپخانە و دەرکردنی رۆژنامەی الزوراء بوە. الزوراء، یەکەمین رۆژنامەی عیراق، بە تورکی و عەرەبی لە 5 ی رەبیعولئەوەلی ساڵی 1286 ک دەوە دەستی کردوە بە دەرچون. ئەم رۆژنامەیە سەرچاوەیەکی نوسراوی دەستی یەکەمی هەواڵەکانی هەمەوەندە. هەواڵەکانی لە باری سەرنجی حکومەتەوە گێڕاوەتەوە، بەڵام ئەشێ کەڵک لە زانیاریەکانی وەر بگیرێ.

یەکێکی تر لە کارەکانی مەدحەت پاشا هەوڵدان بوە خێڵە کۆچەرەکان نیشتەجێ بکا و بەرەو بە بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ بدا. بۆئەوەی سەرانی خێڵەکان و جوتیارەکان هان بدا، زەوی کشتوکاڵ و لەوەڕگای، بە نرخی هەرزان، بۆ تاپۆ ئەکردن. ئەمەش وەکو سەربازگیری لە لایەن خێڵە کۆچەرەکان و سەرۆکەکانیانەوە بەرەنگاری ئەکرا. پێیان وابو، ئەگەر لە شوێنێک دا جێگیر بن، دەسەڵاتی حکومەت بە سەریانەوە بەهێز ئەبێ، بە ئاسانی ئەتوانێ راپێچ بکرێن بۆ سەربازی، باجی جۆراوجۆریان لێ بسەنرێ، لە کاتی سەرپێچی دا بە ئاسانی دەستی سزای حکومەتیان ئەگاتێ. لە هەموی گرنگتر لە نیشتەجێ بونی خێل دا دەسەڵاتی سەرانی خێڵەکە و رایەڵەی پەیوەندی ناوخۆی رێکخراوەی خێڵایەتی لاواز و، لە بەرامبەردا دەسەڵاتی کاربەدەستانی حکومەت بە هێز ئەبێ. هەندێ لە سەرانی خێڵەکان تەماع گرتونی زەوی خۆیان و هی شوێنی دورتریشیان بە ناوی خۆیانەوە تۆمار کردوە.

مەدحەت پاشا بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوچەکە و رێبڕین لە هەڵاتنی یاخییان بەرەو ئێران، هەندێ قەڵا و بنکەی جەنگی لە سەر سنوری ئێران دروست کردوە. یەکێ لەوانە لە زەنگاباد بوە. بەڵام ئێران بۆ ئەم مەبەستە هاوکاریەکی ئەوتۆیان ئەکردوە. ناوچەکە بۆ بەزاندنی سنور بە کراوەیی ماوەتەوە.

مەدحەت پاشا بۆ سەرکوتکردنی هەمەوەند و دانانی سنورێ بۆ دەستدرێژیەکانیان چەند جارێ هێزی ناردۆتە سەریان:

- هێزێک چۆتە سەر محەمەد میکائیل، یەکێ لە سەرانی هەمەوەند. لەو شەڕەدا ئەفسەرێک و دو سەرباز کوژراون. محەمەد میکائیل بە بریندارێ دەرباز بوە، دواتر مردوە.
- هێزێک چۆتە سەر بەچەی شیرین، یەکێکی کە لە سەرانی هەمەوەند. بەڵام دەرباز بوە.
- هێزێک چۆتە سەر بەچەی ئەمین، یەکێکی کە لە سەرانی هەمەوەند. بەچەی ئەمین و هاورێکانی لەو ماوەیەدا کاروانێکیان لە لای خانەقین روت کرد بوەوە. لەم شەڕەدا عەبدوڵا بەگ، سەرۆکی عەسکەری قزرابات (سەعدیە) و سووەیلم لە عەشیرەتی عەرەبیی رەبیعە بریندار بون. بەچەی ئەمین و دو لە پیاوەکانی کوژراون و دو کەسی تر لە پیاوەکانی بە ناوی حەمەڕەش و حەمە ساڵح بە چەکەوە گیراون. شەش ئەسپیان لێ گرتون و تاڵانیەکانیان لێ سەندونەتەوە. گیراوەکان دراون بە دادگا.
- هێزێکی تریش چۆتە سەر تاقمێکی تریان، کە لە دەوری کەرکوک کاروانێکیان روت کردبوەوە. سێ کەسیان لێ گرتون و دراونەتە دادگا.

لە ئەنجامی ئەم هێرشانەدا هەمەوەند ناچار بون ناوچەکە بە جێ بهێڵن رو بکەنە ناوچەی زەهاو لە ئێران کە سەر بە ناوچەی کرماشان بوە.

مەدحەت پاشاش وەکو والیەکانی پێش خۆی توشی هەڵگەڕانەوەی عەشیرەتەکان و شەڕوشۆڕی بەردەوامی نێوان هێزەکانی حکومەت و یاخییانی ئێلەکان بوە. ئەم کێشەیە بە چارەسەرنەکراوی بە میرات بۆ ئەو ماوەتەوە. ئەویش بە میرات بۆ والیەکانی دوای خۆی بە جێی هێشتوە.

**کێشەی هەمەوەند یەکێ بوە لە بابەتەکانی گفتوگۆی عوسمانی و ئیرانی.**

ساڵی 1289 ک محەمەد رەئوف پاشا لە جێگەی مەدحەت پاشا کراوەتە والی عیراق.

والی عیراق ویستویەتی هەمەوەند تێکەڵاوی هێزەکانی بکا. فەقێ قادری هەمەوەنـد خـۆی بە دەسـتەوە داوە و چۆتە بەغداد. جوکل و ئەمین پاخر و هاوکارەکانیان تاوانبـار بـون بە راووروت و کوشـتن. بڕیـاری ئیعدامیان درا بو بەڵام والی لێیان خوش بوە کردونی بە زەبتیە و ئەفسەر.

**فەقێ قادر و بەرهەمی زیندان**

فەقـێ قـادر، کە لە تیـرەی بەگـزادەی چەلەبـی بـوە، یەکـێ بـوە لە سـەرۆکەکانی هەمەوەنـد. پیـاوێکی خوێندەوار و، لە چاو سەردەمی خۆی دا رۆشنبیر و شارەزا بوە. بۆ ئەوەی هەمەوەند هـێمن بکـرێتەوە، وەک ئەڵێن، ماوەیەک کراوەتە سەرپەرشتی دازیان. دوایی گیراوە ماوەیەکی درێژ لە زیندانەکانی بەغداد و موسڵ و کەرکـوک دا مـاوەتەوە. سـەرەنجام لە گەڵ ئـێلەکەی دور خـراوەتەوە بـۆ دەرەوەی وڵات. ئەڵـێن لە بـاکوری ئەفەریقا کۆچی دوایی کردوە.

کۆمەڵێ کتێبی لە سەر بابەتی ئاینی و فەلسەفی: میعراجنامە، دروننامە، پەندنامە، جەنگنـامەی بەهـار و زستان، بە شیعر هۆنیوەتەوە. هەروەهـا شـیعری "ویژدانـی" ی جـوانی هەیە. هەمـو بەرهەمەکـانی بە زاراوی گۆران و بەشێکی لە زیندان دا داناوە. جێگەی پرسیارە کەسێ کە لە ناو ئەو هەلومەرجە نائاسـاییە ئـاڵۆزەدا ژیابێ، هەلی خوێندنی بۆ هەڵکەوتبێ. لە شیعرەکانی دا پێڕەوی مەدرەسەی ئەدەبیـی گـۆرانی کـردوە. ئەشـێ نوسینەکانی بە ئەدەبی زیندان دابنرێن. لە بەرهەمەکانی دا گلەیی لە بەختی خۆی ئەکـا. رەخـنە لە جـوامێر و هاوتیرەکانی تری ئەگرێ. هێرشی توند ئەکاتە سەر داوودەزگاکانی عوسمانی.

لە هۆنراوەیەکی دا وتویەتی:

| | |
|---|---|
| ئەر جــوامێر مەغــرور، ئەر بــرا بــێ ڕا | ئەر کــاک عەبــدوڵا عەزیــز بــێ تەبــا |
| ئەر حــاکم ئەپــرس، ئەر قەوم ئەشــنەوا | ئەر رەعــیە رەهــزەن نە قەحــت و غەلا |
| بــێ تەوفیــق حەق، بــێ یەد بەیــزا | چێش مەیۆ جە دەسـت یەک فەرد تەنیـا |
| یــونس وار جە قەوم وێــم کەردم فیــرار | بــیم بە قــوت حــوت تــورک دەریابــار |
| فیرار بیم جە قەوم چـون بەرە جە گـورگ | ئەزانــام جە گــورگ بەتەر مەبــۆ تــورک (ل 25) |

لە هۆنراوەیەکی تری دا لە باسی داوودەزگاکانی عوسمانی دا وتویەتی:

| | |
|---|---|
| کەس نــیەن واچــۆ مەر چێشــەن گونــاش | هەردەم بە رەنگــێ مەدەری ســـزاش |
| والــی مــوخەنەس، قومانــدار ئەحــمەق | شێخ عەلی خائیف، دەفتەردار سەرشـەق |
| قــازی بەدعەمەل، مــوفتی بــێ کــارە | روشدی بەگ بێ روشد، ئەرکان پەتیارە |
| مــودەعیی عمــوم زەرفــش خــاڵیەن | رەئــــــیس جەزا لائوبــــــالیەن |
| غەیــر خوداوەنــد فەرد فەرەیــادرەس | حەرف خەیر ئەسڵێن نـیەن جە لای کەس (ل 26) |

*بۆ ئاگاداری زیاتر لە سەر ئەم بابەتە بڕوانە:*
*فاتح عبدالکریم و عبدالکریم مدرس: کۆمەڵە هۆنراوەکانی فەقێ قادری هەمەوەند. بەغداد.*

ساڵی 1290 ک جەردەکانی هەمەوەنـد چـونەتەوە سـەر پیشـە کۆنەکەیـان. والـی هێـزی عەسـکەری ناردۆتە سەریان. کشاونەتەوە بۆ ئیران.

**ساڵی 1295 ک قەدری پاشا کراوەتە والیی عیراق.**

هەمەوەند لە ئێران گەڕاونەتەوە "دەخـالەت" یـان کـردوە. دەخالەتەکەیـان قوبـوڵ کـراوە. بەڵام سـاڵی 1296 ک تاقمێکیان پەلاماری سامەڕایان داوە و، براکەی جوامێر ئاغای هەمەوەند و نەجم عەبـدوڵای ئاغـای بەیات لە رێگەی قزرابات (شاری سەعدیەی ئێستا) کاروانێکیان روت کردوتەوە.

والیەکانی بەغداد ماوەی درێژ لە ولایەت دا نە هێڵراونەتەوە. دوای محەمەد رەئوف پاشا، عەبدورەحمان پاشا دانراوە (1292 ک)، پاش دو ساڵ ئەم لابراوە عاکیف پاشا لە جێی دانراوە (1294 ک). عاکیف پاشا لابراوە، قەدری پاشا لە جێی دانراوە (1295 ک)، قەدری پاشا لابراوە عەبـدورەحمان پاشـا بـۆ جـاری دوەم دانراوە (1296 ک). ئەم لابراوە تەقیەدین پاشا دانراوە (1297 ک).

لە سەردەمی هەمو ئەم والیانەدا باندەکانی هەمەوەند لە جموجوڵ نەکەوتون، بەڵکـو بـۆ فراوانکردنـی سنوری جموجوڵ و دەسدرێژیەکانیان کەڵکیان لە لاوازیی دەسـەڵاتی حکـومەت وەرگرتـوە. بەردەوام بـون لە سەر راووڕوت و رێگری و تاڵان. هەمو والیەکیش چەندی پێ کرابێ، لە رێـگەی لەشکرکێشـی و بەکارهێنـانی زەبـروزەنگەوە یـان لە رێـگەی دوانـدنی نەرمیـی، قبـوڵی دەخـالەت و چاوپۆشـی لە کردەوەکانیـان، بـۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەی هەمەوەند درێخییان نەکردوە. بەڵام سـەرەڕای کـورتی مـاوەی مانەوەیـان، کێشـە و گیروگرفتەکانی عیراق ئەوەندە زۆر و ئـاڵۆز بـون، نەیـان پەرژاوە، مـاوەی تەواو و هێـزی تەواو و خەرجـی تەواو، بۆ ئەو مەبەستە تەرخان بکەن و هاوئاهەنگی جەنگی لە گەڵ کاربەدەستانی ئێرانی بکەن، تا تەقیەدین پاشا بۆتە والیی عیراق.

ساڵی 1297 ک تەقیەدین پاشا لە جێگەی عەبدورحمان پاشا دانراوە بە والیی عیراق.

ساڵی 1299 ک والیی موسڵ، محەمەد مونیر پاشا تەنگـی بە هەمەوەنـد هەڵچنیـوە، دەخالەتیـان پـێ کـردوە قبـوڵی کـردوە. بەڵام دەسـتیان هەڵنەگرتـوە لە تـاڵان و راووڕوت. وەکیلـی والـی چـۆتە سـەریان جەزرەبەیەکی توندی لێ داون، هەوڵی گرتنی داون. دیسان جوامێر و هەندێ لە پیاوەکانی هەڵاتون بۆ ئێران.

ساڵی 1301 ک والیی بەغداد تەقیەدین پاشا، موشیر محەمەد فازیل پاشای داغستانی راسـپاردوە بـۆ راونانی تاقمێ لە هەمەوەند کە بە سەرۆکایەتی بەچەی چاوشین و مەحمود خلە پەزە و حەمەی مـام سـلێمان لە گەڵ عەشیرەتەکانی جبور و کەرەوی لە نزیک مەندەلی کرد بویان بە شەر.

*بۆ ئاگاداری زیاتر دەربارەی ئەم بابەتە بڕوانە:*

*عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين. الجزء السـابع و الجـزء الثـامن. رمـادة: هماونـد فـي فهـرس الشـعوب والقبائل والاسر)*

## شەڕ بۆ تۆڵەسەندن

هەندێ لە سەرانی زەنگنە بە فێڵ یەکێ لە سەرۆکەکانی هەمەوەنـدیان کوشـتوە. ئەم کـارە هەمەوەنـدی وروژاندوە. لە تۆڵەی ئەوەدا لە خانی ئیبراهیم خانچی (لە نـاوچەی کفـری) پەلامـاری ئێلـی زەنگنەیـان داوە. زەنگنە لەم شەڕەدا شکاون کشاونەتەوە بۆ شێخ لەنگەر. هەمەوەند شوێنیان کەوتون. زەنگـنە بـۆ پارێزگـاری خۆیان داوای یارمەتییان لە حکومەت کردوە. حکومەت هێزێکی تێکەڵاوی بۆ راونـانی هەمەوەنـد سـاز داوە. هێزێک بە سەرکردایەتی عەبدوڵا ئەفەندی خـانەقینی کە بریتـی بـوە لە تابورێـک پیـادە و 60 سـوار و 40 ئێسترسوار و دو تۆپی شاخی چون بۆ شێخ لەنگەر، هێزێکی تریش بە سەرکردایەتی قائیمقـامی سـەلاحیە کە بریتی بوە لە 750 سوار و 8 ژاندرمە و عەشیرەتی زەند و پاڵانی و هەندێ لە سوارەی تاڵەبانی و باجەڵان. ئەم دو هێزە لە شێخ لەنگەر یەکیان گرتۆتەوە.

هەمەوەند بەرەنگاری ئەم هێزەی کردوە. لە دواوە هەڵی کوتاوەتە سەری. تۆپچی و قوماندانی تابوری پیادە و هەمو سوارەی سەلاحیە (ناوی ئەوسای کفری بوە) ی ئەسیر کردوە. دوای ئەوەی چەکەکانیان لێ سەندون گیراوەکانیان بەرەڵا کردوە. هەمەوەند لە گەڕانەوەدا توشی دو تابور پیادەی تر هاتون کە ئەچون بۆ کەرکوک، هەڵیان کوتاوەتە سەریان و شکاندویانن.

هێزەکانی عوسمانی لە کۆڵ هەمەوەند نە بونەتەوە. لە دوای ئەم روداوانە مەفرەزەیەکی بەهێز لە بەغدادەوە بە سەرکردایەتی ئەدهەم پاشا هاتۆتە سەریان. بریتی بوە لە 8 تابور پیادە، ئاڵا و نیوێک سوارە، تابورێکی تۆپچی شاخی، لە کۆک تەپە توشی هەمەوەند بون، لەو کاتەدا خەریکی پەڕاندنەوەی ماڵ و خێزانەکانیان بون بەرەو ئیران. شەڕێکی قورس روی داوە. هەمەوەند گەمارۆی مەفرەزەکەی داوە و ئەدهەم پاشا ئەسیر کراوە. ماڵەکانیان دەرباز کردوە. ئەدهەم پاشاش بەر دراوە. هەمەوەند کشاونەتەوە بۆ زەهاو. (زکی: 193)

## لەشکرکێشیی هاوبەش

هەمەوەند، شارەزای تاکتیکی جەنگ بون. هەروەها شارەزای جوگرافیای سروشتی و مرۆیی ناوچەکە بون، بۆیە لە شەڕەکان دا سەرکەوتو بون. وڵاخ و کەلوپەل و چەکیان گرتوە. زۆرجار شەڕکەری زۆریان لە هێزەکانی حکومەتی عوسمانی و ئیرانی و لە عەشائیر بە دیل گرتوە. بە دەگمەن وا بوە کەسێکیان لێ کوشت بن، هەمیشە دیلەکانیان روت کردۆتەوە و ئازادیان کردون. بەڵام تاڵانیەکانیان بە دەسکەوتی خۆیان زانیوە.

هەمەوەند دو ساڵێ لەو ناوچەیەدا ماونەتەوە. بەڵام لە هەردو دیوی ئیران و عوسمانی دانیشتوانی ناوچەکەیان بێزار و هەراسان کردوە. هەردو حکومەت رێک کەوتون پێکەوە لەشکرکێشیەکی هاوبەش ئەنجام بدەن بۆ سەرکوتکردنی هەمەوەند.

ئیران هێزەکانی بەمجۆرە ساز داوە: دو ئاڵای هەمەدان، ئاڵای زەنگنەی کرماشان، ئاڵای کولیایی و گۆران، دو ئاڵای کرند، عەشیرەتی کەڵهور، سنجاوی، ئەحمەدەوەندی بیهتویی، کە بە پانزە هەزار کەس خەمڵێنراوە.

لە لایەن عوسمانیەوە، بۆ هاوئاهەنگی لە گەڵ هێزەکەی ئیران، هێزێکی گەورە ساز و لە دۆڵی سیروان مۆڵ دراوە.

هەمەوەند بە خۆیان و خێزانەکانیانەوە کشاونەتەوە نزیک دۆڵی عەباسان. خێزانەکانیان لەوێ قایم کردوە. چەکدارەکانیان لە حاجیلەر و سەرتاق لە دەشتی باجەڵان، پەلاماری هێزەکانی ئیرانیان داوە، چەند سەد ئێستریان بە بارەوە لێ گرتون. لەشکری ئیرانیان شکاندوە و هەتا ماهیدەشت راویان ناون. خۆیشیان گەڕاونەتەوە بۆ قۆرەتو و قەسری شیرین.

لەشکری تورک گەڕایەوە چونکە عەشائیری مونتەفیک راپەڕی بون. مەترسی شۆڕشی مونتەفیک بۆ سەر عیراق و بەغداد گەورەتر بو لە هی هەمەوەند، بەڵام سەرکردەی هێزەکەی عوسمانی لە ناوچەکەدا بۆ گفتوگۆ لە گەڵ هەمەوەند مایەوە و. سەرەنجام لە گەڵیان پێک هات بە ئاشتی بگەڕێنەوە شوێنەکانی پێشویان لە بازیان. (زکی: 195)

## شەڕ بۆ پاراستنی داڵدەدراو

حەمە پاشا، سەرۆکی گشتیی هەمو ئێلی جاف، بە هەمو تیرەکانیەوە، نیشتەجێ بونی پەسەند نە کردوە. ویستویەتی بە کۆچەری بمێننەوە. گەرمیان و کوێستان بکەن. بۆ دەربڕینی نارەزایی، تیرەکانی جاف بە کۆمەڵ

کۆچیان کردوە بۆ نزیک کرماشان. کەرەموەیسی، هۆزێکی بچوکی تیرەی شاتری بوە، کە یەکێ لە تیرە سەرەکیەکانی جاف بوە، ئارەزوی نیشتەجێ بونیان دەربڕیوە و، خۆیان بە جیا لە گەڵ کاربەدەستانی بەغداد بۆ نیشتەجێ بون لە شارەزور و، وەرگرتنی زەویەکانی ئەوێ، پێوەندیان لە گەڵ کاربەدەستان دامەزراندوە. لەو کۆچەدا لە گەڵ ئێلی جاف کۆچیان نە کردوە، لە شوێنی خۆیان ماونەتەوە. سەرۆکەکەیان، عەزیزی شاوەیس، پیاوێکی ئازا و سەرکێش بوە. گوێی نە داوەتە فەرمانی حەمە پاشا. کە جاف گەڕاونەتەوە گەرمیان، حەمە پاشا گرتویەتی. لە زیندان دا مردوە. هۆزی کەرەموەیسی باوەڕیان نە کردوە بە دەردی خوا مردبێ. پێیان وابوە لە زیندانەکەی حەمە پاشا دا بۆ ئەوەی لە ناوی بەن دەرمانخوارد کراوە.

کەسوکاری عەزیزی شاوەیس خۆیان ساز داوە بۆ تۆڵە. لە چیمەنی سەمین لە نزیک کفری کە حەمە پاشا بارگەی دانا بو، لە کاتی نوستن دا لە ناو خێوەتەکەی خۆی دا بە خەنجەر کوشتویانە (1299 ک). کوشتنی سەرۆک، تاوانێکی ئەوەندە گەورە بوە بەخشینی نەبوە. کەرەموەیسی خۆیان حەشار داوە. جاف "ئێلجاڕی" ڕاگەیاندوە، واتە هەمو تیرەکان دەستیان داوەتە چەک بۆ تۆڵەی سەرۆکەکەیان و، لە ناوبردنی کەسوکاری عەزیز و هەمو پیاوەکانی کەرەموەیسی.

لەو کاتەدا جوامێر ئاغای هەمەوەند لە دەشتی شیروانە بوە. بکوژەکان رویان کردۆتە دیواخانەکەی ئەو. جوامێر خۆی لەوێ نە بوە، کە بیستویەتی بە پەلە براکەی ناردوە تا دالدەیان نە دەن، دەس بنێن بە رویانەوە، رێگەیان نە دەن داخلی دیواخانەکەیان بین. بەڵام تا براکەی گەیشتوە، بکوژەکان خۆیان گەیاندۆتە ئەوێ و "دەخالەت" یان کردوە. لەم بارەدا نەریتی خێڵ رێگەی نە داوە دەربکرێن. بەڵکو پێویست بوە گیانی دەخیلەکان بە هەر نرخێ بێ، بپارێزرێ. ئەگەر بکرێ سوڵحیان بۆ بکرێ. تەنانەت ئەگەر شەڕی خوێناوی گەورەشی لێ بکەوێتەوە. جوامێر بە ناچاری پەنای داون.

جاف کە پێ ئەزانن، بە سەرکردایەتی مەحمود بەگ (دواتر مەحمود پاشا) کوری حەمە پاشا، بە لەشکرەوە بەرەو شیروانە ئەڕۆن هەڵبکوتنە سەر جوامێر کە دالدەی دوژمنەکەیانی داوە. شەڕی قورس قەوماوە. بەڵام لەشکری جاف نەی توانیوە ئامانجەکەی بەدی بهێنێ. لە شەڕەکەدا سەرکەوتو نەبون. جوامێر و پەنادراوەکان دەرباز بون و رویان کردۆتە ناوچەی زەهاو.

شێخ رەزای تاڵەبانی (1837 - 1910 ز) وێنەی ئەم روداوەی بە چوارینەیەکی کاریکاتێری کێشاوە، وتویەتی:

جەنگ گاهی جوکل و مەحمود بەگ شیروانە بو
ئافەریم مەحمود بەگ شێر وا نەبو
وەقتێ قاسید هات و لێم پرسی: چلۆن بو ئەم شەڕە
وردە وردە بۆی بەیان کردم، کەچی شێر وا نەبو

ئەوەی لێرەدا جێگەی تێ رامانە، شەرکەرانی هەمەوەند کە لە راووروت و تاڵان و کوشتن دا لە هیچ نەسڵەمیونەتەوە، کەچی پێڕەوییان لە هەندێ نەریتی خێڵەکی کردوە لەوانە "دەخالەت" کە لەوانە بوە فەوتان و لە ناوچون بۆ هۆزەکەیان بە دوای خۆی دا بهێنێ.

## چارەنوسی جوامێر ئاغا

جوامێرئاغا، کە بە "جوکل" ناوی دەرکردوە، لە ژێر گوشاری جەنگیی هێزەکانی عوسمانی دا، خۆی و ئێلەکەی دەشتی زەهاو و قەسری شیرین یان کردۆتە بنکەی مانەوە و ژیانی خۆیان. جوامێر ئاغا و هەندێ لە

هاوەڵەکانی چونەتە ئەسفەھان بۆ سەردانی مەسعود میرزا "ظل السلطان". "ظل السلطان"، کوڕە گەورەی ناسرەدین شا، ئەوسا فەرمانفەرمای باشوری ئێران بوە. بە موچەیەکی مانگانە لە قەسری شیرین و زەھاو دالَدەی جوامێر ئاغا و پیاوەکانی داوە. جوامێر ئاغا قەڵایەکی لە قەسری شیرین بنیات ناوە کە بە قەڵای جوامێر ناوی دەرکردوە. دوای ئەوەی ناسرەدین شا، "ظل السلطان" ی لە سەر کارەکانی لابرد و کێشایەوە تاران، جوامێر ئاغا پشتیوانێکی نەماوە. دیسان کەوتۆتەوە ڕێبڕین و ڕێگرتن. ئاسایشی ناوچەکەی تێک داوە.

ساڵی 1302 ک چەند کەسێ لە بنەماڵەی شای ئێران بە ڕێگای کرماشان - قەسری شیرین دا بەرەو پیرۆزگاکانی شیعە لە عیراق بە ڕێ کەوتون. جەردەی ھەمەوەند کە سەر بە جوامێر ئاغا بون ڕێگایان پێ گرتون و ڕوتیان کردونەتەوە. بنەماڵەی شا دریژەیان بە سەفەرەکەیان نە داوە، بەرەو دواوە گەڕاونەتەوە بۆ تاران. سکاڵایان بردۆتە بەر ناسرەدین شا. دەربار‌ی قاجار ئەمەیان بە سوکایەتیەکی گەورە زانیوە بۆ داوبانگ و دەسەڵاتیان. لەم بارەیەوە ھەندێ نامە لە نێوان وەزارەتی دەرەوەی ئێران و سەفارەتی عوسمانی دا لە تاران ئاڵوگۆڕ کراوە و گفتوگۆ ئەنجام دراوە. ناسرەدین شا فەرمانی داوە بە حیسامولمولک، کچەزای فەتحعەلی شا و، حاکمی کرماشان، کێشەی جوامێر ئاغا یەکلایی بکاتەوە و ئاسایشی ڕێگەی کەربەلا بۆ زائیرانی ئێرانی دابین بکا. حکومەتی عوسمانیش قورد ئیسماعیل پاشای دیاربەکری لە گەڵ ئۆردوی بەغداد راسپاردوە ڕێگەکانی گەڕانەوەی بۆ دیوی عیراق لێ بگرێ.

*بۆ ئاگاداری لە ئاڵوگۆڕی نامەکانی نێوان کاربەدەستانی قاجاری و عوسمانی بڕوانە:*
*دفتر مطالعات سیاسی و بین المللی. گزیدە اسناد سیاسی ایران و عثمانی: دورە قاجاریە. جلد دوم. 1369 - تهران. سند شمارە: 376/ 377/ 378.*

## موشیرئاوا

ھەمەوەند ڕێگەی کەرکوک - سلێمانی بەستوە و، شاری سلێمانیشی خستۆتە مەترسیەوە. ئاسایشی ناوچەکەی تێک داوە و، دەستدرێژی کردۆتە سەر کاروان، ڕێبوار، دەوڵەمەند و ھەژار. ھەر کەسێکیان لێ ھەڵکەوتبێ ڕوتیان کردۆتەوە. دەوڵەتی عوسمانی بۆ دانانی سنورێ بۆ ئەم نائارامیە، ھێزێکی بە سەرکردایەتی یەکێ لە جەنەراڵەکانی ئۆردوی تورک ناردۆتە سلێمانی. پلەی موشیری ھەبوە. موشیر قورد ئیسماعیل پاشا بوە، کە بەڕێچەڵەک کوردی دیاربەکر بوە و، لە بەر دڕندایەتی لە شەڕدا نازناوی "قورد" واتە "گورگ" یان داوەتێ. بە دیوێکی تریش دا بۆ ئەوەی ناوەکەی لە "کورد" بچێ. ئەویش لە دەشتێکی بەردەمی سلێمانی دا ئۆردوگایەکی کاتی دامەزراندوە. کردویەتی بە بنکەی کارە جەنگیەکانی دژی ھەمەوەند. لەوساوە ئەو دەشتە کە دوایی بۆتە گەڕەکێکی سلێمانی بە ناوی "موشیرئاوا" وە ناسراوە.

## غەدری ئێرانی

ئێرانیەکان پێشینەیەکی دورودرێژیان ھەیە لە داڕشتنی نەخشەی "سەرەتا تەفرەدان دینجا کوشتن" دا. ئەزمونێکی زۆریان ھەیە لەوەدا بە سوێند و پەیمان، بە بەڵێن و گفت، بە قسەی شیرین، دوژمن و نەیار تەفرە بدەن. ھەڵی بفریوێنن، دڵنیای بکەن تا بیھێننە ناو داوی کوشتنەوە بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەوەی تۆمەتبار بکرێن بە بێبەڵێنی و پەیمانشکێنی، بە بیانوی "مەسڵەحەتی دەوڵەت" ەوە.

کاربەدەستانی ئێرانی لە گەڵ جوامێر ئاغاش بە ھەمان شێوە ڕەفتاریان کرد.

حاکمی کرماشان سەرانی خێڵەکانی کرماشان بۆ راوێژ دەربارەی چارەسەری کێشەی جوامێر ئاغا و هاوەڵەکانی بانگ ئەکا. شامراد خان، کە یەکێ بوە لە سەرانی ئێلی ئەحمەدەوەندی بەهتویی کرماشان، رائەسپێرێ جوامێر بگرێ یا بیکوژێ. داوای لە سەرانی ئێلەکانی زەنگنە، کەڵهوڕ، کولیایی، سنجاوی و گۆران کردوە هاوکاری شامراد بکەن.

شامراد بۆ ئەنجامدانی کارەکەی، نامەیەکی بۆ جوامێر ناردوە. بە سوێند و بەڵێنی حیسامولمولکەوە، کە بۆ راوێژ و پرسوڕا ئەیەوێ سەردانی ئەو و قەسری شیرین بکات، داوای وەڵامی لێ کردوە. جوامێر پشتئەستور بە سوێندی قورئانی حیسامولمولک، رازی ئەبێ. شامراد گروپێ لە پیاوە جەربەزەکانی خێڵەکان هەڵئەبژێرێ و بەرەو لای جوامێر بە رێ ئەکەوێ. شامراد نیازی کوشتنی جوامێری ئەبێ. بۆ ئەوەی کێشەی جوامێر بە بێ شەڕ و پێکادان یەکلایی بکەنەوە و دەس بگرن بە سەر ناوچەکەدا، نەخشەکەی خۆی بۆ هاوکارەکانی رون ئەکاتەوە. کە لە دانیشتنەکەیان دا لە گەڵ جوامێر، شامراد کشتەکی تەزبیحەکەی ئەپچڕێنێ و دەنکەکانی بڵاو ئەبێتەوە، ئەو کاتە هەمو خەریکی کۆکردنەوەی دەنکەکانی تەزبیحەکە بن بۆ ئەوەی جوامێریش مەشغوڵ بێ، ئەوسا ئەم خەنجەرێ لە جوامێر ئەدا و ئەی کوژێ. هەمویان رازی ئەبن بە نەخشەکە.

کە نزیک کەوتنەوە لە قەسری شیرین ئاگاداری جوامێریان کرد، ئەویش چو بۆ پێشوازییان و لە خێوەتی فەرماندەیی دا کۆبونەوە. دوای نان خواردن کە دانیشتن بۆ حەوانەوە بە پێی نەخشەی داڕێژراو شامراد کشتەکی تەزبیحەکەی خۆی پچڕاند و دەنکەکانی بڵاو بوەوە. هەمو کەوتنە کۆکردنەوەی دەنکەکانی. جوامێریش سەری دانەواندوە بۆ ئەوەی بەشدار بێ لە کۆکردنەوەی دەنکەکانی دا. لەو کاتەدا شامراد بە خێرایی هەڵی کێشاوەتە خەنجەر و داوێتی لە سەر دڵی جوامێر و کوشتویەتی (20 ی ئەسفەند ماهی 1276 ی شەمسی). سەری جوامێریان لە لاشەکەی جیا کردۆتەوە. لە هەمان کات دا هێزێکیان ئامادە کردوە دەوری خێزان و پیاوەکانی جوامێریان داوە. ژن و منداڵ و گەورە و پچوکیان گرتون.

سەری جوامێر و گەورەپیاوەکانیان بریوە و کردویانە بە سەری رمەوە. بە سەرکەوتویی گەڕاونەتەوە بۆ کرماشان. حاکمی کرماشان و خەڵک پێشوازییان لێ کردون. کەللەی جوامێریان پڕ کردوە لە کا و بە نیشانەی سەرکەوتن ناردویانە بۆ ناسرەدین شا. شا لە بەرامبەر ئەم کارەدا پلەی سەرتیپی بەخشیوە بە شامراد و ناوچەیەکیشی لە قەسری شیرین بۆ لەوەڕی ئێلەکەی تەرخان کردوە.

*بۆ ئاگاداری زیاتر دەربارەی ئەم رووداوە بڕوانە:*
*حیدر بهتویی: کرد و پراکندگی او در گستره ایران زمین. تهران. فروردین 1377 ه ش. (ص 237 - 253)*
*ادمونذز: کردها. ترکها. عربها. ترجمه ابراهیم یونسی. تهران 1367. (ص 50 - 55)*
*محمد امین زکی: تاریخی سلیمانی و ولاتی. بەغدا 1939. (لاپەڕەکانی 189 - 199)*

## ناوبانگی هەمەوەند

هەمەوەند لە ناو خەڵک دا ناوبانگی باش نە بوە. تەنانەت کەسانێکی وەکو جوامێر و هەندێکی تریان ئاغا و بەگ و لە تیرەی بەگزادەی چەلەبی بون. بەڵام لە بەر بەدناوی بە ناوی جوکل، خلە پەزە، پاخڕ، بەچەی چاوشین و بەچەی ئەمین و بەچەی شیرین، ناو براون. رۆژنامەی زەورائی بەغدادی ئەوەندەی هەواڵی خراپ لە سەر جوامێر ئاغا بڵاو کردۆتەوە لە ناو بەغدادییەکان دا بوە بە باو هەر کەسێ زۆر لاسار و گوێنەگر و شەڕانی بوبێ پێیان وتوە: "فلان صاير جوامير" واتا: "فلان بۆتە جوامێر".

مەحوی (1252 - 1327 ک) کە خۆی موریدی ڕابەری گەورەی تەریقەتی نەقشبەندی شێخ عوسمانی سیراجەدین بوە و، مەلایەکی خاوەن خانەقا بـوە. لە چوارینەیەک دا بەراوردی کـردوە لە نێوان ڕێبڕینـی جەردەیەکی هەمەوەند و دەسبڕینی شێخێکی تەریقەت دا، وتویەتی:

شـێخی هەمەوەنـدێکی ئەدا وەعـز و نەسـیحەت
ئەو قوڕبەسەرەی دابـوە بە فەحش و فەزیـحەت
خۆش هاتە زبان و وتی: تـۆ حەقـتە فەقەت مـن
قوتـاعی تەریقـم، نەکـو قوتـاعی تەریـقەت

دوای ئەم ڕوداوە هەمەوەند توشی شکستێکی گەورە هاتون. دیسان گەڕاونەتەوە بـۆ نـاوچەی قەرەداخ لە دیوی عوسمانی. بە ناچاری دەخالەتیان بە کاربەدەستانی عوسمانی کردوە. محەمەد فازیل پاشای داغستانی بۆیان تێکەوتوە ببەخشرێن. پێ ئەچێ دەسەڵاتی عوسمانی ئیتـر تـوانیبێتی زەفەریـان پـێ ببات. بـۆ ئەوەی کۆتایی بە کێشە دێرینەکەیان بهێنێ، زۆری پیاوە جەربەزە و ناسراوەکانی گرتون و دوری خسـتونەتەوە بـۆ لیبیا لە سەروی ئەفەریقا.

ئەگەرچـی والیەکـانی بەغـداد چەنـدین جـار لەشـکری گەورەیـان نـاردۆتە سـەر هەمەوەنـد، بەڵام لەشکرکێشیەکانی عوسمانی بۆ سەر هەمەوەند، هیچ جارێ ئەنجـامی خواسـتراوی بە دەس نە هێنـاوە. هەمـو جار چەند کەسێکیان لێ کوشتون یـا گرتـون یـا هەڵواسـیون، بەڵام سـەرەنجام نەیـان توانیـوە سـنورێ بـۆ جموجوڵیان دابنێن، کەسایەتیە سەرەکیەکانیان بگرن یا لە ناو ببەن و، هەمو خێڵەکە بە تەواوی ناچـار بـکەن بێنە ژێر باری گوێڕایەڵی و ملکەچکردنەوە بۆ دەسەڵاتی حکومەت، لە بەر ئەوەی:

**یەکەم،** هەمەوەند لە گوند و ئاوایی دیـاریکراودا نیشـتەجێ نەبـون. خۆیـان و خێزانەکانیـان گەڕۆک بون. ماڵەکانیان بە پشتی وڵاخەکانیانەوە بوە. بە ئاسانی توانیویانە لە بەردەم هێرشی گەورەی سـەربازی دا خۆیان لادەن یا بە وردەشەڕ خۆیان دەرباز بکەن و بکشێنەوە بۆ ناوچەیەکی دەرەوەی سنوری هێرشـەکە و سەرەنجام خێزانەکانیان بپەڕێننەوە بۆ دیوی ئێران.

**دوەم،** ڕێکخـراوی خێڵەکـی هەمەوەنـد یەکگرتـو نە بـوە. سـەرۆکایەتیەکی تاقـانەی بەهێـز یـا سەرکردایەتیەکی یەکگرتوی گوێڵێگیراوی نە بوە. تیرەی جیاواز، بگرە باندی جیـاواز بـون. سـەرۆک و گەورەی زۆریان هەبوە. تاقمێکیان لە گەڵ کاربەدەستانی عوسمانی یـان کاربەدەسـتانی ئێرانـی ڕێـک کەوتـون، ژیـانێکی هێمن و جێگیر دابین بکەن، لە هەمان کات دا تاقمێکی تریان ڕێگەیان بە کاروان گرتـوە. هەمویشـیان هەمەوەنـد بون. هەر تاقمێکیان یا هەر باندێکیان کارێکی کرد بێ، هەمویانی پێ تاوانبار کراوە. بۆیە چەند جار گفتوگۆیـان لە گەڵ کاربەدەستانی عوسمانی و لە گەڵ کاربەدەستانی ئێرانی کردوە، نە گەیشتونەتە ئەنجامێکی پەسەند کراو.

بۆچی هیچ والیەکی تری عوسمانی، نە بە خۆشـی و نە بە زۆر، نەی توانیـوە هەمەوەنـد بهێنێـتە ژێـر ڕکێفی گوێڕایەڵی دەسـەڵاتی عوسـمانیەوە؟ نـاخۆ ئەوان بـۆ ئەم کـارە کـارامە و لێوەشـاوە نە بـون، یـاخود هەمەوەند هێزێکی ئەوەندە گەورە بوە ئەوان دەرەقەتیان نە هاتون، یاخود هەمەوەند هەر بە سروشت ئەوەنـدە خراپ بون ئامادەییان تێدا نە بوە ببنە هۆزێکی ئارام و ئاسودە و نیشتەجێ؟

## هەمەوەند و بابان

هەمەوەند لەو کاتەوە کە قەڵاچوالان بنکەی حوکمڕانی بابان بوە، لە ڕیـزی هێزەکـانی بابـان دا بـون، هاوکاری میرەکانیان کردون. تا میرایەتـی بابـان هەبـوە ئەوان لە ڕیـزی شـەڕکەرەکانیان دا بـون. کە ئەوان نەماون ئەمانیش سەرگەردان بون.

هەمەوەند سەرچاوەی ژیانیان کشتوکاڵ، ئاژەڵداری، بازرگانی یـا پیشەسـازی نە بـوە، بەڵکـو شـەڕکەری پیشەیی بون. لە سـەردەمی سـلێمان پاشـای بابـان دا هاوکـاری شـەڕەکانی ئەو بـون دژی والـی بەغـداد، دوای بنیاتنانی شاری سلێمانی (1199 ک) هاوکاری ئەورەحمان پاشای بابان و ئەحمەد پاشای بابان بـون. لە شـەڕی نێوان عەبدوڵا پاشای قائیمقامی سلێمانی و والی سـنەدا (1258 ک) تێـوە گـلاون. سـەرەتا چـونەتە زەهـاو و پاشان گەڕاونەتەوە بازیان. *(نصیری، اسناد و مکاتبات تاریخی - قاجاریه، جلد دوم، تهران 1368 ش: 194 - 195)* لە ناکۆکی نێوان مەحمود پاشای بابان، کە سـەر بە ئێـران و، سـلێمان پاشـای بابـان، کە سـەر بە عوسـمانی بـوە، لایەنگری سلێمان پاشا بون. کە مەحمود پاشا بە دەسبەسەری رەوانەی ئەسـتەموڵ کـراوە، لایەنگرەکـانی لە دەس سلێمان پاشا هەڵاتون و بەرەو ئێران کۆچیان کردوە، هەمەوەند لە سەر داوای سلێمان پاشا لە زەهاو رێگەیان پـێ گرتون و هەندێکیان لێ کوشتون و، کاروانەکەیان روت کردونەتەوە. *(عبدالقادر ابن رستم البابانی، تـاریخ و جغرافیـای کردستان موسوم به: سیر الاکراد، باهتمام محمد رؤوف توکلی، تهران 1366 ش: 73 )*

لە دوایین جەنگی بابان - عوسمانی (1266 ک) دا هاوکاری عەزیز بەگ بون. کاتێ میرایەتـی بابـان دوایی هاتوە و، دەسەڵاتی راستەوخۆی عوسمانی وڵاتی داگیـر کـردوە و بەڕێـوەی بـردوە، ئیتـر ئەمـان بـێ ئیشوکار ماونەتەوە، دەزگایەک یا شوێنێکی گونجـاو نەبـوە بیـانگرێتە خـۆی. لەنـاو رێکخـراوەی جەنگیـی عوسمانی دا ئەم جۆرە گروپانە، کە بێ دیسیپلین و، بێ وەلائی دەگۆڕ بون، جێگەیان نە بۆتەوە.

هەمەوەند چەندین جار دەخالەتیان کردوە بە دەسەڵاتی عوسمانی و، دەسـەڵاتی عوسـمانی رێـگەی پـێ داون لە ناوچەی بازیان - چەمچەماڵ جێگیـر بـن، لە پـاش مـاوەیەک دەسـتیان کـردۆتەوە بە روتکـردنەوەی کاروان و جەردەیی. چەندین جار پاشاکانی عوسمانی ویستویانە تـێکەڵاوی هێزەکـانی خۆیانیـان بـکەن، کە چەک و ئەسپیان بە دەس هێناوە هەڵاتون و یاخی بون.

بۆ نمـونە: موشـیر مـحەمەد فازیـل پاشـای داغسـتانی، کە یەکـێ لە جەنەراڵە ناسـراوەکانی ئـۆردوی عوسمانی بوە لە عیراق، حەمەی مام سلێمان، کە سەرۆکی یەکێ لە تیرەکانی هەمەوەند بوە گرتوە و بـردویەتیە لای خۆی. لە خێوەتەکەی خۆی دا جێگەی کردۆتەوە، ئەسپێک و تفەنگێکی داوەتێ، پاش ماوەیەک حەمە هەلی بـۆ هەڵکەوتـوە چەک و ئەسـپەکەی رفانـدوە و هەڵاتـوە. موشـیر شـوێنی کەوتـوە بە تەقە گرتـویەتیەوە. سەرکۆنەی کردوە کە پاش ئەو هەمو رێزلێنانە بۆچی سپڵەیی کردوە و هەڵاتـوە. حەمە لە وەڵام دا وتـویەتی: "حەمە کە بۆتە خاوەنی ئەسپ و تفەنگی خۆی ئەبێ موشیر چاوەڕوانی چی لێ بکا؟" *(عزاوی: 85/8)*

## جەنگی روسی – عوسمانی

ساڵی 1294 ک کەمتر لە ساڵێک بو سوڵتان عەبدولحەمید کاری گرتبوە دەست. روسـیا لە سـۆنگەی کوشتاری مەسیحیەکان لە بالقان و ترس لە راگەیاندنی دەسـتور، کە بە تێگەیشـتنی ئەوان نفـوزی ئینگلیـزی و فەرەنسی لە بەرامبەر نفـوزی روسـی لە نـاو دەوڵەتـی عوسـمانی دا زیـاد ئەکـرد، جەنگـی دژی عوسـمانی راگەیاند.

قافقاس و بالقان دو مەیدانی شەڕی قورسی نێوان هێزەکانی هەردولا بون. هێزی عوسمانی لە بەرامبەر هێزی روسی دا لاواز و خۆنەگر بو. شێخەلئیسلام، بەرزترین دەسەڵاتی دینیـی نـاو دەوڵەتـی عوسـمانی، بەو بۆنەیەوە دو فتوای دەرکـردوە، یەکەمیـان دەربـارەی پێویسـتیی بەشـداری هەمـو موسـڵمانێک لەو جەنـگەدا، دومیان زیادکردنی وشەی غازی بۆ سەر نـاوی سـولتان لە فەرمانەکـانی و لە وتارەکـانی مەلاکـان دا لە سـەر دوانگەی مزگەوتەکانەوە.

## کورد و غەزا

شێخەکانی تەریقەت و مەلاکانی کورد بۆ بە دەنگەوەچونی فتوای شێخەلئیسلام دەربارەی بەشداری لە غەزادا دژی روسیا، کوردیان لەم شەڕەوە گلاندوە. شێخ عوبەیدولای شەمزینی، رابەری گەورەی تەریقەتی نەقشبەندی، بە زمانی فارسی فتوایەکی درێژی دربارەی پێویستی بەشداری لەم غەزایەدا نوسیوە و، هەر خۆیشی سەرکردایەتی غازییانی کوردی لە ناوچەی هەکاری کردوە و، شێخ سەعیدی حەفید، نەوەی کاک ئەحمەدی شێخ رابەری گەورەی تەریقەتی قادری، موجاهیدینی کوردی ناوچەی سلێمانی بردوە بۆ غەزا.

پیرەمێرد (لە دایکبوی 1284 ک/ 1867 ز) لە بیرەوەریەکانی دا ئەگێڕێتەوە: "لە ئەوەدو سێی رۆمیەوە شەڕی روس و عوسمانی پەیدا بو. جاڕێ لە پێشەوە رەشبگیر هەرچی ئینسان بو یەعنی لە عومری عەسکەری و ئیحتیات و رەدیفی دا بو بردیان ئەویش کە مابونەوە پیر و بێ کەڵکەکان. یا ئەڵڵا، تەپڵ و بەیداخ و شیر و قەڵغان: "لا الە الا اللە - غەزا ئەکەم ئینشاڵڵا" کەوتنە رێ شێخ سەعیدی حەفید سەرلەشکری سپای غەزا بو باوکیشم بەیداخێکی ناودامانی ئاوریشم و پەرچەم سورمەی دروست کرد بو شوێنیان کەوت قافقاس خۆت بگرە هاتین..." *(ژین، ژمارە 958 رۆژی 17 ی مارتی 1949)*

هەمەوەند بۆ بەشداری لەم "جیهاد" ەدا بەشێکیان بەشدار بون چون بۆ قافقاس بەڵام لەم سەر کە رۆیشتون تەنیا چەکی کۆن و دەمانچە و رمیان پێ بوە، لەو سەر کە هاتونەوە بە تفەنگی روسیەوە گەڕاونەتەوە. بە هۆی ئەم شەڕەوە خۆیان بە تفەنگی تازەی کارا چەکدار کردوە. *(زکی: 192)*

جەنگ چەند مانگێکی خایاند. لەشکری عوسمانی لە بەرەکانی بالقان و قافقاس دا بەرگەی هێرشی روسی نەگرت. بە سەختی لە هەمو شەڕگەکان دا شکستی خوارد. هێزی روسی بەرەو ئەستەموڵ کشا. گەیشتە کەناری دەریای مەرمەرە کە منارەکانی ئەستەموڵی لێ دیار بو. بەریتانیا بۆ ئەوەی پێش لەوە بگرێ دەوڵەتی عوسمانی لە لایەن روسیاوە داگیر بکرێ، دزرائیلی، سەرۆوەزیرانی بەریتانیا، ئوستولی نارده دەردەنێل. نزیک بو بەریتانیا لە شەڕەوە بگلێ. گفتوگۆ لە نێوان روسیا و عوسمانی دا دەستی پێ کرا. رێککەوتنی "سان ستیفانۆ" ی لێ کەوتەوە. روسیا بە پێی ئەم رێکەوتنە لە ئەرمەنستان قەڵای قارس و مینای باتوم، کە بەشێ بون لە ئەرزی عوسمانی، دەس کەوت و، عوسمانی دانی نا بە سەربەخۆیی بولغاریادا. *(الوردی: 3/ 19 - 20. عزاوی: 34/8)*

دەربارەی بەشداری لە "غەزا" کانی عوسمانی دا تا ئێستاش دەماودەم چیرۆکی زۆر ئەگێڕنەوە، کە هەر یەکێکیان مەغزایەکی کۆمەڵایەتی گرنگی هەیە. بۆ نمونە:

> "لە شەڕی 1336 ی هیجری - کە شەڕی روس و تورک کرا - چەند کەسێ لە عولەما بۆ ئەوەی خەڵک بنێرن بۆ شەڕ چوبون بۆ ناو عەشیرەتی مەنگوڕ و مامەش. لە دیواخانی حەماغای مامەش، رەئیسی عەشیرەتەکان وەکو هەمزاغای مەنگوڕ و حەمەمین ئاغای بلباس و هی تریش کۆ ئەبنەوە. یەکێ لە مەلاکان وەعزیان بۆ ئەخوێنێ ئەڵێ: ئەمە غەزایە و پێویستە لە سەر موسوڵمان بیکا. هەر کەس بچێ ئەگەر بکوژرێ شەهیدە. پایەی شەهادەت زۆر گەورەیە. خۆ ئەگەر نەشکوژرێ ئەبێ بە غازی. پایەی غازیش دیسان زۆر گەورەیە.
>
> کە مەلا لێ ئەبێتەوە کوێخایەکی بلباس هەڵئەستێ و ئەڵێ: مامۆستا ئەگەر خوا نارەزو بکا هەرچی روس هەیە بە سەعاتێک ناتوانێ بیانکوژێ؟ مەلا ئەڵێ: بەڵێ ئەتوانێ. کوێخا ئەڵێ: ئینجا خوا کە خۆی پێی ئەکرێ بۆچی خۆی هەمویان ناکوژێ و بۆچ فیتنەکە بە ئێمە ئەگێڕێ؟"
>
> *(رشتەی مرواری: 12/1)*

**نمونەیەکی تری هەمان بابەت:**

"لەساڵی غەزا، غەزای عروسەکەی پێشوا سالاری ئابلاخ لە موکریـان حـاجی مەلا عەبـدوڵڵایەک هەبو مەلای گوندەکەی بو ئەچێتە بن دەستیەوە پێی ئەڵـێ: ئەمە غەزایە و بـۆ دینـی ئیسـلامە، هەر کەس بچێت بۆ ئەو غەزایە ئەگەر بکوژرێت شەهیدە و حەوت حۆری لە بەهەشـتا ئەدەنـێ. ئەگەر خۆ نەشکوژرێ ئەوا ئەبـێ بە غـازی و مـاڵ و تـالانێکی زوریشـی دەسـت ئەکەوێ. بەم قسانە سالار هەڵئەخرێنێ بۆ غەزا و لە گەڵ چەنـد سـوارێکا ئەیـانێرێ. ئەچـن ئەو سـەرگەرم ئەبێ و عروس زۆر خراپ دەورەیـان ئەدەن جـا سـالار لەو ئـابلۆقەدانەدا ئەیـوت: خـوایە تـۆ ئەمجارەش شەهیدم مەکە تا دەستم ئەگاتەوە بە دەستی حاجی مەلا عەبـدوڵڵا بـزانم ئەگەر غەزا وا شتێ سوک و ئاسانە خۆی بۆچی نەهات و وا بەمجۆرە ملی ئێمەی پێوە کرد؟"

*(رشتەی مرواری: 95/4)*

## ساڵی برسیمە

ساڵی 1297 ک (1880 ز) گرانی و قاتوقڕی و برسێتی ناوچەکـانی بەغـداد و موسـڵی گرتـۆتەوە. مردو لە کۆڵانەکان دا کەوتون. هەژارەکان لە بەر نە بونی کچ و کوڕی خۆیـان فرۆشـتوە. گۆشـتی گیانـداری تۆپیو و مرداریان خواردوە. کوردێکی زۆر رویان کـردۆتە بەغـداد. دەرۆزەیـان کـردوە و کە لێیـان پرسـیون چیتان ئەوێ؟ هەر یەکەیان کە دواوە وتویەتی: "برسیمە". لە بەغداد ئەو سـاڵە بە "سـاڵی برسـیمە" ناسـراوە. هەمان ساڵ لە موسڵ بە "ساڵی لیرە" ناسراوە چونکە وەزنەی گەنم فرۆشراوە بە لیرەیەک. *(عزاوی: 49/8)*

پیرەمێرد لە بیرەوەریەکانی دا ئەگێڕێتەوە: "... گرانی ئانیش من لە زەمانی زیندویی خۆما، لە پێشـدا، پەنا بە خوا گرانی، ساڵی 1296 بو کە بە راستی پیاو پیاوی ئەخـوارد و ئەمە بیلفیعـل لە موسـڵ روی دا و، داخلی تاریخ بوە. سەرەتای ئەو گرانیە لە شەڕی گەورەی روس و عوسمانیەوە پەیدا بو، کە رەشبگیر هەرچـی دەستی تفەنگی ئەگرت گرتیان و ناردیان بۆ حدودی قافقاس و. بـاقی تـریش لێـرە شـێخ سـەعیدی حەفیـدی مەرحوم هەڵسا فەرموی غەزایە جاڕ درا و دەرویش بە دەفەوە کەوتـنە جـۆش: "لا اله الا الله - غەزا ئەکەیـن ئینشالا" ئیتر ئەوی مابو بە جارێ دوای شێخ سـەعید کەوتـن. 'غەزایە هەی غەزایە". بـاوکم، حـاجی مەحمـود بەگی بانەیی بو کە جارێ لە باتی خۆی ناردبویە حەج و کە هاتیشەوە تەدارەکی بۆ کـرد و نـاردیە غەزا. ئەو مەحمود و ئەو مەحمود لە گەڵ ئەوەیشدا خۆی راسـتەوە بـو شـوێن شـێخ کەوت خەریـک بـو منـیش بەرێ. ئەیگوت: "ئەتبەم ئەتکەم بە چۆلەکەی بەهەشت!" ئینجا دیتە وڵات کەسی تیا نەبو جوت و گا هەڵگیـرا و تـۆو ئەچێنرا ئەو لەو ئەوعە گرانیە بو کە پێیان ئەوت قاتی یاخو قڕی... ئەو گرانیە زۆر نفوسـی قـڕ کـرد، مـاڵی وێران کرد، وڵاتی چۆڵ کرد.

بەڵام دوای ئەوە گرانیەکانی تر گرانی بو یەعنی وەک ئێستا دەغڵ هەبو بەڵام کەم بو ئەیان شـاردەوە گرانیان ئەکرد تەنانەت من لە بیرمە گرانیەکیان لە بانە و سەقز و لەم لایشەوە لە هەولێر و مەخمور دەغڵ زۆر بو بەڵام بەفرێکی زۆر باری بو رێبەندان بو وەک ئێستا رێوبان و وەسائیتی نەقلیە نەبـو لێـرەوە بـۆ ئێـران وڵاخ دەرنەدەچو فەقیر و هەژار ئەچون لە ناو بەفرا کەوانەیان ئەبەستە ئەژنۆ و بەکۆڵ لەوێ گەنمیـان ئەهێنـا. جەردەی ناوخۆمان لەم نزیکانە لە پێنجوێن بەم لاوە روتیان ئەکردن جـگە لە کـوڵە گەنـمەکە جلوبەرگیشـیان دائەماڵین لەم لایشەوە هەرچـی لە کەرکـوکەوە ئەهـات هەمەوەنـد روتـی ئەکـردن.." *(ژیـن. ژمـارە 931. 19 ی ئاغستۆسی 1948)*

## پشێوی لە سلێمانی

جەنگی ڕوسی - عوسمانی چەند دەرهاویشتەیەکی لێ کەوتۆتەوە:

**یەکەم**، هێزی کار هەموی براوە بۆ شەڕ. هێزێکی ئەوتۆ نە ماوەتەوە مەکینەی ئابوری، بە تایبەتی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ لەوانە دانەوێڵە، بە گەڕ بخا بە تایبەتی لەو سەردەمەدا کە هیچ جۆرە تەکنۆلۆجیایەکی تازە، جگە لە شێوە سەرەتاییەکانی کاری کشتوکاڵ لە بەر دەس دا نە بوە. هەروەها مەکینەی بازرگانی. بە هۆی کەمی دەستی کار و زۆری باندەکانی جەردەوە لە کار کەوتوە. زۆری ئەوانەش براون بۆ شەڕ نە گەڕاونەتەوە. لە سەرما و لە برسا و لە شەڕدا فەوتاون.

پیرەمێرد لە بیرەوەریەکانی دا ئەگێڕێتەوە: "کاتێ هاتمە ئەم کۆنە جیهانەوە دەورەی منالّی لای گشت ڕۆڵەیەک خۆشە چونکو غەمی گوزەران نازانێ بەو سەودایەی منالّیەوە دیارە خۆشم ڕابواردوە تا گەیمە دەسالّی بیرم کردەوە و چەندوچۆنی زەمان تێ گەیشتم گرانی و مالّوێرانی سالّی 96 بە سەردا هات (مسلمان نشنود کافر نبیند) تاقانەیش بوم دیسان باوکم ئەو هەمو پیاو و خزمەتکارەی بو بە شەو کۆلّی نان و خواردەمەنی پێ هەڵدەگرتم بە دزیەوە ئەچوینە بەر ئەو مالّانەی کەوا ئەیشیان بو و رویشیان نەدەهات سواڵ بکەن لە دەرگامان ئەدا دەرکیان ئەکردەوە بە دزیەوە کۆڵەکەمان فڕێ ئەدایە ئەو دیو دەرگاکەوە و ڕامان ئەکرد..." *(ژین، ژمارە 990 ڕۆژی کانونی یەکەمی 1949/ 1368)*

**دوەم**، بە هۆی لاوازیی حکومەت و گەندەڵیی دەزگاکانیەوە، باندەکانی دزی و ڕاووروت و، دزی نهێنی و جەردەیی ئاشکرا لە ناوشار و دەرەوەی دا، ئاسایشی ناوچەکەی بە تەواوی تێکداوە. ژیانی ئابوری وێران کردوە.

پیرەمێرد لە بیرەوەریەکانی دا ئەگێڕێتەوە: "... ئینجا جەردەی هەمەوەند ڕێی کەرکوکی لێ بەستین و حکومەت هێندە کز و بێچارە مابوەوە جوامێر هەمەوەند لەشکری کرد هاتە سەر سلێمانی ئەی گوت: شەریف چەلەبی کوڕی سلێمان پاشا بوە حوکمداریی بەشمانە!". لە هەر چوار لاوە دەوری شاری دا و عەسکەریش هیچ لە شارا نەمابو ناچار پیاوماقوڵەکانی ئەو سایە کەوتنە خۆ. بەر لە هەمویان قادر ئەفەندی گەورە خۆی و دو ژنەی ڕۆڵەی ئازای گردی سەیوان و فەقێیانیان لێ گرتن. تائیفەی عەزیزی مەسرەفیش ئەوسایە زۆر و بە دەسەڵات بون لە ڕێی هۆمەرە کوێر و گوێژەوە تا پشتی کانی ئاسکانیان محافەزە کرد. ئیتر کوڕگەلی شەڕەگەڕەککەری ناو شار دەبۆی میریان شکاند تفەنگی شەشخانەی تیا بو دابەشیان کرد. خولەی ئەلی کەوکۆژ و دەستەی دەهۆڵژەن وەک بۆ سەر شایی بچن بە دەهۆڵ و زوڕناوە پێش ئەم خەڵکە کەوتن هەمەوەندیان شکاند. بەڵام تابوری عەسکەر کە بۆ ئیمدادی سلێمانی ئەهات هەمەوەند تاسڵوجەیان لێ گرتن زۆریان لێ کوشتن..." *(ژین، ژمارە 990 ڕۆژی کانونی یەکەمی 1949)*

پیرەمێرد ئینجا ناوی هەندێ لە دز و جەردە ناسراوەکانی سەردەمی خۆی باس ئەکا: "... دیتە وڵات چۆڵ بو بو و پیاوی تیا نەما بو لاتولوت و عەسکەری فیراری کەوتبونە ناوەوە پیاو پیاوی ئەخوارد. نەک بە قسە و واتە هەر بە ڕاستی گرانییەک پەیدا بو پیاو پیاوی خوارد. ئیتر ئەو پشێوی و ئاشوبە دەنیشتەوە تا چوین بۆ ئەستەموڵ شەو دزی و ڕۆژ جەردەیی: ئەحەی وەسمان گەردی و عەزە کچانی و مەیکە چنگنی و ئەلی وەیسی ئاخەسوری و مرادە لالّی هەیاسی و سالّحی حەمەئایشی ڕۆغزادی و ئالە پێ پانی هەمەوەند، کوشتن و بڕین و تالّان و بڕۆ بو. خۆ وەقعەی شێخ تەها ئاوشارەکەیشی وا لێ کرد بو زەندەقدار زەندەقی ئەچو. لەو زەمانە من لە سێتەک باشکاتبی مەحکەمە بوم..." *(ژین، ژمارە 958 ڕۆژی 17 ی مارتی 1949)*

کاربەدەستانی تورک بێگانە بون بە وڵات و دانیشتوان و نەریتی کۆمەڵایەتی خەڵکەکەی. دەسەڵاتێکی گەندەڵ و ستەمکار بو. بە کارهێنانی زەبروزەنگ بۆ سەربازگیری زۆرەملێ، باجی جۆراوجۆری قورس،

بەرتیلخۆری، لە نەریتە باوەکانی بو. خەڵک بە چاوی دوژمن سەیریان کردون. سەرەڕای ئەوەش تەنیا لە ناوەندی شارەکان دا دەستی ڕۆیشتوە. دەستی نەگەیشتۆتە گوندەکان و ناو خێڵە کۆچەرەکان مەگەر بۆ ڕوتاندنەوەیان بە بیانوی کۆکردنەوەی باجەوە.

دەزگای دادوەری کە لە هەر سیستەم و وڵاتێک دا ئەشێ لە هەمو دەزگاکانی تری فەرمانڕەوایی پاکتر بێ، مەحوی، کە خۆی موچەخۆری حکومەتی عوسمانی و خانەقاکەیشی لە لایەن سوڵتان عەبدولحەمیدەوە بۆ دروست کرا بو، دادگای بە کوشتارگا و دادوەری بە قەساب شوبهاندوە، ئەڵێ:

عەوامی لە عارفیکی پرسی هەواڵی مەحکەمە و نائیب

بە ئەنگوشتی شەهادە، ئیشارەی کرد بۆ مەسلەخ و قەساب

ئەگەر دۆخی دادگا بەوجۆرە بو بێ، ئەبێ هەلومەرجی دەزگاکانی تری کارگێڕی و بەڕێوەبردن چۆن بو بێ؟

شێخ ڕەزای تاڵەبانی، کە ئەویش موچەخۆری حکومەتی عوسمانی بوە و نیشتەجێی شاری بەغداد بوە، زۆر بە کورتی بە زمانی تورکی، زمانی ڕەسمی حکومەتی عوسمانی، لە والیەکانی بەغداد دواوە:

ساڵی 1307 ک سری پاشا کراوەتە والیی بەغداد، شێخ ڕەزا وتویەتی:

"ئەگەر قازی حەقی بێ و والی سڕی بێ

خاک بە سەر ڕەعیەت، واوەیلا بە حاڵی ئەهالی!"

ساڵی 1314 ک عەتائوڵا پاشا کراوەتە والیی بەغداد لەو بارەیەوە وتویەتی:

"ئەگەر والی پیرێکی پەککەوتە، تەمەنی لە سەد تێپەڕی بێ

ئەبێتە هۆی پەشێوانی ئەحواڵی مەملەکەت

ئەگینا چۆن بە مردو وڵات زیندو ئەبێتەوە و ئیسلاح ئەکرێ؟

ئافەرین بۆ هێزی ئیدراکی بابی عالی!"

*بۆ دەقی تورکی شیعرەکانی شێخ ڕەزا بڕوانە:*
*(عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين: 114/8 و 126/8)*

ئەگەر والیەکانی شوێنێکی گرنگی وەکو بەغداد بەو جۆرە بو بن، ئەبێ موتەسەریف و قایمقام و مودیرەکانی کوردستان چۆن بو بن؟

لە غیابی داودەزگای بەهێزی حکومەتی دا، ڕێکخراوەی کۆمەڵایەتی خێڵ خۆی لە ناو خۆی دا حکومەتێکی بچوک بوە. چەندی دەسەڵاتی حکومەت لاواز بوبێ دەسەڵاتی خێڵ لە بەرامبەردا ئەوەندە بەهێز بوە. چەندی دەسەڵاتی حکومەت بەهێز بوبێ دەسەڵاتی خێڵ ئەوەندە لاواز بوە.

- خێڵ، ڕێگەوشوێنی تایبەتی خۆی هەبوە بۆ دیاریکردن و سەندنی باج و زەکات و زەویانە و مەڕانە و پوشانە، لە ئەندامانی خێڵەکەی.
- خێڵ، نەریت و ڕەوشت و خوی تایبەتی خۆی هەبوە بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتی و ئابوریەکانی و، بۆ یەکلاییکردنەوەی ناکۆکیەکانی نێوان کەسانی خێڵەکەی.
- خێڵ، خۆی هێزی چەکداری تایبەتی خۆی هەبوە بۆ پاراستنی سەر و سامانی ئەندامانی خێڵەکەی لە بەرامبەر هێرش و پەلاماری دەرودراوسێ.

دەسەڵاتی حکومەت نەی توانیوە ئەندامی خێڵ، چ ڕەوەند چ نیشتەجێ، وەکو تاکێکی ئاسایی لە دەستدرێژی بپارێزێ. نەی توانیوە مافە کۆمەڵایەتی و ئابوریەکانی، چ ئەوی شەرعی ئیسلام پێی بەخشیوە

و، چ ئەوەی یاسای دانراو بۆی سەلماندوە، نابێ بکا. لە بەر ئەوە بۆ بەجێگەیاندنی داواکانی و بۆ پاراستنی مافەکانی پەنای بۆ سەرۆکایەتی خێڵەکەی و داوودەزگاکانی خێڵەکەی بردوە، نەک بۆ داوودەزگاکانی حکومەت و کاربەدەستەکانی. بە چاوی دوژمن سەیری حکومەتی کردوە. لە کاتێـک دا ئەم پێویسـتی بە حکـومەت بـوە دەسەلاتێکی بێدەربەست بوە، و لە کاتێک دا حکومەت پێویستی بەم بوە دەسەلاتدارێکی ستەمکار بوە.

ئەمە حاڵی عەشیرەتەکانی باشوری کوردستان بوە لە ژێر سایەی حوکمی عوسمانی دا.

## لە هەلومەرجێکی وەهادا دەوڵەت و داوودەزگاکانی دروست نابێ.

دەزگای فەرمانڕەوایی تورک کە پێڕەوی سیستەمی "ناوەندێتی بەڕێوەبردنی" کردوە نەی توانی خـێڵە کۆچەرەکان نیشتەجێ بکا. نەی توانی دەزگایەکی خاوێن دابمەزرێنێ بـۆ رەفتـار کـردن لە گەڵ هاووڵاتیـانی دەوڵەتەکەی بۆ سەربازگیری و بـاجگیری. نەی تـوانی هـیچ جـۆرە چاکسـازیەک لە ژێرخـانی ئـابوری و لە گوزەران و ژیانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی دا بەدی بهێنێ. مزگەوت تەنیا ناوەندی خوێنـدن و فێربـون بـوە. گوێ نە دراوەتە دروستکردنی ڕێگاوبان، قوتابخانە، نەخۆشخانە، پرۆژەی ئاودێری و بەنداو. ژمـارەیەکی کەم مزگەوت و خانەقایان دامەزراندوە. "خەتی شەریف گوڵخانە" و تەنزیماتەکەی هەرگیز لەم سنورەدا جێبەجێ نە کراوە. هەمیشە دەلاقەیەکی گەورە لە نێوان دەسەلات و خەڵـک دا هەبـوە. خەڵـک بە چـاوی دوژمـن سـەیری حکومەتی تورکیـان کردوە. لە بەر ئەوە نەی توانی نە هەمەوەند و نە هیچ ئێل و تیرەیەکی تـری رەوەنـد یـا نیشتەجێ بهێنێتە ژێر باری گوێڕایەڵی حکومەت و بیـان کـات بە فـاکتەری باشـی بنیاتنـانی داوودەزگاکـانی دەوڵەت و پێشکەوتنی ناوچەکە.

# هەورامی (بە نمونە)

هەورامان ناوچەیەکی شاخاوی سەختە. بەشێکی لە سنوری دەوڵەتی ئێران و بەشێکی لە سنوری دەوڵەتی عوسمانی دا بوە. بەشەکەی ئێران لە روی بەڕێوەبەرایەتیەوە هەندێکی سەر بە سنە و هەندێکی سەر بە کرماشان بوە. بەشەکەی عوسمانی سەر بە لیوای سلێمانی بوە.

هەورامان تایبەتمەندی جوگرافی - سروشتی، مرۆیی، ئابوری، خۆی هەبوە. خەڵکی هەورامان، هەمویان لە گوند و ئاوایی دا نیشتەجێ بون. دابینکردنی پێویستیەکانی ژیان لەو ناوچەیەدا ئەوەندەی شاخەکانیان سەخت بوە. ئابوری ناوچەکە و سەرچاوەی ژیانی دانیشتوەکانی لە سەر سێ پایە وەستاوە: باخداری، ئاژەڵداری، پیشەی دەستی.

بۆ باخداری، زەوی کشتوکاڵی کەمە، بە کۆڵ گڵیان لە ناخی دۆڵ و شیوەکانەوە سەرخستوە بۆ ناو بەردەلانی لاپاڵی کێوەکان، تەلانیان لێ سازکردوە، دار و سەوزەی تێ دا روێنراوە. سیستەمی ئاودێری باخەکانیان شارەزایانە رێکخستوە. بۆ چاندنی دانەوێڵە: گەنم و جۆ ناشێ و، بۆ باخ و رەز لە بارە.

- لە ئاژەڵداری دا، بزن و بزنی مەرەز و مەڕیان بە خێو کردوە.
- لە پیشەی دەستی دا، وەستای جۆلایی، کارگەچی، دارتاشی، ئاسنگەری بون.

تا رادەیەکی باش "ئیکتیفای زاتی" یان کردوە و، ئابوریەکی داخراو و سروشتی‌یان هەبوە. بەشی زۆری پۆشاک و خۆراک و پێویستیەکانی ماڵداری و ئیشەکانیان، بەرهەمی رەنج و دەستی خۆیان بوە. دەرامەت و داهاتیان کەم بوە، بەروبومی باخداری و ئاژەڵداری و پیشەی دەستی ئەوەی لە خۆیان زیاد بوبێ بردویانەتە ناوچەکانی نزیکی خۆیان، هەندێکیان گۆڕیوەتەوە بە دانەوێڵە و هەندێکیان فرۆشتوە بە پارە پێویستیەکانی خۆیان پێ کڕیوە. لە بەر ئەوە توانای دانی باج و دیاری و پێشکەشیان لاواز بوە. هەورامی جوتیاری ئیشکەر و پیشەگەری دەسترەنگین و شاخەوانی چاک و شەڕکەری ئازا و نیشانچی دەسڕاست بون. هەورامی بە ماندوبونێکی زۆر بژێوی خۆی دابین کردوە. کەسی تەوەزەل گوزەرانی خۆی پێ رایی نە کراوە.

خەڵکی هەورامان بە بنزاراوی هەورامی ئەدوێن، کە یەکێکە لە سەرچاوە زمانیە گرنگەکانی زاراوی گۆران. زاراوی گۆران یەکێکە لە لەهجە سەرەکیەکانی زمانی کوردی و، خاوەنی سامانێکی دەوڵەمەندی ئەدەبیە. لە مێژوی ئەدەبی کوردی دا جێگەیەکی دیاری هەیە. خاوەنی ناوەرۆک و فۆرمی مەدرەسەی ئەدەبیی تایبەتی خۆیەتی. شاعیری گەورە و، بیرمەندی گەورە و، مەلای گەورەیان تێدا هەڵکەوتوە.

هەورامان زمانی تایبەتی، جلوبەرگی تایبەتی، ئابوری تایبەتی، تەنانەت شێوەی تایبەتی ژیان و ئەندازیاریی تایبەتی بینای خانو و ئاواییان هەبوە.

*بۆ ئاگاداری زۆرتر لە سەر هەورامانی تەخت و هەورامانی لهۆن لە سەردەمی ئەو ڕوداوانەدا بڕوانە: (سیر الاکراد: 95 - 101. حدیقەی ناصری: 44 - 46. وقایع نگار: 62 - 66)*

گەورەکانی هەورامان پێیان وتون سان (سوڵتان)، سانەکان خۆیان بە ئەوەی کەیانیەکانی سەردەمی ئەسکەندەری مەکدۆنی دائاوە. "سان" لە ناو هەورامیەکان دا سامێکی زۆری هەبوە. هەم هێزی زۆری هەبوە، هەم دەسەڵات و زەبروزەنگ، قسەیەک باو بوە لە ناویان دا ئەڵێ: "سان جمۆ بەغدا مەگیرۆ!" واتە: سان بجوڵێ بەغداد ئەگرێ. خۆبەخۆ کاروبارەکانی خۆیان ڕایی کردوە، نە پێویستیان بە حکومەتی سنە، مەریوان، جوانڕۆ هەبوە، نە حکومەتی ئێران دەسەڵاتی بە سەر ئەوان دا هەبوە.

بەشێکی هەورامان بەشێ بوە لە قەڵەمڕەوی ئەردەڵان. قەڵەمڕەوی ئەردەڵان بەشێ بوە لە دەوڵەتی ئێران.

هەورامانی لهۆن کە هاوسنور بوە لە گەڵ شارەزور ناوەندەکەی دزڵی بوە و، گەورەکەیان محەمەد سەعید سوڵتانی کوڕی عوسمان سوڵتان بوە. ئەم بلۆکە سیوسێ گوند و نزیکەی پێنج هەزار کەس و باجی ساڵانەی 300 تمەن بوە.

هەورامانی تەخت کە هاوسنور بوە لە گەڵ مەریوان ناوەندەکەی ئەوسود و گەورەکەیان حەسەن سوڵتان کوڕی محەمەد سوڵتان بوە. ئەم بلۆکە بیست و دو گوند و پێنج هەزار کەس و باجی ساڵانەیان 700 تمەن بوە.

سان بە ناوی جۆراوجۆرەوە باجی لە خەڵک سەندوە، ئەویش لە باتی دانیشتوانی ناوچەکەی، ساڵانە باجی داوە بە کاربەدەستانی ئەردەڵان.

*(دەربارەی ڕێچەڵەک و دەرەختی بنەماڵەی سانەکان بڕوانە: (امونلز: 139 - 143)*

ساڵی 1268 کۆچی حەسەن سوڵتان، گەورەی هەورامانی تەخت و محەمەد سەعید سوڵتان گەورەی هەورامانی لهۆن لە ئەمانوڵاخانی دوەم، والی ئەردەڵان، یاخی بون. یاخیبون بە زۆری لە ئەنجامی گرانی باری باج و، نەتوانینی دابینکردنی بوە لە کاتی داواکردنی دا. دەرباری قاجار فەرمانی لەشکرکێشی داوە بە ئەمانوڵا خان بۆ سەر هەورامان. هێزی ئێرانی هێرشی کردۆتە سەر هەورامان. دو ناوەندی گرنگ: دزڵی و ئەوسویان گرتوە. بەڵام هیچ کام لە سەرانی هەورامانیان بۆ نە گیراوە. هێشتا شەڕ کۆتایی نەهات بو هەواڵی هەوڵی کوشتنی ناسرەدین شا بڵاو بۆتەوە. هەواڵەکە وورەی هێزەکانی ئێرانی دابەزاندوە و، وورەی هەورامیەکانی بەرز کردۆتەوە. چەکدارەکانی هەورامی هێرشی پێچەوانەیان بۆ سەر هێزەکانی ئێران کردوە. شوێنەکانی خۆیان گرتۆتەوە. هێزەکانیان ناچار کردوە بە سەرنەکەوتویی بگەڕێنەوە سنە. بەشێ لە دانیشتوانی هەورامان ئاوارەی شارەزور و سلێمانی بون. حاکمی سلێمانی وەفدێکی بۆ ئاوبژی ناردۆتە لای والی. والی 3 هەزار تمەنی لە هەورامیەکان سەندوە بەرامبەر بەوەی بە ئاشتی بگەڕێنەوە سەر جێگەوڕێگەی خۆیان. *(تحفەی ناصری: 193)*

ساڵی 1281 کۆچی سانەکانی هەورامان جارێکی تر تاوانبار کران بە یاخیبون. دەرباری قاجار فەرمانی دا بە والی سنە بچێتە سەریان و، سەرکوتیان بکا. والی بە هاوکاری عەلی ئەکبەر خانی ئەردەڵانی هێزەکانی ساز دا و هێرشی کردە سەریان. هەورامیەکان خۆیان پێ رانەگیرا کشانەوە شارەزور. بۆ ناوبژی، شێخ ئەوڕەحمانی کوڕی شێخ عوسمانی نەقشبەندی و حەمە پاشای سەرۆکی ئێلی جاف چونەتە لای والی. محەمەد سەعید سوڵتان خۆی هاویشتۆتە تەویلەی والی و 3 هەزار تمەنی داوە بۆ ئەوەی لێی خۆش بن. کراوەتەوە بە حاکمی هەورامانی لهۆن. (تحفەی ناصری: 201)

دەرباری قاجار بە بیانوی نوێکردنەوەی دەزگای حوکمڕانیەوە لە ولایەتەکانی ئێران دا، بەرەو چەسپاندنی سیستەمی ناوەندێتی و کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی میراتیی بنەماڵە حاکم و دەسەڵاتدارەکان چوە. هەوڵی سەرەکی دەرباری قاجار بۆ کۆکردنەوەی زۆرترین باج (مالیاتی دیوانی) و، پێکهێنان و رێکخستنی فەوجە جەنگیەکانی ئەرتەشی ئێرانی بوە.

ساڵی 1284 ک غولامشاخان مردوە. دەرباری قاجار، ئەمەی بە دەرفەت زانیوە، ئیتر کەسی لە بنەماڵەی ئەردەڵان بە والی دانەناوە. بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی ناوەندی و راستەوخۆ ئیتر کەسانێکی داناوە لە دەرەوەی بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی ناوچەکە بە حاکمی ناوچەکە. ئەم سیاسەتە نوێیەی دەرباری قاجار بە دانانی فەرهاد میرزا موعتەمیدولدەولە بە فەرمانفەرمای کوردستان دەستی پێ کردوە.

## حکومەتی فەرهاد میرزا موعتەمیدولدەولە (1284 - 1319 ک)

فەرهاد میرزا (1233 - 1305 ک) کوڕی عەباس میرزای وەلیعەهدی فەتحعەلی شای قاجار و، مامی ناسرەدین شا بوە. بە 17 ساڵی بۆتە حاکمی لوڕستان و خوزستان لەو ماوەیەدا نازناوی "معتمدالدولە" ی وەرگرتوە. ماوەیەکیش حاکمی فارس بوە. ناسرەدین شا لە یەکەم گەشتی دا بۆ ئەوروپا (1290 ک) ئەوی داناوە بە "نائب السلطنە". لەو ماوەیەدا کارامەیی و شارەزایی لە کاری دەوڵەتی دا نواندوە. لە رەفتاری دا لە گەڵ نەیارەکانی دڵڕەق بوە. لە هەر جێ فەرمانڕەوا بوبێ زەبروزەنگی دژی یاخی و جەردە و راووروتکەر بە کارهێناوە. رۆشنبیر و ئەدیب و شاعیر بوە، ئینگلیزی باش زانیوە، چەندین کتێبی نوسیوە. بە دەستوری ئەو "سەحنی کازمەین" لە عیراق نۆژەن کراوەتەوە. لە تاران مردوە و لە کازمەین بە خاک سپێردراوە. غلامحسین مصاحب: دایرة المعارف فارسی، مادە فرهاد میرزا معتمد الدولە.

لە دوای کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی میراتیی بنەماڵەی ئەردەڵان لە سنە، شای قاجار فەرهاد میرزا معتمد الدولەی ناردۆتە کوردستان. فەرهاد میزا یەکەمین حاکمی بێگانە بوە کە کراوە بە حاکمی کوردستان (1284 - 1291 ک).

سەرەتای کارەکانی بە کوشتنی سانەکانی هەورامان و بە داگیرکردنی ناوچەکەیان دەستی پێ کردوە. ویستویەتی بەمە دەسەڵاتی خۆی و دەرباری قاجار لە کوردستان دا بە تەواوی بچەسپێنێ.

پاش سێ مانگ چو بۆ سەردانی قەڵای شاهئابادی مەریوان لە گەڵ ژمارەیەکی کەم. یەکێ لەوانە لەگەڵی بو عەلی ئەکبەر خانی ئەوەی ئەمانوڵا خانی والی ئەردەڵان و چەند پیاوی ناوداری سنە. لە گوندی بێڵەک دابەزیوە و مزگەوتەکەی کردۆتە شوێنی مانەوەی. حەسەن سوڵتان خۆی و براکانی مستەفا بەگ و بارام بەگ لە گەڵ چەند سەد چەکداری هەورامی هاتون بۆ گوندی بێڵەک بۆ سەردانی. بەم جۆرە بە قەرەباڵغی ئامادە بون، هاتوە بۆ نمایشی هێز و توانای خۆی، یان ئەمەی لە سادەییەوە بوە بۆ بەخێرهێنانی حاکمی تازە و دەربڕینی گوێڕایەڵی و دڵسۆزی بۆ حکومەت. مەبەستی حەسەن سوڵتان هەرچیەک و هەر کامێکیان بوبێ فەرهاد میرزا ئەم نمایشەی بە دڵ نەبوە، کردویەتی بە بەهانەی لە ناو بردنی. پێ ئەچێ پێش ئەوەی بێت بۆ

ئەم گەڕانە بە نهێنی بڕیاری دا بێ حەسەن سوڵتان کە چەند ساڵ بو لاملی ئەکرد و وەکو پێویست ملی بۆ حاکمەکانی ئەردەڵان نەدابو، لە ناو بیا. (تحفەی ناصری: 282)

ئەو شەوەی لە مزگەوتی بێڵەک ماوەتەوە، تا بەیان گینگڵی داوە لە بیری ئەوەدا بوە، چۆن حەسەن سوڵتان لە ناو بیا. ئیستیخارەی کردوە "یایحیی خذ الکتاب بقوة..." هاتۆتەوە ئەمەی بە نیشانەی باشی داناوە. بانگی بەیانی گوێ لێ بوە هەستاوە بۆ نوێژ و پاڕانەوەی سەرکەوتن. پاش نوێژ زەینەلعابدینی فەڕاشباشی بانگ کردوە، بێنەوەی بهێڵێ هاوڕێکانی لە گەڵی چون بزانێ نیازی چیە، فەرمانی پێداوە لە گەڵ دە فەڕاشی هەڵبژاردە لە قاوەخانە ئامادە بن بۆ ئەو کارە دژوارە. هەر کە حەسەن و هەردو براکەی هاتن، ببرێنە قاوەخانە دەسبەجێ حەسەن بکوژن و هەردو براکەشی زنجیر بکەن.

عەلی ئەکبەر خان و ئەوانی تری بانگ کردوە لای خۆی بە قسەوە خەریکی کردون. کاتی هەتاو کەوتن حەسەن سوڵتان و براکانی بانگ کردۆتە لای خۆی کە بێن خەڵاتەکانیان وەرگرن و بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان. حەسەن و براکانی بە بێباکی چونەتە لای، هەندێ دڵنەوایی کردون میهرەبانی لە گەڵ نواندون، بەڵێنی "ئیمتیاز و مەواجیب" ی پێ داون، وتویەتی: "مەریوان ئەوەندەی ئاوایی گەورەی لێ نیە جێگەی ئەو هێزە زۆرەی تێدا ببێتەوە، مانەوەی ئێوە بەم ژمارە زۆرە و بە سەر ئەم خەڵکەوە ئەبێتە هۆی زەرەر و زیانی ئەهالی و رەعیەت. خەڵاتەکانتان لە چاخانەکە حازرە. بڕۆن وەریان بگرن و بیان پۆشن و بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆتان، خەریکی خزمەت و کۆکردنەوەی مالیاتی دیوان بن."

هەرسێ برا چونەتە قاوەخانە. پاش ئەوەی ئەوان چونەتە قاوەخانە بە دەنگی نزم لە عەلی ئەکبەر و ئەوانی تری بەشدارانی کۆڕەکەی پرسیوە، ئەگەر ئێستا فەرمانی گرتن و بەستنی ئەم ئەشرارە بدەم چی ئەبێ؟ بە شڵەژاویەوە وەڵامیان داوەتەوە ئێستا ئەم کارە بەجێ نیە لە بەر ئەوەی هەزار تفەنگچی لە دەرەوەی مزگەوت دەست بە تفەنگەوە وەستاون. ئێمەش ئامادەیی تەواومان نیە. فەرهاد میرزا وتویەتی ئەگەر خوا بیەوێ ئەوەندە گرنگ نیە. هێشتا ئەوان وەڵامی قسەکانیان تەواو نەکرد بو لە قاوەخانەکەوە دەنگەدەنگ هەڵسا مژدەی ئەنجامدانی کارەکەی دا کە حەسەن کوژراوە و هەردو براکەشی زنجیر کراون.

عەلی ئەکبەر، بۆ دەربڕینی دڵسۆزی خۆی و پاراستنی گیانی فەرهاد میرزا، هەڵی کێشاوەتە شمشێر چۆتە دەرەوە لە بەر دەرگاکە وەستاوە.

فەرهاد میرزا داوای کردوە پەتیان خستۆتە قاچی حەسەنەوە لە مزگەوت بردویانەتە دەرەوە لاشەکەیان فڕێ داوەتە بەردەم تفەنگچیەکانی هەورامی. هەورامیەکان بەو دیمەنە حەپەساون و بڵاوەیان لێ کردوە.

فەرهاد میرزا دو گیراوەکەی تری، بارام بەگ و مستەفابەگ، بە زنجیرکراوی لە گەڵ خۆی بردۆتەوە بۆ ناو شاری سنە. فەرهاد میرزا بەمە هەمو ئەوانەی لە گەڵی چوبون بۆ ئەو سەفەرە و، هەمو سەران و سەرکێشەکانی ناوچەکەی ترساندوە و، گەفەکەی ڕۆژی یەکەمی گەیشتنی کە بە ئامادەبوانی پێشوازیەکەی وتبو: "هەرکەس ڕاستم لە گەڵ بکا بۆی ئەبمە بەهەشت و، هەرکەس درۆم لە گەڵ بکا ئەینێرم بۆ دۆزەخ!" هێنایە دی.

سەرەڕای کوشتنی حەسەن سوڵتان و گیرانی براکانی، لەو ماوەیەدا هەورامیەکان ئارام بون. ئامادەیی گوێڕایەڵی و ملکەچییان بۆ فەرهاد میرزا دەربڕیوە، هەوڵیان داوە ئەم دو برایە بە دیاری و پێشکەش، بە ڕجا و تکا ئازاد بکەن، کەڵکی نەگرتوە. لە زیندان دا بە گیراوی ماونەتەوە. ساڵ زیاتر تێ پەڕیوە بە سەر مانەوەیان دا لە زیندان ئیتر ئائومێد بون لە بەربانیان، ئینجا بیریان لە ڕێگەیەکی تر کردۆتەوە.

یەکێ لە نۆکەرەکانی فەرهاد میرزا، محەمەد باقر خان، کە حاکمی مەریوان و مەئموری ئاوەدانکردنەوەی قەڵای شاهئاباد بوە، هەورامیەکان تەگبیریان کردوە کە ئەو بە زۆر بگرن و بیبەنە هەورامان وەکو بارمتە گلی بدەنەوە لە بەرامبەر ئازادکردنی سانەکان دا ئەمانیش ئەو ئازاد بکەن، ئەگەر ئەوان کوژران ئەمانیش ئەو بکوژن.

محەمەد باقر هەواڵەکەی بیستوە و پەیامەکەی گەیاندۆتە فەرهاد میرزا. فەرهاد میرزا چەند کەسێ لە کوردستانیەکان لە گەڵ دەستەیەک سەرباز هەڵئەگرێ و خۆی بە ناوی سەردانی قەڵای شاهئابادی مەریوان ئەچێ بۆ ناوچەکە لە نزیک گوندی "ئەنجومەنە" خێوەتگاکەی دائەمەزرێنێ.

هەورامیەکان کە بەمە ئەزانن دو هەزار کەسێ چەکدار ساز ئەدەن شەوانە پەلاماری دەوروبەری فەرهاد میرزا بدەن. ئەم هەواڵە گەیشتۆتەوە عەلی ئەکبەر و کوردەکانی تر. فەرهاد میرزایان لێ ئاگادار کردوە داوایان لێ کردوە کە خۆیانی بۆ ئامادە بکەن بەڵام فەرهاد میرزا گاڵتەی بە قسەکەیان کردوە و بە ترسنۆکیی بۆی ژماردون. هەواڵەکە بوە بە راست لە تاریکی شەودا پەلاماریان داون. گوللەبارانیان کردون. هەندێکیان لێ کوشتون. عەلی ئەکبەر، ئەگەرچی خۆی پێی کەمێ بریندار بوە، فەرهاد میرزای بە سواری ئەسپ دەرباز کردوە. رایان کردوە تا شاری سنە ئەوەستاون. هەورامیەکان کامپەکەیان تاڵان و نزیکەی 40 کەسیان لە نۆکەرانی فەرهاد میرزا و کوردستانی کوشتوە.

فەرهاد میرزا ئەم شکانەی بە ئەنگیەکی گەورە بۆ خۆی داناوە. هەواڵەکەی ناردوە بۆ ناسرەدین شا. شا فەرمانی تەمێکردنی هەورامی داوە. هێزیکی گەورەی سازداوە بینێرێتە سەریان.

حاجی قەنبەر عەلیخان سەعدولدەولە لە گەڵ 10 هەزار پیادە و 1 هەزار سوار. مستەفا قولیخانی ئیعتیمادولسەلتەنە لە گەڵ 1 فەوج سەربازی هەمەدان. بیوک خان سەرتیپ لە گەڵ فەوجی ورمێ و ئەفشار بە سەرۆکایەتی حاجی سەعدولدولە گەیشتونەتە سنە. هەروەها محەمەد عەلیخان سەرهەنگی فەوجی زەفەر لە گەڵ چریکی مەریوان و سەقز و بانە و چەند تۆپ.

فەرهاد میرزا هێزەکەی کردۆتە دو قۆڵ:

**قۆڵی یەکەم**، دو فەوج سەربازی خەمسە و هەزار سوار بە سەرۆکایەتی سەعدولدەولە و بە چاوساغی میرزا رەزا عەلی بێگی، بەرەو شامیان و هەورامانی تەخت تا لە گەڵ محەمەد عەلیخان و هێزی زەفەر یەک بگرنەوە

**قۆڵی دوەم**، ئیعتمادولسەلتەنە و بیوک خان لە گەڵ دو فەوجی هەمەدان و فەوجەکانی ورمێ و ئەفشار بە سەرۆکایەتی ئیعتمادولسەلتەنە و چاوساغی عەلی ئەکبەر، بە هاوکاری تفەنگچی و سوارەی جوانرۆ و باشکی و کشکی لە لای جوانرۆوە هێرش بۆ سەر هەورامانی لهۆن بکەن.

هەورامیەکان چەند جارێ هێرشیان کردۆتە سەر لەشکری ئێران و. هەندێکیان لێ کوشتون و، هێرشەکەیان دوا خستون. بەڵام لەشکرکێشیەکە بەردەوام بوە.

هەورامیەکان شاخ بە شاخ و سەنگەر بە سەنگەر لە هەردوبەری سیروان شەریان لە گەڵ کردون. بە چاوساغی هەندێ لە خەڵکی ناوچەکە کە هەندێکیان بە پارە و هەندێکیان لە سۆنگەی دوژمنایەتیەوە چاوساغی ئێرانیەکانیان کردوە بە کوێرەرێ دا سەرکەوتونەتە سەر شاخەکانی کە روانیویتی بە سەر ئەوسو دا و ئەوسویان گرتوە. ئەوسو پاش شەرێکی سەخت کەوتۆتە دەست هێزی قاجار و. هەورامیەکان بە سەرۆکایەتی محەمەد سەعید سوڵتان کشاونەتەوە شارەزور. قۆڵەکەی تر بەرەو دزڵی چون. بە شەری سەخت گرتویانە.

هەردو هەورامانی تەخت و لهۆن کەوتۆتە دەست هێزەکانی حکومەت. وەکو بەشێ لە پرۆسەی جەنگ ماڵ و دارایی هەورامی. هەرچی بە کەڵک هاتبێ تاڵان کراوە و. هەندێکی سوتاوە یا وێران کراوە. تەنانەت دارە بەردارەکانی باخەکانیان بریون.

دیلەکانی هەورامی و سەری براوی کوژراوەکانیان ناردوە بۆ فەرهاد میرزا لە سنە. فەرهاد میرزا سەرە براوەکانی کردوە بە نوکی رمەوە و بە دیلەکانەوە کردونی بە ناو شاردا و گێراونی. *(تحفەی ناصری: 300)*

سانەکان و بەگزادەی هەورامان چونەتە سلێمانی. سلێمانی لە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی تورک دا بوە. "کارپەردازی" ئێرانی لە بەغداد بوە. ڕاپۆرتێکی لە سەر ڕوداوەکانی هەورامان و ژیانی ئاوارەکانیان بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئێران نوسیوە. هەندێ لە هەواڵەکانی لە ڕۆژنامەی زەورا وەرگرتوە.

لە ئەنجامی ئەو شەڕانەدا ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی هەورامان ئاوارە بون. ڕویان کردۆتە شارەزور و سلێمانی. چەند مادەیەکی هەردو ڕێککەوتننامەی یەکەم و دوەمی ئەرزرۆم بۆ چارەسەرکردنی کێشەی داڵدەدان و پەنادان و تێپەڕاندنی سنور و ساخکردنەوەی ناسنامەی خێڵەکان بوە.

هاتنی هەزاران هەورامی بۆ ناو قەڵەمڕەوی عوسمانی، کێشەی داڵدەدانی لە نێوان هەردو دەوڵەت دا دروست کردوە. ئێران داوای لە عوسمانی کردوە ئەوانە ڕادەستی ئەو بکرێنەوە. بە یاخی و جەردە و هەڵگەڕاوەی داناون. بۆ ئەو مەبەستە لە کەناڵی کارگێڕی - ناوچەیی و، دیپلۆماسی - ناوەندیەوە گفتوگۆ و نامەکارییان دەست پێ کردوە.

عەهدنامەی یەکەمی ئەرزرۆم (1238 ک) گرفتی داڵدەدانی هەڵاتوانی یەکترییان بەمجۆرە یەکلاییکردۆتەوە:

**مادەی چوارەم:** "بە پێی مەرجەکانی دێرین، نابێ هەڵاتوانی یەکتری داڵدە بدرێن و لەوانە عەشایەر و ئێلات، هەر کەسێکیان دوای ئەمە، لە دەوڵەتی... عوسمانیەوە بۆ دەوڵەتی... ئێران و، لە دەوڵەتی... ئێرانەوە بۆ دەوڵەتی عوسمانی بڕۆن، ئەبێ ئەو تێپەڕیوانە داڵدە نەدرێن.."

موعاهەدەنامەی دوەمی ئەرزرۆم (1263 ک). سەرەڕای ئەوەی هەمو مادەکانی ڕێککەوتننامەکەی پێشوی پەسند کردۆتەوە، بۆ ڕونکردنەوەی زیاتری کێشە سنوریەکان و، جموجوڵی دانیشتوانەکەیشی مادەیەکی تری بۆ زیاد کردوە، کە بریتیە لە:

**مادەی هەشتەم:** "هەردو دەوڵەتی مەزنی موسوڵمان بەڵێن بە یەکتری ئەدەن، بۆ ڕێگرتن لە دزی و پێشگیری لە جەردەیی کە لە لایەن هۆز و کەسانی دانیشتوی سنورەکانەوە ئەکرێ، ڕێوشوێنی پێویست دابنێن و جێبەجێی بکەن. وە بۆ ئەم مەبەستە کەسانی نیزامی لە شوێنانی موناسیب دابنێن.

سەرەڕای ئەوەش بەڵێن ئەدەن، بەرامبەر هەر جۆرە کارێکی دەستدرێژیکارانە وەکو تاڵان، چەپاو، کوشتن کە لە سنورەکانیان دا بقەومێ، ئیقداماتی جیددی بکەن.

سەبارەت بەو ئێلانەی کە جێگای ناکۆکیین و، دیار نیە لە ژێر دەسەڵاتی کام دەوڵەت دان، هەردو دەوڵەتی مەزن یەک جار بۆ هەمیشە ئازادی تەواوی هەڵبژاردنی شوێنی دانیشتنیان ئەدا بە خۆیان، تا لێرە بە دواوە هەمیشە لەوێدا بژین. ئەو ئێلانەی تابیعییەتیان دیار نیە، ناچار ئەکرێن کە بگەڕێنەوە قەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتەی کە سەر بەون."

بە پێی ئەم دو ڕێکەوتنە هاتنی ئەوانە و داڵدەدانیان پێڕەوی ئەکردنی مادەکانی ئەو دو پەیمانەیە. بەڵام هەردو دەوڵەت نە ئەوەندە متمانەیان بە یەکتری هەبوە، ڕێکەوتنەکان بە تەواوی جێبەجێ بکەن. نە ئەوەندەش توانای جێبەجێکردنیان هەبوە و، لە ماوەی دیاریکردنی هێڵی سنوردا هەردو لایان هەوڵیان داوە فراوانترین ئەرزەکانی سنور بهێننە ناو قەڵەمڕەوی خۆیان و زۆرترین ژمارەی ئێلەکانی سنور بهێننە ژێر تەبەعییەتی خۆیانەوە.

## ڕۆژنامەی زەورا و هەورامان

ڕۆژنامەی زەورای بەغدادی کە ڕۆژنامەی فەرمی حکومەتی ولایەتی بەغداد بوە لە ژمارەکانی 5 و 6 و 7 و 12 ی ساڵی 1286 دا هەواڵی کوشتنی حەسەن سوڵتان و پەشێوانی هەورامان و هێرشەکانی ئێران بۆ

سەر ناوچەکە و شەڕ و پێکدادانەکان و. ئاوارەبونی هەورامیەکـان و هەوڵـی عوسـمانی بـۆ گێڕانەوەیـان بـۆ شوێنەکانی خۆیان بە ئاشتی، بڵاو کردۆتەوە.

دەوڵەتی عوسمانی هەوڵی داوە هەردولا رازی بکا. کاربەدەستانی سنوری راسپاردوە بۆ رێکخسـتنەوە و نزیکخستنەوەیان لە یەکتـری، ئێرانیەکـان گوێیـان نەداوەتە ئەوە. بەردەوام بـون لە سـەر شـەڕ و راونـان. (عزاوی، 7/185 - 189)

رۆژنامەی زەورا هەندێ بابەتی هەستیاری باس کـردوە، کە مێژونوسـانی ئەردەڵانـی لە گێڕانەوەکـانی خۆیان دا توخنی نەکەوتون، لەوانە:

**یەکەم**، مێژونوسەکانی ئەردەڵان، سەرەڕای جیاوازییان، دانیشتوانی هەردو هەورامانی تەخت و لهۆنیان، هەر یەکەیـان بە 5 هەزار کەس، کە هەردوکیـان ئەکـاتە 10 هەزار کەس خەمڵانـدوە. کەچـی زەورا ژمـارەی عەشیرەتی هەورامانی بە 20 هەزار کەس خەمڵاندوە، هەروەها ژمـارەی پەنـابەرانی هەورامـی لە سـەرەتادا 7 هەزارکەس بون لە بەر زۆری ژمارەیان کاربەدەستانی عوسمانی نەیان توانیوە رێگەیـان لـێ بگـرن، یـا بیـان گێڕنەوە دواوە بۆ ئێران. لە پاش ماوەیەک ژمارەیان بۆتە 20 هەزار ئاوارە.

**دوەم**، زەورا لە گێڕانەوەی هەواڵەکانی دا باس ئەکا کە هێزی ئیرانی چۆتە ناو شاخەکانی هەورامانەوە قەتڵوعامی خەڵکەکەی کردوە، دەستی لە کەس نە پاراستوە، چەکهەڵگر و گوندنشین، ژن و منداڵیـان کوشـتوە، دەستی هەنـدێک و قـاچی هەنـدێکیان بڕیـوە و، ئاواییەکانیـان سـوتاندون و بـاخە بەرداره‌کانیـان بڕیـون، داڵدەدانی ئاوارەکانیان خستۆتە خانەی بەزەیـی مـرۆڤپەروەرانەوە. مێژونوسـەکانی ئەردەڵان ئەم زانیارییـانە پشتڕاست ئەکەنەوە.

**سێیەم**، مێژونوسەکانی ئەردەڵان لە گێڕانەوەکانیان دا هۆی پەلاماردانیـان ئەگێـڕنەوە بـۆ "طوغیـان و بەغـی و شـەرارەت"، کە یـاخی بـون لە دەسـەلاتی ئێرانـی. بەڵام رۆژنـامەی زەورا هـۆی نـاکۆکی نیـوان هەورامیەکان و ئێران ئەگێڕێتەوە بۆ ناکۆکی مەزهەبی شیعی - سـوننی. دەسـەلاتی ئێرانـی و کاربەدەسـتانی ولایەت لە سەرو هەمویانەوە فەرهاد میرزا شیعە بون و، دانیشتوانی هەورامان سـوننەی شـافیعی بـون. هـۆی وێرانکردنی ئاواییەکانیان و هەڵکەندن و بڕینی باخەکانیان و کوشـتنی شـەڕکەر و گونـدی و ژن و پیـاو و منداڵ و گەورە بەو دڕندایەتیە بە "کینەی مەزهەبی" داناوە.

**چوارەم**، بە قسەی مێژونوسەکانی ئەردەڵان باجی هەورامانی لهۆن 300 تمەن و هی هەورامانی تەخـت 700 تمەن بوە، کە نەیان توانیوە لە کاتی خۆی دا دابینی بکەن، یا نەیان ویستوە بیـدەن. دوای شـەڕەکان و شکانی سانەکان هەمو جار هەریەکەیان 3 هەزار تمەنیان لێ سەندون ئینجـا رێگەیـان داون بگەڕێـنەوە سـەر شوێنەکانی خۆیان. پێ ئەچێ شەڕەکان "گەڕی پارە" بو بن.

بابی عالی بۆ پاراستنی دۆسـتایەتی لە گەڵ ئێـران، داوای لە کاربەدەسـتەکانی خـۆی کـردوە، رەوانەی ئیرانیان بکەنەوە. بەڵام لە بەر ئەوەی ژمارەیان زۆر و سـوننی مەزهەب بـون، داوایـان لە ئێـران کـردوە بیـان بەخشن و بە خۆشی رێگەیان بدەن بگەڕێنەوە سەر ئاواییەکانی خۆیان. بەڵام ئیران داوای کـردوە رادەسـتی ئەوان بکرێنەوە. عوسمانی بۆ ئەوەی درێژە بە گفتوگۆ بـدەن بـۆ مـاوەی 3 مانـگ لە شـارەزور و سـلێمانی داڵدەیان داون، تا چارەیەک بۆ گرفتەکەیان ئەدۆزنەوە. سەرەنجام لە نێوان ئەوەی بگەڕێنەوە وڵاتـی خۆیـان، یان دور بخرێنەوە لە دیاربەکر نیشتەجێ بکرێن، بە کەساسی گەڕاونەتەوە وڵاتی خۆیان.

*بۆ ئاگاداری لە نامە ئاڵوگۆڕکراوەکانی نێوان کاربەدەستانی قاجاری و عوسمانی بڕوانە:*
*دفتـر مطالعـات سیاسـی و بـین المللـی، گزیـده اسـناد سیاسـی ایرانـی و عثمـانی: دوره قاجـاریه، جلـد دوم، 1369 - تهران، سند شماره: 340/ 341/ 344/ 350.*

هاوزەمان لە گەڵ ئەم ڕوداوانەی هەورامان دا هەندێ ئاغا لە سلێمانیەوە هەڵاتون بۆ سنە. فەرهاد میرزا لە بەرامبەر داڵدەدانی هەورامیەکان لە سلێمانی ئەویش داڵدەی ئەوانی داوە لە سنە. ویستویەتی وەکو بابەتێ لە "ڕەفتاری هاوشێوە" لە پەنادانی سیاسی دا بەکاریان بهێنێ. *(تحفەی ناصری: 301)*

کوڕانی حەسەن سوڵتان وئامۆزاکانی، ساڵێکیان لە سلێمانی بە پەریشانی و تەنگدەستی بە سەر بردوە، لەو ژیانە بێزار بون. ئەحمەد سوڵتان، کە یەکێ لە پیاوە ناسراوەکانیان بوە، پەنای بۆ شێخولئیسلامی سنە بردوە، بۆی تێکەوتوە، فەرهاد میرزا بەخشیوێتی. ئەوانی تر بەمە ئومێدی گەڕانەوەیان پەیدا کردوە. محەمەد سەعید سوڵتان، هاوسەرەکەی پیرۆزە خانم کە لە شێخانی عەبابەیلێ بوە، لە گەڵ ڕۆستەم بەگی کوڕی ڕەوانەی ماڵی عەلی ئەکبەر کردوە کە لای فەرهاد میرزا عەفوی بۆ وەربگرن و بگەڕێتەوە خۆی بهاوێژێتە تەویلەکەی فەرهاد میرزاوە. فەرهاد میرزا دیسانەوە توانیوێتی دەستی ئەم بنەماڵەیە ببڕێ. شکۆی پایەی "سوڵتان" بشکێنێ. بە عەلی ئەکبەر و پیرۆزە خانمی وتوە: ئەگەر شا قسەی من ببیستێ بە دڵنیاییەوە نایەڵم سەری مویەک زەرەری گیانی یا مالی بە مێردەکەت بگا. بەمجۆرە ناردی محەمەد سەعید هاتەوە لە گەڵ کۆمەڵێ لە دەستوپێوەندەکانی. خۆی هاویشتە تەویلەکەی فەرهاد میرزاوە. عەلی ئەکبەر چو لە پەناگاکەی دەری هێنان و بردنی لە ماڵی یەکێ لە پیاوە ناسراوەکانی سنە دای مەزراندن. بۆ ئەوەی هێمنیان بکەنەوە 3 مانگێ بەمجۆرە ماونەتەوە. ئینجا فەرمانی کوشتنی محەمەد سەعید و کوڕەکانی دەرچوە. هەر لەم ماوەیەدا بارام بەگی برای حەسەن سوڵتان لە زیندان دا مردوە. مستەفا بەگی برایان کە پیاوێکی بێوەی بوە، بە کەفالەتی سنەییەکی کاربەدەست بەردراوە بەو مەرجەی خۆی و خێزانەکەی لە سنە دەر نەچن.

فەرهاد میرزا کوشتنی محەمەد سەعید و کوڕەکانی بە عەلی ئەکبەر سپاردوە. عەلی ئەکبەر بۆ هەڵفریواندنی سەعید بەڵێنی ئەداتێ کە لای فەرهاد میرزا شفاعەتی بۆ بکا و حکومەتی لهۆن بەو بدا، بەو مەرجەی لە گەڵی بچێ بۆ جوانڕۆ. لە وێوە بنێرێ ئەوڕەحمان بەگی کوڕی بێتە لای بۆ ئەوەی ئەوڕەحمان بەگ وەک بارمتە لای ئەم بمێنێتەوە و سەعید بچێ کاروباری لهۆن بگرێتە دەست. عەلی ئەکبەر بەم تەگبیرە حوکم و خەلعەتی بۆ وەرگرتوە. پاش هەفتەیەک عەلی ئەکبەر بە ڕێ کەوتوە بۆ جوانڕۆ. سەعید خێزانەکەیشی لە گەڵ خۆی بردوە. سەعید دڵنیا نەبوە لە نیازی عەلی ئەکبەر، لە بەر ئەوە بە درێژایی ڕێگاکە هەندێ جار ماوەیەک خۆی پێش خستوە و هەندێ جار مەسافەیەک خۆی دوا خستوە. عەلی ئەکبەر بۆ ئەوەی دڵنیای بکا بە درێژایی ڕێگاکە گوێی نەداوەتێ. لە جوانڕۆش ڕێگەی داوە بە ئارەزوی خۆی لە هەر جێیەک خۆی بیەوێ نیشتەجێ بێ. پاش چەند ڕۆژێ ئاگاداری کردوە مانەوە بەوجۆرە لە جوانڕۆ سودی نیە داوای لێ کردوە بنێرێ ئەوڕەحمانی کوڕی بێتە لای ئەو بمێنێتەوە و خۆی بڕوا بۆ لهۆن.

سەعید پەیک و پەیامی ناردوە بۆ ئەوڕەحمان و ئەوڕەحمان هاتوە.

نیوەشەو سەیفور بەگ، نایبی حکومەتی جوانڕۆ، کە نۆکەرێکی باوەڕپێکراو و جەربەزەی خۆی بوە، بانگ کردوە بۆ ئەوەی پێکەوە نەخشەی کوشتنی دابنێن. وا پێکهاتون:

- ئەم. سبەی بەیانی سەعید و کوڕەکانی بانگ بکا گفتوگۆی حکومەتی هەورامانی لهۆنی لە گەڵ بکا.
- ئەو. چەند کەسێ لە نۆکەرانی ئازا و زرنگ بە کەرەستەی شەڕەوە لە ناو قەڵادا خۆیان مەڵاس بدەن، کاتی نانی نیوەڕۆ سەیفور بێت و سکاڵا لە نۆکەرەکان بکا، ئەو بە بیانوی تەمێکردنی نۆکەرەکان لە ژور دەربچێ. سەیفور و نۆکەرە چەکدارەکان بڕژێنە ژورەوە پەلاماری سەعید و کوڕەکانی بدەن و زنجیریان بکەن.
- بە درێژایی شەو خەریکی ئامادەسازی نەخشەکە بون.

رۆژی دوایی لە کاتێک دا سفرە راخراوە بۆ نان خواردن. سەیفور دێت ئەڵێ نۆکەرەکان جنێویان پێ داوم. سەعید، بێ ئاگا لەو داوەی بۆی دراوەتەوە، بە سەیفور ئەڵێ تۆ سەرۆکی هەمو نۆکەرەکانی، بۆ تۆ شایستە نیە شکات لە بەردەستەکانی خۆت بکەی. سەیفور سوێند ئەخوا تا عەلی ئەکبەر دارکارییان نەکا نە نان بخوا و ئیتر نە نۆکەری بکا. عەلی ئەکبەر خۆی ئەشڵەژێنێ بە پێی پەتی لە ژورەکە دەرئەپەڕێ. لەو کاتەدا نۆکەرە ئامادە کراوەکان خۆیان ئەکەن بە ژوردا، سەعید و دو کوڕیان ئەگرن و، لە دەرەوەش چەند کەسێکی تریان لێ ئەگرن. دەسبەجێ سەعید ئەکوژن. هەروەها میرزا ئەبوبەکری نۆکەریش بە گوللە ئەکوژن. خێزانەکەی کە زانیویتی بە سەر و پێی پەتی و هاوار و گریان هاتۆتە دەرێ، پاراوەتەوە ئەورەحمانی کوڕی نە کوژن. عەلی ئەکبەر ئەورەحمان و رۆستەمی ناردوە بۆ زیندان. رۆستەمی لە بەر منداڵی ناردۆتەوە بۆ لای دایکی. بەڵام کەسی ناردوە ئەورەحمانیان بە پشتێنەکەی خۆی خنکاندوە و، کابرای بکوژیان فێر کردوە بچێتە بەردەمی دایکی هاوار بکا کە ئەورەحمان لە بەر دڵتەنگی ئەیەوێ خۆی بکوژێ من چەندی هەوڵم داوە دەستی بگرم کەڵکی نەبوە پشتێنەکەی خۆی خستۆتە ملی ئەگەر فریای نەکەوی خۆی ئەخنکێنێ. دایکی کە چوە کوڕە گەنجەکەی بە مردویی دیوە، گیسوی خۆی بڕیوە ویستویەتی ئەویش خۆی بکوژێ.

ساڵی 1287 ک لە پاداشتی ئەم کارەدا، لە سەر پێشنیاری فەرهاد میرزا، شای ئێران نازناوی "شرف الملک"، پلەی سەرتیپی و نیشان و حەمایلی بە عەلی ئەکبەر بەخشیوە.

## نازناوی ئێرانی

لە سەردەمی بنەماڵەی قاجاردا ژمارەیەکی زۆر نازناوی زل و بێ ناوەرۆک بە سەر کەسانی جۆراوجۆردا دابەش کراوە. لە ناو ئەوانەدا کەسایەتی سیاسی، سەربازی، کارگێری، فەرهەنگی، خێڵەکی... تێدایە. هەمو ئەم نازناوانە کە لە لایەن دەرباری قاجارەوە بەخشراون لە پاداشتی خزمەتێک دا بوە کە بەم دەربارە کراوە، یان بە پارە و پێشکەش کڕیویانە. هەندێ لەو کەسانە رەنگە شایستەی ناوی لەوە گەورەتر بوبن، بەڵام هەندێکیان بەدناو و بێمایە بون. بەمە پێگەی کۆمەڵایەتی و چینایەتییان لە ناو کۆمەڵگادا بەرز بۆتەوە بۆ پلەی ئەشراف و ئەعیان و، ئیتر خۆیان لە ریزی چینی ئەریستۆکراتی دا ژماردوە.

عەلی ئەکبەر خان (؟ - 1312 ک) کوڕی سابق خانی کوڕی ئەمانوڵا خانی ئەردەڵان بوە. چەند جارێ کراوەتە حاکمی جوانڕۆ. چەند جارێ لە دەزگای حوکمڕانی سنەدا کاری گرنگی دراوەتێ. یەکێ بوە لە پیاوە دڵسۆزەکانی دەرباری قاجار. چەند جار لە کوردستان کاری دەوڵەتی پێ سپێردراوە و چەند جار لابراوە. هەمو جار کە ترسی گیران و دورخرانەوەی بوە، بە بەرتیل (دیاری و پێشکەش) و، (بەستنشینی) لە پیرۆزگاکانی تاران و ماڵی پیاوە دەسەڵاتدارەکان خۆی پەراندۆتەوە.

یەکێ لە نەریتە دێرینەکانی فەرمانڕەوایانی ئێران بۆ لە ناوبردنی دوژمن و نەیار و ناحەزەکانیان، بە کارهێنانی تاکتیکی "سەرەتا تەفرەدان ئینجا کوشتن" بوە. زۆرجار قورئانی مۆرکراو، یا سوێندخواردن بە قورئان و، ناوبژیوانی خاوەن پایەی کۆمەڵایەتی، دینی، فەرهەنگییان بۆ دڵنیاکردنی کەسی خواستراو بە کارهێناوە، تا رایان کێشاوەتە ناو داوی کوشتنەوە. ئەنجامدانی ئەم کارەیان هەمیشە بە زیرەکی و زرنگی بۆ دانەری پلان و جێبەجێکارەکەی ژماردوە. هەرگیز گوێیان نەداوەتە ئەوەی ئەمە بە غەدر و نامەردی و ناجوامێری و، پەیمانشکێنی دابنرێ، بەڵکو ئەمەیان بە بیانوی مەسڵەحەتی دەوڵەتەوە پاساو داوە.

### ئەم نەریتە لە چیەوە داکەوتوە؟

ئەمە حاڵەتێک نیە کەسێ بە رێکەوت کردبێتی. بەڵکو یەکێ بوە لە نەریتی حوکمڕانی کە لە لایەن چەندین کەس و لە چەندین شوێن و لە چەندین زەمانی جیاوازدا لە ئێران دوبارە بۆتەوە. نوسەرانی مێژوی

کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگی ئێران ئەم کارەیان هەمیشە بە ستایشەوە گێڕاوەتەوە. کارەکەیان بە "لطایف الحیل" پاساو داوە.

عەرەب ئەم نەریتە بە "غەدر" دانەنێ. هەرکەس بیکا لە ڕوی کۆمەلایەتیەوە پێی ئەشکێ و متمانەی خەڵک لە دەس ئەدا و، لە ڕوی دینیەوە بە "وەعدە خیلاف" دائەنرێ کە سزای خوایی بە دوادا دێ.

کورد دەوڵەتی نەبوە. ڕێکخراوەی خێڵەکی عەشیرەتەکانی، چ ڕەوەند و چ نیشتەجێ. کاری لەو جۆرەیان بە نامەردی و ناپیاوی لە قەڵەم داوە. هەرکەس کرد بێتی ئیتر بە جۆرێ متمانەی لە دەس داوە جارێکی تر کەس باوەڕی بە بەڵێنەکانی نە کردوە.

**ڕیشەی ئەم نەریتە ئێرانیە بۆ چی ئەگەڕێتەوە؟**

ئاخۆ لەو پەروەردە کۆمەلایەتیەوە فێری بون کە سەعدی شیرازی، حەکیمی گەورەی ئێرانی، لە "گولستان" دا بە شیعر وەکو پەندی گوێلێگیراو دەری بڕیوە، وتویەتی: "دروغ مصلحت امیز، به است راست فتنه انگیز"؟ واتە: "درۆیەک کە قازانجی تێ دا بێ باشترە لە ڕاستیەک کە فیتنە هەڵبگیرسێنێ."

یاخود لەو پەروەردە دینیەی مەزەبی "شیعە" وە کە لە کاتی پێویست دا ڕەوایەتی بە "تەقیە" کردن داوە؟

زۆر جار نوسەرانی ئێرانی، بە تایبەتی لە بابەتی گێڕانەوەی مێژویی و کۆمەلایەتی دا، پەندێکی عەرەبییان دوبارە کردۆتەوە کە ئەڵێ: "الناس علی دین ملوکهم" بە واتەی خەڵک پێڕەوی لە ئاینی شاهەکانیان ئەکەن. شا بە خۆشی بو بێ یان بە زۆر، دانیشتوانی وڵاتەکەی خۆی هێناوەتە سەر ئاینەکەی خۆی. بە درێژایی مێژوی ئێران ڕاستی ئەم قسەیە سەلمێنراوە. لە نەریتی حوکمڕانی دا هەمان شت دوبارە بۆتەوە. لە ناو کوردیش دا ئەو کەسایەتییانەی بون بە بەشێ لە دەزگای حوکمڕانی قاجار، هەمان نەریتی "تدابیر صائبە" یان کردوە بۆ ئەوەی بە "لطایف الحیل" کەسی ویستراو بخەنە ناو "کمند تدبیر" ەوە.

عەلی ئەکبەر خانی ئەردەڵانی هەمان کاری کرد لە گەڵ محەمەد سەعید سوڵتان و سانەکانی هەورامان (1287 ک).

ئەمیر نیزامی گەڕوسی هەمان کاری کرد لە گەڵ هەمزە ئاغای مەنگوڕ و هاوەڵەکانی (1299 ک).

شامراد خانی بیهتویی هەمان کاری کرد لە گەڵ جوامێر ئاغای هەمەوەند و هاوەڵەکانی (1305 ک).

# خۆشناو (بە نمونە)

خۆشناو یەکێکە لە خێڵە گوندنشینەکان کە لە خۆشناوەتی دا نیشتەجێن. ناوچەی خۆشناوەتی شوێنی ژیان و نیشتەجێ بونی خێڵی خۆشناو بوە، بە میر و بەگ و کوێخا و کرمانجەوە. خۆشناوەتی کەوتۆتە ناوچەکانی نێوان رانیە، رەواندز، شەقڵاوە، کۆیە. هاوسنور بوە لە رۆژهەڵاتەوە لە گەڵ خێڵەکانی ئاکۆ و بڵباس لە رۆژئاواوە لە گەڵ خێڵەکانی هەروتی و سورچی، لە باکورەوە لە گەڵ باڵەک، لە باشورەوە لە گەڵ گەردی.

## گوندی خۆشناو

خۆشناو رەوەند نە بون، گەرمیان و کوێستانیان نە کردوە، لە ئاوایی دا ژیاون. خانویان هەبوە. هەمو خێزانێ بە گوێرەی توانای دارایی و کۆمەڵایەتی خۆی، خانوەکەی گەورە یان بچوک بوە. پێک هاتوە لە ژورێک یا زیاتر.

گوندی خۆشناوەتی، نمونەیەک بوە لە شێوەی ئەندازیاریی گوندی کوردیی ناوچە شاخاویەکان. گوند لە بناری چیادا لە نزیکی کانیاو دا ئاوا کراوەتەوە. تۆپۆگرافیای ناوچەکە و زۆریی و کەمیی ئاوی کانی و کارێز، فاکتەری سەرەکی بوە لە دیاریکردنی زۆری و کەمی ژمارەی خێزان و خانوەکانی دا. هەر ئەمە بۆتە هۆی بچوکی گوندەکان و دوریی و دابڕانیان لە یەکتری. گوندەکان لە سەر کانی بنیات نراون، نەک لە سەر چەمی گەورە و روباری گەورە. بۆیە هیچ گوندێ نەیتوانیوە گەشە بکا ببێ بە شار یا بە شارەدێ. دێیەک کە ژمارەی خێزانەکانی زیادی کرد بێ، هەندێ لە دانیشتوەکانی، بە ناچاری گوندەکەیان بە جێ هێشتوە. ئەگەر لەو نزیکانە کانیاو و ئەرزی کشتوکاڵی تر هەبوبێ بە هەمان ناوەوە. بە زیادکردنی وشەی سەرو و خوارو، کەون و تازە، گوندێکی نوێیان ئاوەدان کردۆتەوە. یا بە یەکجاری لە گوندی دایکانە دور کەوتونەتەوە و رویان کردۆتە گوند یا ناوچەیەکی تر.

خانوەکانی گوند بە ریز لە تەنیشت یەکتریەوە بنیات نراون. ریـزی یەکـەمی لـە لێـواری دۆڵەکـەدا لـە بناری شاخەکەدا دروست کراوە و، لە سەرو ئەوەوە ریزی دوەم و سێیەم و چوارەم هەڵکشاوە بەرەوە لوتکەی کێوەکە. لە دورەوە کە بۆی بروانی وەکو هەرەمێ کە ریزە خانوی ژێرەوە درێژ و دوا ریزە خانوی سەرەوەی کورت بۆتەوە. لە ئاواکردنەوەی دێ دا چەند شتێ رەچاو کراوە:

**یەکەم**، ناوچەی شاخاوی زەوی کشتوکاڵی کەم بوە. بۆ ئەوەی دێیەرەکان نەبن بە ژێر خانوەوە دێ لـە سەرەوەی کانی و کاریز دا ئاوا کراوەتەوە، بە جۆرێ کە زەوی بەراو کەوتۆتە بەردەمی گوندەکـە بـۆ ئـەوەی ئاوی کانیەکە زاڵ بێ بە سەر زەویەکان دا.

دوەم، گوند هەمیشە لە بەر مەترسی هێرشی دەرەکی دا بوە. تاقمی بەهێزتر هـەوڵی دەسبەسـەرداگرتن و داگیرکردنی گوندی لاوازی داوە. بۆ داکۆکی لە یەکتری و، لە ترسی پەلاماری کتـوپڕ و ناکـاو، لـە شـێوەی هێڵی بەرگری دا خانویان بە تەنیشت خانوی یەکتریەوە دروست کردوە و دیواری پشـتەوەی بـە شـاخەکەوە نوساوە.

**سێیەم**، بۆ پاراستنی ئاژەڵ و وڵاخەکانیان لە دزی، شوێنی ژیانی خێزان و کادان و ئاژەڵیـان پێکـەوە داناوە.

خانوەکان بە زۆری لە خشتی کاڵ یا خڕکەبەرد و قوڕ دروسـت کـراون. نـزم و تاریـک و دوکـەڵاوی بون. خانوی گوندەکانی خۆشناوەتی، وەکو گوندەکانی تری دێهاتی کوردەواری، پاشەڕۆی ئاژەڵ و وڵاخیـان لە ناو دێکەدا فڕێ داوە. تەوالێت و شوێنی خۆشتنی تێدا نەبوە. بۆ خۆشتن و سەراو چونەتـە گـوێ چـەم و دەشتودەر. تەوالێتیان بە پێویست نەزانیوە. لە باتی تەوالێت گەوڕی وڵاخەکانیان بە کار هێناوە. کـانی ژنـان، شوێنی کۆبونەوە و یەکتربینینی ژنان و کچانی دێ بـوە، ئەگـەر هـەبوبێ ئـافرەت کـوڵی لـێ کـردوە، ئـاوی خواردنەوە و پێویستی خێزانەکەی بە گۆزە یان بە کوندە لێ هێنـاوە. لـە هـاوین دا، لـە تـاو کـێچ و ئەسـپێ و مشک، هەروەها لە تاو تەپوتۆزی دێواران دوای گەڕانەوەی گاران و رانـە مـەڕ لـە لـەوەڕگـا بـۆ نـاودێ، لـە بەر ماڵان و لە ناو ئاوایی، هەندێکیان لە نزیـک گونـدەکانی خۆیـان چونەتـە نـاو باخەکانیانـەوە کـەپرێکی هاوینەیان کردوە، یان بۆ لەوەڕاندنی رانەکانیان چونەتە کوێستانەکانی نزیکی گوندەکانی خۆیان رەشـماڵیان هەڵداوە.

## رێچەڵەکی بنەماڵەی میر

بنەماڵەی فەرمانڕەوای خێڵی خۆشناو، وەکو خۆیان ئەڵێن، پێک هاتون لە نەوەی کابرایـەک بـە نـاوی نێنز، کە ئەبێ باپیرە گەورەی سێ بەرەباب بێ بە ناوەکانی: میر یوسفی، میر مەحمەلی، پشتگەلی.

خۆشناو باسی لە شەرەفنامە دا (1596 ز) نە هاتوە. بەڵام ریچ لە سـەردانەکەی دا (1820 ز) باسـی کردون. ریچ لە گەشتەکەی کوردستانی دا لە میانی گفتوگۆیەکی دا لە گەڵ هەندێ لە پیـاوە ناسـراوەکانی ئـەو کاتەی سـلێمانی، کـە جـۆری سیسـتەمی کۆمـاری ئەمـەریکـای بـۆ رون کردونەتـەوە، یـەکێ لـە ئامـادەبوانی دانیشتنەکە وتویەتی: "ئەمەیان لە خێڵەکانی خۆشناوەتی دەچێ، کە هەر گوندێکیان سـەرۆکی خـۆی هـەیـە و هەمویشیان بۆ بەرژەوەندی تێکڕای خێڵەکە کـۆ دەبنـەوە و راوێـژ دەکـەن." ئەگـەرچی ئـەو پیـاوە وای تـێ گەیشتوە، بێگومان بەراوردی سیستەمی فیدرالی ولایەتەکانی ئەمـەریکا زۆر جیـاواز بـوە لـە گـەڵ سیسـتەمی فیۆدالی هۆزەکانی خۆشناوەتی، لێکچواندنەکەیان لە جێی خۆی نە بوە.

بەم بۆنەیەوە ریچ لە پەراوێزی یاداشتی ئەو رۆژەی دا باسی خۆشـناوی نوسـیوە ئـەڵـێ: "هۆزەکـانی خۆشناو سیانن: میر مەحمەلی و میر یوسفی و پشدەری (راستەکەی پشتگەلی). دوانەکەی یەکەمیان هەمیشە لە

شەڕیان کە لە بەرژەوەندی میری بابانیە و ئەگەر بە هۆی وریایی خۆیەوە نەبوایە، نەیدەتوانی دەسەڵاتی بە سەریان دا بسەپێنێ و کەڵک لەو دوبەرەکییەی ناوخۆیان وەربگرێ. وەک تورک و ئیرانیەکان بە هەمان هۆ دەسەڵاتی خۆیانیان بە سەریا سەپاندوە. چەمێکی بچکۆلە لە نێوان ئەم دو هۆزەدا هەیە و مزگەوتێکی هاوبەشیان هەیە، رۆژانی هەینی بۆ نوێژکردن تێدا کۆ دەبنەوە و پاش ئەوە بڵاوەی لێ دەکەن و بۆ شوێنی خۆیان دەگەڕێنەوە. لای چەمەکە دیسان دەست بە تەقەکردن لە یەکتری دەکەنەوە. جارێکیان لە مزگەوتەکەدا لێیان بو بە شەڕ. بیست، یان سی کەسیان لە یەکتری کوشت بو.

جلوبەرگیان وەک هی نامێدی وایە و زمانیشیان لە شێوەزمانی بابانی و بادینانی تێکەڵە. هەمان سەرنج بە سەر ئەو کوردانەی رەواندزیش دا دەچەسپێ، کە نەمتوانی ناوی هۆزە سەرەکیەکەیان بدۆزمەوە. پێم وایە لە نێوان خۆشناو و رەواندزی دا دیکانی و جوتیار نین." *(ریچ، 121)*

## دیواخانی میر: ناوەندی فەرمانڕەوایی

ناوەندی فەرمانڕەوایی میرمەحمەلی شاری شەقڵاوە، ناوەندی فەرمانڕەوایی میریوسفی گوندی بالیسان و ناوەندی فەرمانڕەوایی پشتگەلی گوندی بێتواتە بوە. هەر یەکێ لەم ناوەندانە گەورەیەکی هەبوە کە خۆیان پێیان وتوە میر. هەر میرێکیان زیاتر لە 10 گوندی گەورە و بچوکی لە ژێر دەس دا بوە. گوندەکان لە نزیک کانیی ئاو بنیات نران. میر، لە شەڕ و ئاشتی دا، گەورەی هەمو پیاوەکانی بنەماڵەکەی خۆی و کرمانجەکانی گوندەکانی ژێردەستی بوە. بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی مەلا و میرزا و سەرکار و خزمەکار و نۆکەر (پیاو) ی چەکداری هەبوە. دانیشتوانی هەر دێیەکی پێکهاتوە لە چەندین خێزان، کە ناوکی پێکهێنانی چەندین خێزانی فراوان و بەرەباب بون، لە رێگەی کوێخایەکەوە بەڕێوە براوە. کوێخای دێ کە بە زۆری گەورەی بەرەبابی دانیشتوی دێیەکەی خۆی بوە، کەسی پێوەندی نێوان میر و گوندنشینەکان بوە. ئەگەر دێیەک دو بەرەباب یا زیاتری تێدا بو بێ، دو کوێخا یا زیاتر سەرپەرشتییان کردوە. هەر بەرەبابێ بۆ ئەوەی لە بەرەبابەکانی تر جیا بکرێتەوە ناوی تایبەتی خۆی هەبوە. دیواخانی میر جێگەی کۆبونەوەی کوێخاکان و دەمڕاستەکانی گوندەکە بوە. میر لە دیواخانەکەی دا بڕیارە گرنگەکانی ئاوە دەربارەی: سەندنی باج و سەرانەکانی خۆی، بەلاداخستنی کێشەکانی نێوان گوندیەکانی ژێردەستی بە پێی ئارەزوی خۆی یا عورفی کۆمەڵایەتی یا بنەمای دینی، دەرکردنی فەرمانی خۆسازدان بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوەکی و دەرەکی ناوچەکەی ژێر دەسەڵاتی، دەرکردنی فەرمانی هێرش بۆ سەر دەوروبەری. نوێنەرایەتی کردن لە بەرامبەر ناووەدزگای فەرمانڕەوا و ئێل و هۆزەکانی تر.

بنەماڵەی فەرمانڕەوا، کە بە میرانی خۆشناو ناسراون، دەوڵەمەند و هەژار و دەسەڵاتدار و بێدەسەڵاتیان، هەڵگری نازناوی بەگ و گوندنشینەکان بە گشتی، سەرەڕای پلەی دەوڵەمەندی و هەژارییان، پێیان وتراوە کرمانج. کرمانج نەیتوانیوە ببێ بە بەگ، یا بە یەکێ لە بنەماڵەی فەرمانڕەوا. تەنیا رێگەیەک بۆ گۆڕانی پێگەی کۆمەڵایەتی - چینایەتی کرمانجێ، تەواوکردنی خوێندنی دینیی و وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی بوە. کوڕە کرمانجێ کە بۆتە فەقێ و سەرەنجام بۆتە مەلا، پایەی کۆمەڵایەتی بەرز بۆتەوە. هەندێ لە گوندەکان مەلا و مزگەوتی تێدا بوە و، لە هەندێکیان دا قوتابی و فەقێ خوێندویانە. مانگانەی مەلا و بودجەی مزگەوت لە لایەن وەقفی مزگەوتەکە و دانیشتوانی گوندەکەوە دابین کراوە. رەنگە لە گوندێک دا تەنیا خوێندەوار بۆ نوسین و خوێندنەوەی نامە و ئەرزوحاڵ هەر مەلا بوبێ. جیا لە حوجرە و مەدرەسەی دینی، قوتابخانە یا جێگەیەکی تر نەبوە بۆ خوێندن و فێربونی نوسین.

## مزگەوت و مەلا

مزگەوت لە ژیانی گوندا گرنگیەکی زۆری هەبوە. نوێژی جەماعەت و هەینـی تێـدا کـراوە. بـەیانیـانی جەژنەکانی ڕەمەزان و قوربان بۆ نوێژی جەژن و نانخواردنی بە کۆمـەڵ و گـەرمنتازانی تێـدا کۆبونەتـەوە. میوانی نە ناسراو لە مزگەوت دا ماوەتەوە. مەلا هەم لە لای بەگ و هەم لە لای کرمانج ڕێزی هەبوە. لە هەنـدێ کێشەی کۆمەڵایەتی دا ڕاوێژی پێ کراوە. ئاغا و بەگ ئیشیان بە مەلاکان هەبوە بۆ ڕەوایەتیدان بە هەنـدێ لە کار و بڕیارەکانیان. بانگدان، پێشنوێژی کردن، ئامۆژگاری دینی، مارەکردن و تەڵاقـدانی ژن، کفـن و دفـن و یاسین و تەڵقینی مردو، قورئان خوێندنی ناو کۆڕی پرسە و ماتـەمین، ناونـانی منـاڵ و بانگـدان بـە گـوێی نەوزانی تازە لە دایک بودا. ئەمانە لە ئەرکەکانی مەلا بون. کەم وا بوە مەلا خەڵکی گوندەکە بو بێ، بە زۆری لە شوێنانی ترەوە هێنراوە. هەندێکیان مەلای تـەواو بـون، خوێنـدنی مەلایـەتیـیان تـەواو کـردوە و، لـە لای مەلایەکی ناسراو "ئیجازەی عیلمی" لە ئاهەنگێکی تایبەتی دا وەرگرتـوە و، مێـزەری مەلایـەتی کراوەتـە سـەر. هەندێکی تریان وەکو کورد ناوی لێ ناون "کۆلکە مەلا" بون. ڕەنگـە هـەر قورئـان و کـەمێکیان خوێنـد بـێ. هەندێ لەم کۆلکە مەلایانە دەوری کاریگەریان هەبوە لە بڵاوکردنەوەی خورافیـات و بـاوەڕی پڕوپـوچ دا. زۆر جار مەلا لە ڕێگەی نوشتە و دوعا و، هەندێ زانیاری ناو کۆنە کتێبـەکان لـە سـەر چـارەی نەخۆشـی، دەوری پزیشکیان دیوە.

خۆشناو، هەندێ مەلای بە ناوبانگیان تێ دا هەڵکـەوتوە، لەوانـە مـەلا عەبـدوڕەحیمی زیـاری خـەڵکـی گوندی زیارەت، کە چەندین زانای ئاینیی لە بەر دەستی ئەودا پێگەیشـتون. هـەروەها مـەلا محەمـەدی خـەتێ، خەڵکی گوندی خەتێ، کە ئەویش سەرەڕای ئەوەی چەندین زانای ئایینی لە بەر دەستی دا پێگەیشتون، هەندێ بابەتی دینیی قوڵی بە زمانی عەرەبی داناوە. مەلای خەتێ پایەی دینیی ئەوەندە بەرز بـوە بـە ڕاسـت بـێ یـا ناڕاست ئۆباڵی کۆتایی میرایەتی میری سۆران، میـر محەمـەد پاشـای ڕەوانـدزی، خراوەتـە ئەسـتۆ (1252 ک/ 1836 ز). *(سـەرچەمی بەرهـەمی حوسـێن حـوزنی، بـەرگی دوەم، مێـژوی میرانـی سـۆران، دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس. هەولێر - 2007: 57 - 58)*

ئەمانی دەسەڵاتی میرایەتی بابان و ئەمانی دەسەڵاتی میرایەتی سۆران، بۆشـایی دەسـەڵاتـی دروسـت کردوە. دەسەڵاتی عوسمانی ئەی توانیوە پـڕی بکاتـەوە. لـە هەنـدێ ناوچـەدا سـەرانی خێڵـەکان بەشـێکی و شێخانی تەریقەت بەشەکەی تریان پڕ کردۆتەوە. لە خۆشناوەتیـیش چەند بنەماڵـەیـەکی شـێخ لـە گونـدەکانی هیران، زێخان، بالیسان، بلێ.. هەبون بەڵام نەیان توانیوە پەرە بسێنن، دەروێش و سۆفی، مورید و مەنسـوبی زۆر پەیدا بکەن. میرانی خۆشناو خۆیان دەسەڵاتیان گرتۆتە دەس. نەیـان هێشـتوە شـێخانی تەریقـەت یـان سادات دەزگایەکی ئەوتۆ دابمەزرێنن ببنە هاوبەشیان. دڵسۆزی و گوێڕایەڵی بۆ شێخی تەریقـەت دڵسـۆزی و گوێڕایەڵی بۆ سەرۆکی خێڵ لاواز کردوە. لە بـەر ئـەوە ڕێگـەیـان نـەداوە کرمانجـەکانیان تێکـەڵاوی ژیـانی دەروێشی ببن.

خزمایەتی - هاوخوێنیی لە نێوان بنەماڵەی بەگەکانی خۆشناو و گوندنشـینەکانی ناوچەکـەیـان دا نـە بوە. هاوسەرگیری لە نێوان بەگ و کرمانج دا نە کراوە. بنەماڵەی میر لە ناو چینەکەی خۆی و هاوشـانەکانی دا هاوسەرگیری کردوە. بەگ لە پایەی کۆمەڵایەتی دا خۆی بە گەورەتر زانیوە لە کرمانج.

خۆشناو، پێکهاتەیەکی دەرەبەگی بوە. خاوەنی ڕێکخراوەی کۆمەڵایـەتی، سیاسـی، ئـابوری، کـارگێڕی، فەرهەنگی، چەکداری خۆی بوە. پێوەندی نێوان بەگەکان و گوندنشینەکان لە سەر بنچینـەی زەویـداری بـوە. زەوی لە دەس بەگەکان دا بوە و کرمانج لە زەوی ئەوان دا جوتیار بوە. بنەماڵەی میرانـی خۆشـناو بەرامبـەر

جوتیارەکانیان بێبەزەیی و بە زەبروزەنگ بون. دەوڵەت دەسەڵاتی لاواز بوە، ئەوان دەسەڵاتی فەرمانڕەوایییان بە کارهێناوە. ئـەوان کێشـە و ناکۆکیـەکانی نێـوان کرمانجـەکانیان یـەکلایی کردۆتـەوە. ئـەوان لـە بـەردەم داوودەزگاکانی حکومەت دا نوێنەرایەتی خێڵەکەیان کردوە. دەسەڵاتێکی ئەوەندە بەهێزیان هەبوە، هەندێ جار کرمانجە سەرکێشەکانیان لە تەویلەی وڵاخەکانیان دا زیندانی کردوە. لە سەر سزای سەخت و دەسەڵاتی زۆری میرەکان، بۆ چاوشکاندنی گوندیەکان، دەماودەم ئەگێڕنەوە کە هەندێ جار بە پێی پـەتی، بـە سـەر خـەرمانی دڕکەزی دا گێرەیان بە کرمانج کردوە و، هەندێ جار بە زیندویەتی کرمانجیان لە چـاڵ نـاوە و نـەمامی داری گوێزیان لە سەر چاندوە.

خۆشناوەتی ناوچەیەکی شاخاوی سەختە. زنجیرە شاخی بەرز لە یەکی دابڕیون. ڕێگاکانی هـاتوچۆی دێهاتەکان کوورِ و دژوارن لەوانە: دەرە شیر، دەرە هەرتەل، دەرە زێـوە، سـەربار. زەوی تـەختی کەمـە. کـانی زۆرە. ئابوری ناوچەکەی بریتی بوە لە:

- کشتوکاڵ: توتن و گەنم و جۆ، نیسک و نۆک و ماش.
- باخداری: گوێز، میوە بە تایبەتی ترێ، هەنجیر، هەنار، دۆشاو و سرکە و وشکە.
- وڵاخداری: گا، ئێستر، کەر، بەشێ بوە لە سامانی جوتیار. گرنگی تایبەتییان هەبوە هەم بۆ جوت و گێرە، هەم بۆ گواستنەوەی بار.
- ئاژەڵداری: مەڕ و بزن بە تایبەتی بزنی مەرەز.
- پیشەی دەستی: جۆلایی بە تایبەتی کر.
- ئاشی ئاو: بۆ هاڕینی دانەوێڵە.

خۆشناوەتی یەکێ بوە لەو شوێنانەی لە دێرزەمانەوە مەڵبەندی ژیـانی مـرۆڤ بـوە و، ئـاوەدانی تێـدا بوە. بێتواتە نیگاری هەڵکەنراوی سەر بەرد و نوسـینی مێخیـی شـوێنەواری گرنگـی سـەردەمی کـۆنی تێـدا دۆزراوەتەوە. یاقوتی حەمەوی لە "معجم البلدان" دا باسی شەقڵاوەی کـردوە کـە میـوە و بەشـێ لـە خـواردنی شاری هەولێری دابین کردوە.

باسی خۆشناو و خۆشناوەتی لە شەرەفنامەدا نیە. ئەبێ لەو سەردەمەدا ڕۆڵێکی دیاریان لە روداوەکانی ناوچەکەدا نە بو بێ. تا ئەو سەردەمەی میر محەمەدی ڕەواندز کاروباری گرتۆتە دەسـت، خۆشـناوەتی وەکـو بەشێ لە ناوچەکانی حەریر و کۆیە بەشێ بوە لە قەڵەمڕەوی بابان. بەڵام میر محەمەد بـە شـەڕ لـە میرەکـانی بابانی سەندوە و خستویەتیە سەر قەڵەمڕەوی میرایەتی سۆران و، دانیشتوانی ناوچەکەشی کردوە بـە بەشـێ لە هێزی مرۆیی شەڕکەرانی میرایەتیەکەی.

ژێرخانی ئابوری دواکەوتو، سەرخانی فەرهەنگیی دواکەوتو بەرهەم ئەهێنێ. گونـدەکانی خۆشـناوەتی بـە گشتی لە روی ئامڕازەکانی بەرهەمهێنان، ئاستی ئاوەدانی، خوێندەواری، تەندروستی، پیشەی دەست و کشـتوکاڵ، وەکو شێوەی سەدان ساڵی پێشتر بە دواکەوتویی ماوەتەوە. باوەڕ بە ئەفسانە و ترس لە دێو و درنـج و جنۆکـە و ترس لە دیاردە سروشتیەکان، کەسایەتی مرۆڤی خۆشناوی ئەوەندە شێواندوە داحـەزەکانیان سـەدان نوکتـە و سەرگروشتەیان لە سەر هۆنیونەتەوە. تەنانەت ڕیچ لە یاداشتەکانی دا چەند چیرۆکێکی لەو بابەتەی لە سەر تۆمـار کردون. میرەکان، بەو هەمو دەسەڵاتەوە کە هەیان بوە، شوێنەوارێکی مێژویی یا ئاوەدانی، ڕێگەیەک بۆ هـاتوچۆ، پردێ بۆ پەڕینەوە لە چەمێ، بینایەکی جوان بۆ مەدرەسەیەک یا مزگەوتێ، تەنانـەت کۆشـکێ بـۆ ژیـانی تایبـەتی خۆیان... دروست نە کردوە. ئەمانیش وەکو زۆر لە سەرانی بنەماڵە دەسەڵاتدارەکان و سـەرانی خێڵـەکانی تـری کورد، نەخوێندەوار بون. هیچ بایەخێکیان بـە خوێنـدەواری، ڕۆشـنبیری، فەرهـەنگ نـەداوە. پـەڕەیـەک کاغـەزی نوسراویان لە دوای خۆیان بە جێ نەهێشتوە لایەنێکی ژیانی ئەو سەردەمە رون بکاتەوە.

## خۆراک

ناوچەی خۆشناوەتی زەوی کشتوکاڵی کەم، هەروەها لەوەڕگای کەم بوە. بە کێوەکانەوە هەندێ لێرەواری هەبوە. داری بەڕو، مازو، دارەبەن، بەلاڵوک، گوێژی.. تێدا بوە. لە چرۆی داری بەڕو گەڵ و لە گیای دەشت گزرە بۆ ئالیکی زستانەی ئاژەڵ و وڵاخەکانیان، ئامادە کردوە.

گەنم، جۆ، ماش، نیسک، نۆک، گاڵ، هەرزنیان چاندوە. لە سۆنگەی کەمی زەویەوە نەیانتوانیوە گەنم بەشی خواردنی خۆیان بەرهەم بهێنن. ترێ و میوەیان بە بار بردوە لە گەڵ ناوچەکانی دەوروبەریان گۆڕیوەتەوە بە دانەوێڵە. لە گەنم چەندین جۆر خۆراکی سەرەکی دروست کراوە. لەوانە:

- نانی تەنکی ساج، یا کولێرەی ئەستور، کە خواردنی سێ ژەمەی هەموان بوە.
- گەنمە کوتاو، خواردنی سەرەکی ئێواران بوە.
- ساوەر، خواردنی سەرەکی بۆنەی تایبەتی بوە.
- داندۆک، لە تێکەڵاوکردنی ساوەر و دۆی خەستکراوە ئامادە کراوە، بۆ هەڵگرتن کراوە بە سەلکی وشک. شێخ رەزا وتویەتی: "شاهی کە نەبێ، رادەبوێرین بە فەقیری/ بۆ ئەهلی قەناعەت، لە پلاو خۆشترە، داندۆک."
- خەپلە، ساڵانی قاتوقڕی و کارەساتی سروشتی، ئاردی بەڕو لە گەڵ ئاردی گەنم یا جۆ تێکەڵاو کراوە، خەپلەی لێ دروست کراوە.
- هەروەها ئەستورک، لە کاتی کەمیی گەنم و جۆ، لە گاڵ دروست کردوە.
- مەرەزە، لە بەر کەمیی ئاو یا نە کراوە، یا ئەگەر کرابێ زۆر کەم بوە. برنج خواردنی زەنگینەکان بوە.
- ئاژەڵ، لە لای جوتیار خۆشەویست بوە. کاتێ کوژراوەتەوە کە نەخۆش بوبێ و ئومێدی چاکبونەوەی لێ نەکرا بێ. ئەگینا گۆشت لە بۆنە تایبەتیەکان دا، بە تایبەتی لە جەژنەکانی قوربان و رەمەزان، لە شایی گواستنەوەی ژنان دا، خوراوە.
- مریشک و قاز و مراوی، لە لای خێزانی جوتیار خۆشەویست بوە، لە بەر هێلکە و جوجەڵە، ڕاگیراوە.

لە داپاڵی کێوەکان دا رەزی دێم، بە تایبەتی رەزی ترێی رەش، روێنراوە. بۆ پاراستنی لە زیانی گیاندار بە بەرد، بە بەرزایی مەترێک، چیلەیان لە دەوری هەڵ چنیوە. لە ترێی رەش و سپی چەندین جۆر خۆراک بەرهەم هێنراوە، لەوانە:

- مێوژ، لە وشککردنەوەی دەنکی ترێ ئامادە کراوە.
- دۆشاو، لە کوڵاندنی گوشراوی ترێ و خەستکردنەوەی ئامادە کراوە. لە هێزەدا هەڵگیراوە. بەشێ بوە لە خۆراکی سەرەکی.
- باسوق، لە تێکەڵاوکردنی دۆشاو و ئارد دروست کراوە. بە پەت کراوە بە رست. هەڵگیراوە بۆ زستان.

لە پاڵ بەروبومی کشتوکاڵ دا ئاژەڵداری و وڵاخداری بەشێکی گرنگی ئابوری دێهاتی خۆشناوەتی، بە تایبەتی ئابوری خێزان، بوە. ژمارەیەکی کەم مەڕ، بزنی رەش و بزنی مەرەز، گا و مانگا، کەر و ئێستر، ڕاگیراون. لە گەڵ مریشک، قاز و مراوی، بەشێ لە سامان و داهاتی خێزانیان پێک هێناوە.

کەر، هەروەکو پێشی ئەڵێن گوێدرێژ، یەکێ بوە لەو وڵاخانەی لە خۆشناوەتی بە زۆری بە خێو کراوە. کەر ئەرکی بەخێوکردنی بۆ خاوەنەکەی ئاسانتر بوە لە هی ئەسپ و ئێستر و، چاکتر بەرگەی سەختی

گرتوە. بۆ ئیشوکار بە کەڵکتر بوە. لە ناو رەز و باخ و شوێنی سەخت دا جوتی پێ کراوە. لە سەر خـەرمان گێرەی پێ کراوە. باری پێ گوێزراوەتەوە. لە بەر ئەوەی لە بەرهەمهێنان و راپەڕاندنی ئیشوکاری جوتیاری دا کاریگەریی هەبوە بەشێ بوە لە سامانی خێزان. بـە جـۆرێ تێکـەڵاوی فۆلکلـۆر بـوە لـە نـاو سـەدان پەنـدی پێشینان دا ناوی هاتوە. هەندێ جار بڕینی کەرێ لە نێوان دو گوندا کێشەی گەورەی لێ کەوتۆتـەوە. بڕینـی کلکی کەر بە سوکایەتیەکی گەورە دانراوە بـۆ خاوەنەکـەی. ئـەویش بـۆ سـڕینەوەی ئـەو ریسواییە، ئەگـەر توانیبێتی، کلکی کەر یا گایەکی نەیارەکەی بڕیوە و. هەندێ جار ئەم کـارە بۆتـە هـۆی هـەڵگیرسـانی شـەڕی خوێناوی درێژخایان لە نێوان دو خێزان، دو تیرە، دو دێ دا.

یەکێ لەو ئاژەڵانەی لە خۆشناوەتی بەخێو کراوە بزنی مەرەز بوە. بزنـی مـەرەز سـەرەڕای گۆشـت و شیر، لە بەر موەکەی راگیراوە. جگە لە رەش و سپی رەنگی سروشتی جیـاوازی هـەبوە. لـە کۆتـایی بـەهاردا موەکەیان بڕیوەتەوە. لە دڕکوداڵ پاک کراوەتەوە. بە ئاو شۆراوەتەوە. بە تەشـی رێسـراوە. کـراوە بـە داوی باریک و داوەکان کراون بە گلۆڵە.

## پیشەی دەست

جۆلایی پیشەیەکی دەستیی گرنگ بـوە. بەشـێ لـە پۆشـاکی دانیشـتوانی ناوچەکـە و پێویسـتیەکانی ناوماڵی دابین کردوە. رستن کاری ژنان و، چنین ئیشی پیاوان بوە.

جۆلا لە مەرەز و خوری، بوزو (کر، شاڵ) و جاجم و پۆپەشمین و بەرماڵ (دوگرد) و. لـە لۆکـە جـاوی چنیوە. بوزو رانکوچۆغەی پیاوانی لێ دروست کراوە و، جاو، چ بـە رەنگـی ئاسـایی و چ دوای رەنگکردنـی، کراوە بە کراسی ژنانە و پیاوانە.

گوندی بێتواتە و شارەدێی شەقڵاوە جۆلای دەسـتڕەنگینی تێـدا بـوە کـە پشتاوپشـت ئـەو پیشـەیـە فێربون و پاراستویانە و، بوزوی جوان و جۆراوجۆری بەرهەم هێناوە.

سەرژمێرێکی تەواو بە دەستەوە نیە لە سەر ژمارەی خێڵە کوردەکان بەڵام بۆ ئـەوەی بیرۆکـەیـەک لـە سەر ژمارەی دانیشتوانی ئەو ناوچانە، بە تایبەتی خۆشناوەتی و دراوسێکانی، لە دوای کارەسـاتەکانی یەکـەم جەنگی جیهانی بە دەس بێ. کاپتن هەی کە خۆی بۆتە حاکمی ناوچەکە (1918 - 1920) بەمجۆرە ژمارەی دانیشتوانی خەملاندوە: *(های: 40)*

- هەولێر 14000 کەس
- رەواندز 1500 کەس
- شەقڵاوە 3000 کەس
- کۆیە 5000 کەس
- ئاڵتون کۆپری 2000 کەس
- مەخمور 1000 کەس

ئەشێ بیرۆکەیەک لە سەر ژمارەی خۆشناو لە ناو دانیشتوانی شـەقڵاوە، کۆیـە، رەوانـدز دا، بـە دەس بێ. بەم پێیە دانیشتوانی خۆشناوەتی، بەو هەمو ئاوایی و گوندەوە، ژمارەیان لە چاو هەندێ خێڵی تـردا زۆر نەبوە.

ناوی گوند و شاخ و کانی و چەمەکانی خۆشناوەتی، هەندێکی وشـەی کـوردی بـاو و هەنـدێکی هـی زمانی سەردەمێکە کە ئێستا لە بیر چۆتەوە.

لەناوی شاخەکانی: هەورێ، سەفین، پیرمام، ماکۆک، کەژۆست، شیشار، زینەتیر.

لە ناوی لوتکەی چیاکانی: کەڵاوی دێوانـە، ئـاوی کـۆڵان، کڵاوقاسـم، کـەپکی شـیلانە، کـەپکی حەمـەد ئاغا.

لە ناوی گوندەکانی: توتمی، شکارتە، وەرێ، نواوێ، هەرمک، بێرۆ، خەتێ، زێنێ، چیوە، سکتان، بێلنگە، بێکێل، بێلاوا، بیرێژ، مەندێر، مەلۆک، قەلا سـنج، کونەفلوسـە، هیـران، نـازەنین، فریـزەڵـە، کـاوان، سـولاوک، زیارەت، کانی بەرد، سەرنۆڵ، کۆرێ، شێخ وەسان، مێرگەسەر، شیرە، هەرتەل، زێوە، دەراش، خۆران، حوجران، گەرۆتە.

جگە لە کەمایەتیەکی کلدانی کە لە کۆنەوە لە ناوشاری شەقڵاوەدا ژیـاون و، ژمـارەیـەکی کـەم جولەکـە، هەمو خۆشناو کورد و، موسوڵمانی سوننە، لە سەر مەزهەبی ئیمامی شافعی بون. بە توندی پابەندی دین بـون. رۆژانی هەینی نوێژی بە کۆمەڵیان لە مزگەوتی دێکەیان دا کردوە، مانگی رەمـەزان بـە رۆژو بـون، هـەر کـات توانای دارایی رێگەی پێ دابێ حەجیان کردوە، بە سەدان حاجی لە گونـدەکان دا هـەبون. پێیـان وا بـوە بـە ئەنجامدانی فەرزەکانی ئیسلامەتی. هەر تاوانێ بکەن خوا لێیان خۆش ئەبێ. لـە بـەر ئـەوە لـە هەنـدێ تـاوان نەسڵەمیونەتەوە.

ئاینی ژنهێنان و شوکردن، مردن و ناشتن، بەگشتی زمانی داخاوتن و لـە یـەک گـەیشـتن، گـۆرانی و مۆسیقا، حەیران و بەیت، چیرۆک و پەندەکانیان، تەنانەت جلوبەرگیان لە یەک چون.

کابرایـەکی خۆشـناو، لـە ژێـر چـەتری خێڵەکـەی دا، لـە بەرامبـەر دەسـدرێژی و تـەماعی خێڵـەکانی دەوروبەری دا خۆی پاراستوە. میر خۆی لێ کردۆتە خاوەن و داکۆکی لـێ کـردوە. ئـەویش پـەنای بـۆ میـر بردوە. ئەگەر کێشەیەکی کۆمەڵایەتی ناوخۆیی هەبوبێ وەکو ژنهەڵگرتن و رەدوکەتن، یـا ئەگـەر کێشـەیـەکی ئابوری هەبوبێ لە سەر سنوری باخ و زەوی و پشکی ئاوداشتن، لەوەرگا، یا ئەگـەر تـاوانێکی کرابـێ وەکـو کوشتن، دزی، بە پێی نەریتی باوی خێڵایەتی لە سەر دەستی میرەکەی دا چارەسەر کراوە.

بنەماڵەی میـران خۆیـان بـە دەسـتی خۆیـان کاریـان نـە کـردوە. ئـەوان لـە دیواخانـەوە کاروبـاری بـەڕێوەبەرایـەتی و کـارگێری و دارایـی و کۆمـەڵایـەتیـیان کـردوە. بودجـەی دیواخـانی بنەماڵـەی میـران و پێویستیەکانی ژیانی خێزانەکانیان لە داهاتی جوتیارەکان و لە رەنجی کرمانج دابین کراوە. کرمـانج جگـە لـە مولْکانەی زەوی، لە بەرهەمی دانەوێڵە و رەز و باخ، مەڕانە و بزنانە لە بەرهەمی ئـاژەڵ، کـە سـاڵانە لـە لایـەن وەکیلەکانی میرەوە لە کرمانج سـەنراوە. بـۆ ئـەوەی داوودەزگـای حکومـەتی لـە میـر رازی بـێ لـەوە پشـکی حکومەت دراوە، ئەوی تری بۆ خۆی بوە. چەندین باجی تریان لە سەر بوە کـە تایبـەت بـۆ مـاڵی میـر بـوە. سورانە لە کاتی ژنهێنان و شوکردن دا. بەشێ لـە پـارەی "فەسـڵ" لـە کـاتی دوژمنایـەتی و بەشـێ لـە پـارەی "مەسڵەت" لە کاتی ژنهەڵگرتن دا. بێگار لە کـاتی پێویسـت دا. تەنانـەت بـاج لـە مریشـک و هێلکـە، لـە داری سوتاندن. سەنراوە.

لە دوای یەکەم جەنگی جیهانی، کە ئینگلیز عیراقی بە هەر سێ ولایەتی بەسرا، بەغداد، موسڵەوە داگیـر کرد و، سەرلەنوێ دابەشی کرد بە سەر سیانزە یەکەی کـارگێری دا، سـەرەتا کـاپتن هـەی کـراوە بـە حـاکمی سیاسی قەزای هەولێر و، هەر لەو ماوەیەدا کە هەولێر کراوە بـە لیـوا هـەمان کـاپتن هـەی کـراوە بـە حـاکمی سیاسی لیوای هەولێر (1919 - 1920). خۆشناوەتی بە گشتی کەوتۆتە سنوری کاری هەیەوە. لە بنەماڵـەی میران حاکمی بۆ شەقڵاوە و گەورەی بۆ بەرەبابەکانی خۆشناو داناوە.

میرانی خۆشناو هاوکار بون لە گەڵ داوودەزگاکانی حکومەت دا، ئـەوەش پێگـە و دەسـەڵاتـی لـە نـاو خێڵەکەیان دا بەهێزتر کردوە، بە تایبەتی کە پشتەستور بون بە پشـتیوانی حکومـەت. لـە روداوەکـانی شـێخ مەحمودا ئەوان کەنارەگیر بون.

لە دوای پەنجاکانی سەدەی بیستەمەوە کەسانێکی بنەماڵەی میران بونەتە ئەندام لە ئەنجومەنی گەل دا. بنەماڵەی میرانی قادر بەگ (میر مەحمەلی) بە تەنیا خاوەنی چلویەک هەزار و پێنجسەد و هەشتاوچوار (584.41) دۆنم زەوی بوە. (*حنا بطاطو: 81/1*) هەڵوەشاندنەوەی نیزامی دەعوای عەشائیری و شۆڕشی 14 ی تەموزی 1958 و قانونی ئیسلاحی زەراعی دەسەڵاتی بنەماڵەی میرانی خۆشناوی لاواز کرد. بە تایبەتی کە کاری سیاسی - حیزبی هەردو حیزبی سەرەکی ئەو سەردەمە: حیزبی شیوعی عیراق و پارتی دیمۆکراتی کوردستان. کەوتە ناوچەکەوە.

کە ناکۆکی کەوتە نێوان حکومەتی عیراق بە سەرۆکایەتی قاسم و جوڵانەوەی کورد بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانیەوە. بنەماڵەی میرانی خۆشناو و خێڵەکەیان. وەکو جاران. بە یەککگرتویی نە مانەوە. هەندێکیان بە لای جوڵانەوەی کوردا کەوتن و هەندێکیان بە لای حکومەت دا.

## سەرچاوە

بۆ ئاگاداری زیاتر دەربارەی ئەم بابەتە بڕوانە:

دبليو. ار. هي. سنتان في كوردستان 1918 - 1920. نقله الى العربية. حققه. وعلق عليه: فؤاد جميل. الجـزء الاول بغداد 1973. الجزء الثاني بغداد 1973.
المحامي عباس العزاوي. عشائر العراق. الجزء الثاني. بغداد - 1947.
كلاوديوس جەيمس ریچ. گەشتنامەی ریـچ بـۆ كوردسـتان 1820. وەرگێڕانـی لـە عەرەبییـەوە محەمـەد حەمەباقی. سلێمانی - 2012.

# میراودەلی (بە نمونە)

سەرانی میراودەلی، وەکو خۆیان وتویانە، ئەوەی میرناودەلی کوڕی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەن. دارەشمانە گوندێک بوە لە ناوچەی پشدەر. زانگای فەقێ ئەحمەد بوە. فەقێ ئەحمەد باپیرە گەورەی بنەماڵەی پاشا و میر و بەگزادەکانی بابان بوە. قسەی خێڵەکان لە سەر ڕێچەڵەکی خۆیان، بۆ ئەوەی خانەدانیی خۆیان و ڕەوایەتیی دەسەڵاتەکەیان بسەلمێنن، زۆر جار تێکەڵاوە بە چیرۆکی هەڵبەستراو. لە بەر ئەوە زۆر جێگەی باوەڕ نین. بە تایبەتی ئەگەر هیچ بەڵگەیەکی نوسراوی مێژوویی قسەکە پشتڕاست نەکاتەوە.

میراودەلی وەکو بنەماڵەیەکی ناسراو یان وەکو خێڵێکی بەهێز پێ ئەچێ تازە بێ. لە شەرەفنامە دا (1005 / 1596) باسی نەکراوە. تەنانەت ئەو ساڵەش (1820) کە ریچ سەردانی کوردستانی کردوە ناوی نەبوە. ریچ لە گەشتەکەی دا گفتوگۆیەکی درێژی لە گەڵ پیرەمێردێک کردوە کە لە گوندی دارەشمانەوە هاتۆتە سلێمانی و لە هەمان بنەماڵەی میرەکانی بابان بوە. لە زمانی ئەوەوە چیرۆکی فەقێ ئەحمەد و کەیفانی تۆمار کردوە. ئەم پیاوە نە ناوی میرناودەلی هێناوە وەکو ئەوەی فەقێ ئەحمەد و نە باسی هۆزی میراودەلی کردوە وەکو تیرە و هۆز. ریچ خۆیشی بە ناو و بە ژمارە باسی خێڵە ڕەوەند و گوندنشینەکانی قەڵەمڕەوی بابانی نوسیوە بەڵام ناوی بنەماڵە، تیرە یا هۆزێکی بە ناوی میراودەلیەوە نە نوسیوە. بەڵکو لە ڕیزی خێڵە "نیشتەجێ و سەقامگیرەکان... لە ناوچەی پشدەر" دا باسی "هۆزی سەکر و نورەدینی" کردوە و ئەڵێ: "ئەم دو هۆزە نزیکەی 100 گوندیان دەبێ و دەشتوانن نزیکەی هەزار کەسێک چەکدار بکەن". *(ریچ: 286)*

ئەمین زەکی، وەزیری سەردەمی حوکمی پاشایەتی و مێژونوسی کورد، نوسیویەتی: "خانەدانی ئاغاوات: بە گوێرەی ڕیوایەتی خۆیان لە نەتەوەی (میر عەبدال: میر عەبدوڵا) ناوێکن. لە نەتەوەی ئەم زاتە (عەوداڵ ئاغا) یەک پەیا بوە کە یا باوکی وە یا باپیری (حەمەئاغا: محەمەد ئاغا) ی باپیرە گەورەی ڕونەسای ئیستایە..." *(زەکی: 188)*

ئیدمۆندس، حاکمی سیاسی دەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیز لە سلێمانی (1919 - 1920) کە تێکەڵاو بوە لە گەڵ سەرانی میراودەلی لە زمانی خۆیانەوە ئەگێڕێتەوە کە بنەماڵەی میراودەلی هەمویان لە حەمە ئاغا

(حەماغا) ی گەورە کەوتونەتەوە. ڕەنگە ئەم گێڕانەوەیە لە چیرۆکەکانی کە زیاتر جێگەی باوەڕ بێ. بە تایبەتی کە درەختی بنەماڵەکەیان زۆر دور و درێژ نەبردوە. ئەوانەی قسەیان بۆ کردوە هێشتا ناوی باپیرەکانی خۆیان لە بیر بوە.

حەمە ئاغا گۆیا حەوت ژن و هەندێک ئەڵێن بیستوچوار ژنی هێناوە. حەمە کورتکراوەی ناوی محەمەدی پێغەمەری ئیسلامە. بە پێی شەرعی ئیسلام پیاو بۆی نیە لە هەمان کات دا لە چوارژن زیاتری هەبێ. حەمە ئاغا و میراودەلیەکان هەمو کورد و موسوڵمانی سوننەی شافیعی بون. ناوی پیاوەکانیشیان هەموی ناوی ئیسلامین. هەندێ لە پێشەوا دینیەکان "حیلەی شەرعی" یان بۆ فرە هاوسەری زیاد لە چوار ژن دۆزیوەتەوە. هەمیشە چوار ژنیان لە باخەڵی پیاوەکە دا هێشتوتەوە. تەڵاقی هاوسەرەکانی تریان هەڵواسیوە (تعلیق). هەر کات ئارەزویان کردبێ تەڵاقی یەکێ لەم چوارەیان هەڵواسیوە. یەکێ لە ژنە تەڵاق هەڵواسراوەکانیان هێناوەتەوە. لە بەر ئەوە چەندی بۆیان لوا بێ ژنیان هێناوە. نەریتی ڕەدوکەوتن و هەڵگرتن لە ناو چینی مسکێن دا شتێکی ئاسایی بوە. بەڵام چینی ئاغا ڕێگەی نەداوە ژنی لێ هەڵبگیرێ. هەر ژنێکیان ڕەدو کەوتبێ کوشتویانە. لە کاتێک دا خۆیان بۆیان هەبوە ژنی مسکێن رابکێشن.

لە سەردەمی ژیانی دەرەبەگی و خێڵەکیی کورد دا نەریتێکی باو بوە گەورەی خێزان. ئەگەر دەسەڵات و دارایی هەبوبێ. ژنی زۆری هێناوە. بۆ ئەوەی کوڕ و کچ و ئەوەی زۆری لێ بکەوێتەوە. کوڕ و کچەکانیشی لە سەرەتای تەمەنیان دا ژن بهێنن و شو بکەن بۆ ئەوەی ئەوانیش منداڵی زۆریان ببێ. منداڵی زۆر سەرچاوەی مرۆیی هێزی جەنگیی بنەماڵەکە و دەستی کاری بەرهەمهێنان بون. کچ جگە لەوەی بۆ ئیشوکاری ناو ماڵ و بۆ ئاژەڵداری و کشتوکاڵ دەستی کار بوە. گرنگیەکی تری هەبوە بۆ دابینکردنی هاوسەر بۆ براکانی. ژن بە ژنی پێ کراوە. کچ تا ئامۆزای هەبوبێ بە کەسی تر نەدراوە. حەمە ئاغا لەو چەندین ژنە چەندین کوڕ و چەندین کچی هەبوە. گەڕیدەیەکی ئەوروپایی کلمانساڵی 1856 لە سەر سنور. لە ناوچەی ئالان. بابەکر ئاغای کوڕی حەمە ئاغای دیوە کە تەمەنی سی ساڵ بوە. لەو کاتەدا هەژدە برا و بیست خوشکی زیندوی هەبوە.

حەمە ئاغا لە گوندی دەشتێو لە پشدەر دانیشتوە. لەوێ ژیاوە و لەوێ مردوە و لەوێ نێژراوە. پشدەر و بەردەر دو دەستەواژەی جوگرافییە خەڵکی ناوچەکە بە کاری ئەهێنن. ئاوی زێ کە لە دیوی ئێرانەوە دێ زنجیرەی چیای ئاسۆس و کێوەڕەشی. لە دەربەندی ڕەمکان (دەربەندی رانیە) دا لە یەک جیا کردۆتەوە. ئەم زنجیرە چیایە وەکو دیوارێکی بەرز ناوچەی پشدەری لە ناوچەی بەردەر جیاکردۆتەوە. شاری رانیە و گوندەکانی و دەشتی بیتوێن کە مەڵبەندی ژیانی ئاکۆ و بڵباس و پیران بوە پێیان وتوە بەردەر و. قەڵادزە و گوندەکانی کە مەڵبەندی ژیانی میراودەلی و نورەدینی و هەندێ تیرەی مەنگوڕ و مامەش بوە پێیان وتوە پشدەر. سەنگەسەر و گوندەکانی کە مەڵبەندی ژیانی چەند تیرەیەکی تری ئاکۆ بوە کەوتونەتە نێوان زنجیرەی چیاکانی زێرنەکێو و قەندیل. پێیان وتوە پشدەرە ڕەقە.

هەشت لە کوڕەکانی حەمە ئاغا کە هەر یەکەیان لە یەکێ لە هاوسەرەکانی بوە. خێزانێکی ناوکیان پێکهێناوە ئەویش پەرەی سەندوە خێزانێکی فراوانی پێک هێناوە. ئەویش پەرەی سەندوە بەرەبابێکی جیاواز لەوانی کەی پێک هێناوە. هەر بەرەبابێ بە ناوی یەکێ لە کوڕەکانی حەمە ئاغاوە ناوی دەرکردوە کە بریتی بون لە: تایەفەی بابەکر ئاغایی. تایەفەی مەحمود ئاغایی. تایەفەی ئەحمەد ئاغایی. تایەفەی ڕەسول ئاغایی. تایەفەی عەلی ئاغایی. تایەفەی ئۆمەر ئاغایی. تایەفەی عەباس ئاغایی. تایەفەی بەگزادە. ئەندامانی بنەماڵەی میراودەلی، دەسەڵاتدار بو بن یان بێ دەسەڵات. دەوڵەمەن بو بن یان هەژار. بە گشتی نازناوی ئاغایان بە میرات لە باوکیانەوە بۆ ماوەتەوە. لە بەرامبەردا دانیشتوانی ناوچەکە سەرەڕای جیاوازی تیرە و هۆز و

خێڵەکانیان بە مسکێن ژماردوە. خۆیان لە دانیشتوانی ئاسایی بە خانەدانتر و لە پلەی کۆمەڵایەتی دا بە بەرزتر داناوە. میراودەلی پێرەوی نەریتی هاوسەرگیری ناوخۆیی کردوە. لە ناو خۆیان دا ژن و ژنخوازییان کردوە. ژنیان نەداوە بە دەرەوەی میراودەلی. لە ناو ئاغاکان دا مارەکردنی ئافرەت و گوێزانەوەی بۆ ماڵی زاوا لە هەمان رۆژدا روی داوە. میراودەلی کە هەشت بەرەباب بون و، ئەوەی یەکێکیان سەرۆکایەتی هەمویانی کردوە، رایەڵەی خزمایەتی - هاوخوێنیی بە یەکەوەی بەستون. بەڵام رایەڵەی پەیوەندی دەرەبەگی - زەوی سەپاندنی بە سەر دانیشتوانی ناوچەکەدا. رێکخراوەیەکی دەرەبەگیی پتەویان هەبوە، کە خاوەنی زیندان و هێزی چەکداری تایبەت و دەسەڵاتی "عورفیی" بکوژوببڕی یەکلاییکەرەوەی ناکۆکی و کێشەکانی بوە.

بنەماڵەی حەمە ئاغا دوای ئەوەی یەکەم و ئەوەی دوەم ئەوەندە بە خێرایی زیادیان کردوە، لە پشدەر جێیان نە بۆتەوە بە هەر چوار دەوری خۆیان دا کەوتونەتە پەلهاویشتن. زۆر جار بە شەڕ گوندنشین و خێڵەکانی ناوچەکەیان هێناوەتە ژێر دەستی خۆیانەوە. لەو سەردەمەدا ئەو بۆشاییەی لە ئەنجامی نەمانی دەسەڵاتی میرایەتی بابان و لاوازیی دەسەڵاتی عوسمانی لە دەرەوەی ناوەندی شارەکان دا دروست بوە، لە مەدا یارمەتی داون.

ئاغاکان بە دێهاتەکان دا بڵاو بونەتەوە، هەر یەکەیان چۆتە دێیەک دانیشتوە ئەگەر زۆر بچوکیش بوبێ، دەستی بە سەردا گرتوە، جوتیارەکانی هێناوەتە ژێر باری فەرمانبەرییەوە. بەمجۆرە هۆزەکانی نورەدینی لە قەڵادزە و شیلانەیی لە بەری مەرگە و شینکی لە ماوەت و سوێسنییان لە سەردەشت هێناوەتە ژێر دەستی خۆیان و دەستیان گرتوە بە سەر گوندەکانی پشدەر، مەرگە، ماوەت، ئالان، سیوەیل و شارباژێڕ دا.

میراودەلی داوودەزگایەکی جەنگیی کارای دامەزراندوە. نۆکەر و خزمەکار و پیاوەکانی لە ناو مسکێنەکان دا هەڵبژاردوە. لە گەڵ زۆر لە هۆزەکانی ناوچەکەی دا جەنگاوە و، شەڕی خۆسەپاندنی کردوە. لە شەڕەکانی دا ئاغاکانی بەرەبابە (تایەفە) جیاوازەکان گەلەکۆمەکەیان کردوە. هاوکاری یەکتری بون. لەشکریان کردۆتە سەر هۆزی گەورک لە رەبەت (سەردەشت)، سەرۆکەکەیان و پێنج لە کورەکانیان کوشتون. لەشکریان کردۆتە سەر ئالان ئاغاکانی شیوەکەڵیان شکاندوە، ماڵ و سامانیان تاڵان و، مەڵبەندەکەیان لێ داگیر کردون. هەر بەو شێوەیە بەری مەرگە و شارباژێڕیان هێناوەتە ژێر دەستی خۆیان.

پیرەمێرد کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا کارمەندی عوسمانی بوە لە شارباژێر، لە میانەی گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی دا نوسیوێتی: "... خۆم لە شەڕی ئەم عەشائیرە پازدە شازدە شەڕی پشدەر و مەنگوڕ، پشدەر و بانە، پشدەر و گەورک، پشدەر و شیوەکەڵ، پشدەر و خدران، پشدەر و پشدەر، هەمەوەند و جاف، هەمەوەند و شوان، درێژەی پێ ناوی هەمەوەند و جیهان... (م دیوە)" *(ژین، ژمارە 875، 30 ی کانونی دوەمی 1947)*

ئاغاکانی میراودەلی لە ناو خۆیان دا ناکۆک بون. رقەبەریی یەکترییان کردوە. پیلانیان لە یەکتری گێڕاوە. ئەم هەوڵی داوە دەس بە سەر گوند و زەوی و مسکێنی ئەوی تردا بگرێ. ئەویش هەوڵی داوە پەل بۆ ناوچەی ئەم بهاوێژێ. مسکێنەکانیان کردوە بە گژ یەکتری دا. ئەوانیان بە شەڕ داوە، بەڵام دەستیان نەچۆتە خوێنی یەکتری.

لە سیستەمی دەرەبەگایەتی دا، کە دەسەڵاتی ئاغای میراودەلی نمونەیەکی بوە، هیچ قانونێکی نوسراو، یا گرێبەستێ، نە بوە پێوەندی نێوان چینی زەویدار (میر، ئاغا، بەگ، خان، شێخ، کوێخا) لە لایەک و جوتیار (مسکێن، کرمانج، گۆڕان)، و هەژارانی لادێ (شوان، گاوان، سەپان، پاڵە، وەرزێر، ئاشەوان) لە لایەکی ترەوە رێک خست بێ، ئەرک و مافی هەر لایەکیانی دیاری کرد بێ. هەروەها هیچ قانونێکی نوسراو نەبوە بۆ

ڕێکخستنی بوارەکانی تری ژیانی کۆمەڵگا. هەروەکو هیچ دانگایەک نەبوە خاوەنماف لە کاتی خورانی مافەکەی دا، یا مافخوراو لە کاتی پێشێلکردنی مافەکانی دا، پەنای بۆ ببرێ. داودەزگاکانی حکومەتی عوسمانی دەستی نە گەیشتۆتە ناوچە شاخاوی و دورەکان. نەی توانیوە پارێزگاری زۆرلێکراو بکا و، داکوکی لە مافی مافخوراو بکا. ئەویش پشتیوانی لە چینی سەرەوەی کۆمەڵ کردوە. ئەوەی دەسەڵاتی بو بێ دەرەبەگەکان خۆیان بون. لە دیواخانەکانی خۆیانەوە، بڕیاری یەکلاکەرەوەیان داوە. مەگەر خۆی ویستبێتی راوێژی لە گەڵ ریشسپی و مەلادا کرد بێ، ئەگینا هێزێکی قانونی یا شەرعی نەبوە ناچاری کرد بێ، یا لێپرسینەوەی لە گەڵ کردبێ. لە هەندێ کێشەدا کار بە شەریعەتی ئیسلامی و لە هەندێ کێشەی تردا کار بە عورفی کۆمەڵایەتی کراوە. لە هەردوکیان دا بە پێی قازانجی چینی دەسەڵاتدار لێک دراوەتەوە، تا ئەو ئەندازەیە پێڕەوی عەدالەتی تێ دا کراوە کە زەرەری نە گەیاند بێ بە دەرەبەگەکە. جوتیار و هەژارانی لادێ پشتیوانێکیان شک نەبردوە داکۆکیان لێ بکا، لە بەر ئەوە گوێڕایەڵی فەرمانی دەرەبەگ و ملکەچی بڕیارەکانی بون. ئەگەر زوڵمێکیان لێ کرا بێ لە بێدەسەڵاتی دا حەواڵەی خوایان کردوە بۆ ئەو دنیا. یاخیبونی تاک یا کۆمەڵی جوتیار روی نە داوە. رەنگە جوتیار ئەگەر لاملی کرد بێ لە گوندەکەی خۆی دەرکرا بێ، یان ئەگەر زوڵمەکەی پێ قبوڵ نە کرا بێ گواستبێتیەوە بۆ گوندێکی تر و بۆ ژێردەستی ئاغایەکی تر، یان سەری خۆی هەڵگرتوە روی کردۆتە چارەنوسێکی نادیار.

ناوچەی پشدەر چەندین چیای بەرز و گوندی گەورە و بچوکی لێ بوە.

چیاکان بۆ هەواری هاوینە و بۆ لەوەرگای ران و بۆ راوگەی نێچیروان بە کار هێنراون، لەوانە: چیاکانی: بولفەت، دوپەزە، هەرمێن، مامەندە، چواز، چاوناسک.

**گلکەند**

گوندەکانی: شێنێ، سونێ، هەڵشۆ، هێرۆ، دارەشمانە، دەشتێو، چەکوان، چۆمخرکە

هەندێکی بە ناوی کەسایەتیەوەیە، وەکو: نورەدین، کە ئەشێ بە مەڵبەندی لە دایکبونی هۆزی نورەدینی دابنرێ، ئۆمەر کاکۆڵ، سەید ئەحمەدان، شێخ ئاودەلان، ئیسێوێ - عیساوا، داودیە.

هەندێکی بە ناوی داری میوەوە، وەکو: توە رەشان، سێوەڵە، شیوەرەز، گوێزیلە.

هەندێکی بە ناوی گوڵی کێویلەوەیە، وەکو: هێرۆ، بنەوشان.

ئەوەی ئەبێ سەرنجی لێ بگیرێ چەند ناوێکە کە رەگەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ سەر زمانی سریانی، وەکو: دێرێ، دێر ناوی پەرستگای کریسیتیانەکانە. بێگەلاس، بێناس، بێموش، بێکلۆ، بێشیر، باوزێ، بێدەلان. پێشگری "بێ" و "بێت"، لە زمانی سریانی کۆن دا هاوواتای پاشگری "ئاوا" ی کوردی ئێستا بوە کە نیشانەیە بۆ دێ و گوند.

هەندێکی وشەی گرد بۆتە پێشگری، وەکو: گرد بداخ، گردی حوسنی، گرد ئێستر، گرد مەیتەر، گرد شێخاڵ. گرد بە هەورازێ ئەوترێ کە چەند مەترێ بە جۆرێکی سروشتی لە تەختایی زەوی بەرزتر بو بێ. گرد ئەشێ تورەکەرێژ بە دەستی مرۆڤ دروست کرا بێ، هەورەها ئەشێ بە چیای گەورەش وترابێ، بۆ نمونە گردەرەش چیایەکی گەورەیە نەک بەرزاییەکی بچوک.

خەڵکی ئەم ناوچانە گوندنشین بون، لە خانودا ژیاون، گەرمیان و کوێستانیان نە کردوە. خانوەکانیان لە خشتی کاڵ یا خرکەبەرد و قوڕ دروست کراوە. هەر چەند ماڵێکیان لە ئاواییەک دا نیشتەجێ بون. ناوچەکە شاخاوی و سەخت بوە. زستان بەفری زۆری لێ باریوە و هەوای سارد بوە. شێوەی دروستکردنی خانوەکانی هەندێ لەم ناوچانە جۆرێ لە تایبەتمەندی هەبوە کە لە گەڵ کەشی شوێنەکەدا گونجاوە، ئەندازە و ئەندازیاریی هەمویان وەک یەک نین:

هه‌ندێکیان، خانوه‌کانیان بریتی بوه‌ له‌ ژورێکی گه‌وره‌ی نزم و تاریک و دوکه‌ڵاوی. به‌ دار و گه‌ڵا و قوڕ سه‌ری گیراوه‌. هه‌مو ئه‌ندامانی خێزانه‌که‌ و که‌لوپه‌له‌که‌یان و وڵاخه‌کانیان و په‌له‌وه‌ره‌کانیان له‌و ژوره‌دا بون. وڵاخ و ئاژه‌ڵ له‌ گۆشه‌یه‌کی دا و په‌له‌وه‌ر له‌ گۆشه‌یه‌کی دا و، که‌لوپه‌ل له‌ گۆشه‌یه‌کی و خێزانه‌که‌ش له‌ گۆشه‌یه‌کی دا. له‌ ناوه‌ڕاستی گۆشه‌ی خێزانه‌که‌دا ئاگردانێکی تێ دا بوه‌. له‌ ئاستی ئاگردانه‌که‌دا بنمیچی ژوره‌که‌ کلاوڕۆژنه‌یه‌کی تێدا کراوه‌ بۆ ده‌رچونی دوکه‌ڵی ئاگر.

هه‌ندێکی تریان، خانوه‌کانیان دو نهۆم بوه‌. نهۆمی سه‌رئه‌رز له‌ زستان دا ئاژه‌ڵ و وڵاخی تێ دا گل دراوه‌ته‌وه‌، نهۆمی سه‌ره‌وه‌ی بۆ ژیانی خۆیان بوه‌.

هه‌ندێکی تریان، به‌ تایبه‌تی له‌ ناوچه‌ی ئالان و سیوه‌یل و هه‌ڵشو گوندی وایکانه‌ هه‌بوه‌ که‌ جوتیاره‌کان وه‌رزی زستانیان تێدا به‌ سه‌ر بردوه‌ و ئه‌و جوتیارانه‌ی توانای دارایییان هه‌بوه‌ خانویه‌کی تریان له‌ نزیک گونده‌که‌ له‌ سه‌ر پارچه‌ زه‌ویه‌ک دروست کردوه‌، که‌ به‌ ده‌ست خۆیانه‌وه‌ بوه‌. به‌ خانوه‌که‌یان وتوه‌ قۆخ و به‌ زه‌ویه‌که‌یان وتوه‌ موچه‌. به‌ زۆری ته‌نیا ماڵ بوه‌. هاوینان خۆیان و ئاژه‌ڵه‌کانیان گواستویانه‌ته‌وه‌ بۆ ئه‌و قۆخه‌ی که‌ له‌ سه‌ر موچه‌که‌ دروست کراوه‌. له‌ به‌ر زۆری جروجانه‌وه‌ر، به‌ تایبه‌تی ئه‌سپێ و کێچ و مشک، هاوینان له‌ خانوه‌کان ده‌رچون که‌پریان کردوه‌ یان ره‌شماڵیان هه‌ڵداوه‌. جوتیاره‌کان له‌ ترسی دزین هه‌میشه‌ شوێنی ئاژه‌ڵ و وڵاخه‌کانیان له‌ ناو ماڵ یا ته‌نیشت شوێنی ژیانی خێزانه‌که‌ی خۆی بوه‌.

له‌ هه‌ندێ گوندی گه‌وره‌ی ناوچه‌که‌دا مزگه‌وت هه‌بوه‌. مه‌لای تێدا بوه‌ و قوتابی تێیدا خوێندویه‌تی. نوێژی رۆژانه‌ و هه‌ینی تێدا کراوه‌. مانگی ره‌مه‌زان ته‌راویح و نوێژی به‌یانی جه‌ژنی تێدا کراوه‌. ناوه‌ندێکی گرنگی کۆبونه‌وه‌ و یه‌کتربینینی خه‌ڵکی گونده‌که‌ و میوان بوه‌. ماره‌کردن و ته‌ڵاقدان، کفن و دفن و پرسه‌ی مردو، دابه‌شکردنی میرات، ناونانی منداڵ، راوێژ بۆ یه‌کلاییکردنه‌وه‌ی هه‌ندێ کێشه‌ی کۆمه‌ڵایه‌تی... ئیشی مه‌لا بوه‌. له‌و ناوچانه‌دا ژنهه‌ڵگرتن و ره‌دوکه‌وتن زۆر جار روی داوه‌. بۆ چاره‌سه‌رکردنی کێشه‌ی هه‌ڵگرتن و ره‌دوکه‌وتنی ژنی به‌ مێرد، هه‌ندێ له‌ مه‌لاکان "حیله‌ی شه‌رعی" یان دۆزیوه‌ته‌وه‌. مه‌لا له‌ ناو ئاغا و مسکێن دا رێزی لێ گیراوه‌. بۆ ئه‌وه‌ی پێیانه‌وه‌ دابنیشێ هه‌ندێ جار خه‌ڵکی گوند جگه‌ له‌ سه‌رفتره‌ و زه‌کات، شکارته‌یان بۆ کردوه‌. دوعا و نوشته‌یان پێ نوسیوه‌ و سه‌رقه‌ڵه‌مانه‌یان داوه‌تێ.

پشده‌ر و به‌ری مه‌رگه‌ مه‌ڵبه‌ندێکی به‌ پیتی خوڵقاندنی به‌یت و حه‌یران بوه‌. به‌یتی ئه‌فسوناوی "شێخ فه‌رخ و خاتون ئه‌ستێ" له‌ ناوچه‌ی پشده‌ر هه‌ڵبه‌ستراوه‌، هه‌ندێ شوێن له‌ گوندی داوییه‌ ئێستاش به‌ ناوی ئه‌وانه‌وه‌ ناو نراوه‌. هه‌روه‌ها به‌یتی "کاکه‌ شێخ و کاکه‌ میر" به‌ پێی گێڕانه‌وه‌ی بێژه‌ره‌که‌ی له‌ مه‌رگه‌ روی داوه‌. شایه‌ری ناودار، عه‌لی به‌رده‌شانی که‌ دانه‌ر و بێژه‌ری چه‌ندین به‌یته‌، وه‌کو دازناوه‌که‌ی ئه‌یدرکێنێ، خه‌ڵکی گوندی به‌رده‌شانی بناری ئاسۆس بوه‌ له‌ به‌ری مه‌رگه‌.

په‌یوه‌ندی نێوان ئاغای میراوده‌لی و مسکێنی پشده‌ری، نوره‌دینی، شیلانه‌یی، ئالانی، سیوه‌یلی، ماوه‌تی، شارباژێری، ته‌نانه‌ت هه‌ندێ گوندی مه‌نگوڕ و مامه‌ش و پیرانی ژێرده‌ستی ئه‌وان... رێچه‌ڵه‌کی هاوبه‌ش یا خزمایه‌تی هاوخوێنی نه‌بوه‌، به‌ڵکو په‌یوه‌ندی نێوان ئاغا و مسکێن له‌ سه‌ر بنچینه‌ی زه‌ویداری بوه‌. ئاغا به‌ داگیرکردن یان به‌ کڕین بوته‌ خاوه‌نی زه‌وی گونده‌که‌ و، مسکێن به‌ خۆشی بوبێ یان به‌ زۆر له‌ زه‌وی ئاغادا کاری کردوه‌. زه‌ویانه‌، مه‌ڕانه‌، پوشانه‌، سورانه‌، رۆنانه‌، هێلکانه‌، باره‌دارانه‌... هه‌مو جۆره‌کانی تری باجی ده‌ره‌به‌گی لێ سه‌نراوه‌. ئه‌و باجانه‌ رێژه‌یه‌کی دیاریکراو نه‌ بوه‌، هه‌ندێکی عورفی کۆمه‌ڵایه‌تی ناوچه‌که‌ و هه‌ندێکی ده‌سه‌ڵاتی ئاغا دیاری کردوه‌. سه‌رباری ئه‌وانه‌ش نه‌بو هه‌میشه‌ ئاماده‌بێ بۆ بێگار و، بۆ به‌شداری له‌ له‌شکرکێشیه‌کانی ئاغاکه‌ی دا بۆ سه‌ر ئاغاکانی تر. ئاغا له‌ رێگه‌ی کوێخای دێیه‌که‌وه‌، که‌ گه‌وره‌ی به‌ره‌بابه‌که‌ی خۆی بوه‌، ئه‌و باجانه‌ی بۆ کۆ کراوه‌ته‌وه‌ و وه‌رگرتوه‌.

دانیشتوانی قەڵەمڕەوی میراودەلی دابەش بون بە سەر دو چینی سەرەکی دا: چینی ئاغا، کە بە پێی خەمڵاندنی سەرچاوەیەکی ئاگادار لە 1939 دا بە هەمویان 280 خێزان بون. لە کاتێک دا چینی مسکێن. بە پێی هەمان سەرچاوە 6750 خێزان بون.

ئەمین زەکی لە تەعریفی مسکێن دا نوسیویێتی: "مسکێن ئەم ناوەی کە بۆ بەشی گەورەی پشدەر وە یا بە راستی بۆ هەمو پشدەر دانراوە، باش حاڵیمان ئەکا، کە ئەم بەشە رەعیەتی ئاغاواتن و بە گوێرەی قابیلیەت و قوەتیان ئیدارە ئەکرێن. لە مانە بەعزێکی کە بە قوەت و درن ئەوەندە تەزییق نابینن بەڵام بەشی بێ هێزی بە تەواوی لە ژێر حوکم و نفوزی ئاغاواتایە و حقوقی مەدەنیە و ئیجتیماعیەیان لە جوملەی ئەبوانە، زیرۆحی و بێرۆحی ماڵی ئاغایە و بە کەیفی خۆی موعامەلەی لە گەڵ ئەکا." *(زەکی: 187)*

ئەگەر دۆخی ژیانی چینی مسکێن لە کۆتایی سیەکانی سەدەی بیستەم دا بەو جۆرە بو بێ ئەبێ لە ساڵانی سەدەی نۆزدەدا چۆن بو بێ؟ ئەم چەوساندنەوە سەختە رق و قینێکی قوڵی لە دەرونی مسکێنەکان و نەوەکانیان دا خوڵقاندوە تا ئێستاش کاریگەری ماوە لە سەر پێوەندی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابوری نێوان ئاغایانی میراودەلی و دانیشتوانی پشدەر.

## سەرگەرمی میراودەلی

### راو

یەکێ لە سەرگەرمیەکانی ئەریستۆکراتی لادێی کوردستان، لەوانە ئاغاکانی میراودەلی، راو بوە. رێسایەکی نوسراو نە بوە راو رێک بخا، بەڵکو هەر ئاغایەک لە ناوچەکەی خۆی دا راوگەی دیاریکراوی خۆی هەبوە، کە جگە لە خۆی و ئەوی خۆی ویستبێتی کەسی کە بۆی نەبوە راوی تێدا بکا. خۆی بڕیاری کات و جۆری راوکردنی داوە. نەریتی راوی کوردەواری ئەشێ پاشماوەی نەریتی ئەو قۆناغە بێ کە مرۆڤ هێشتا نە گەیشتوتە قۆناغی بەرهەم هێنانی کشتوکاڵ و رامکردنی ئاژەڵ. بە کۆکردنەوەی بەروبومی داری کێوی و بە راوی گیانداری کێوی ژیاوە. بۆیە گوێی نەداوەتە پارێزگاری رەگەزی گیاندارەکان و، دوایین دانەی هەندێ چەشنی کوشتون. بابەتی راو لە فۆلکلۆردا زۆری لە سەر وتراوە. بەشێ لە حەیران لە سەر راوە. تەوەری سەرەکی بەیتی سەیدەوانە لە دەوری راو ئەخولێتەوە.

- راو چەندین جۆری هەبوە:
- راوی کەو، لە چەند وەرزی ساڵ و بە چەند شێوەی جیاواز کراوە.
- راوی کەروێشک، بە کۆمەڵ بە تانجی راوی کراوە.
- راوی گیانداری کێوی، لەوانە بزنەکێوی و مەڕەکێوی و شور (فیلەگێژە)، ئەم راوە چەند رۆژ و شەوی خایاندوە. راوکەرەکان لە راوگەکەدا ماونەتەوە. بەشێکی خولیا بوە بۆ بەسەربردنی کات، بەڵام بەشێکی بۆ گۆشتە خۆراییەکەی بوە. لە ئەنجامی ئەو راوە نەزانانەیەدا مەڕە کێوی و شور بە تەواوی لە ناو چون. ژمارەیەکی کەم نێری و بزنە کێوی بە شاخە سەختەکانەوە ماون.
- راوی بەراز، بەرازی کێوی کە ژمارەیان زۆر بوە زەرەری زۆری لە کشتوکاڵ داوە. بە کۆمەڵ بۆ خۆشی و بۆ لە ناوبردنی، بە سواریی راوی بەراز کراوە. تولەی سەگی تێدا بە کار هێنراوە. ئەمیش چەند رۆژێکی خایاندوە. موسوڵمان گۆشتی بەرازی نە خواردوە داوێتی بە سەگ. ئەنجامدانی راوی بەراز هاوشێوەی تاکتیکی جەنگی بوە.

گوند بە گشتی سەگەلی تێدا بوە. سەگەل پێویست بوە بۆ ئاگاداکردنەوەی دانیشتوانی دێ لە هەر جموجوڵێکی گومانلێکراو، بە تایبەتی بە شەو. شوانەکانی کوردستان بۆ پاراستنی رانەکانیان لە هێرشی

گورگ، هەمویان سەگیان راگرتوە. هەندێ خێزانی بوەش بۆ پاراستنی خۆیان سەگیان راگرتوە. ماڵی خاوەن سەگ کە نانیان بۆ خۆیان کردوە. "گێتکە" یشیان بۆ سەگەکەیان ئامادە کردوە. گێتکە کولێرەیەکی ئەستوری نیوە برژاو بوە. سەگ لە تێگەیشتنی کوردا بە گڵاو دانراوە. دەستیان تێوە نەداوە. ئەگەر دەستی بەر کەوت بێ یا دەمی سەگ بەر دەفرێ کەوت بێ، بە گڵەسور شۆراوە بۆ ئەوەی گڵاویەکەی دەربکرێ. لە گەڵ ئەوەش دا کوشتنی سەگی خاوەندار بە سوکایەتیەکی گەورە دانراوە. لەوانە بوە شەری خوێناوی لە سەر بقەومێ. سەگ ئەوەندە تێکەڵاوی ژیانی خەڵکی دێهات بوە لە سەدان پەندی پێشینان دا ناوی هاتوە.

یەکێکی تر لە سەرگەرمیەکانی ئاغاکانی میراودەلی راگرتنی سەگی دڕ. بە تایبەتی سەگی هەوشار. بوە. سەگی هەوشار رەگەزێکی تایبەتی سەگ بوە، بە لەش گەورە و بەهێز بوە. بۆ پاسەوانی ماڵەکانیان رایان گرتوە. بە جۆرێکی تایبەتی راهێنراوە. بە رۆژ بەستویانەتەوە، بە شەو بەرەڵایان کردوە. شەرە سەگ یاریەکی باو بوە. سەگی شەڕ تایبەتی بوە، گوێیان بڕیوە بۆ ئەوەی لە کاتی شەڕدا سەگەکەی بەرامبەری نەتوانێ گاز لە گوێی بگرێ.

لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی دا میراودەلی بەهێز بون. بۆیە ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی ناوچەکە لە مەرگەوە گوێزراوەتەوە بۆ شاری قەڵادزەی ئێستا و، شارەدێیەکی تازە بە ناوی مەعمورەی حەمیدی بنیات نراوە.

لە یەکەم جەنگی جیهانی دا بە دەم بانگی غەزاوە، بۆ هاوکاری سپای عوسمانی. چون بۆ بەرەنگاری چەکدارانەی سپای روس لە سەردەشت و موکریان. هەندێکیان لێ کوژراوە. بەرگەی شەڕەکەیان نە گرتوە. بە شکاوی گەڕاونەتەوە.

دوای یەکەم جەنگی جیهانی کە حکومەتی کوردستانی جنوبی لە سلێمانی دامەزراوە سەرانی میراودەلی پشتیوانییان لە شێخ مەحمود کردوە و، بون بە بەشێ لەو بەڕێوەبەرایەتیە. بەڵام کە ئینگلیز ناوچەکەی داگیر کردوە و، شێخ مەحمود بە دیل گیراوە و رەوانەی هندستان کراوە. میراودەلی بون بە دو بەشەوە:

بەشێکیان، بە سەرکردایەتی عەباسی مەحمود ئاغا، بە دڵسۆزی بۆ شێخ مەحمود ماونەتەوە بەشدار بون لە بەرەنگاری دەسەڵاتی داگیرکەر دا بە تایبەتی لە شەڕی دەربەندی رانیە دا. کە یەکێ بوە لە هۆکانی کێشانەوەی دەسەڵاتی داگیرکەر لە پشدەر و بیتوێن و، سەرەنجام لە سلێمانی.

بەشێکی تریان، بە سەرکردایەتی بابەکری سەلیم ئاغا، بون بە لایەنگری ئینگلیز. بابەکر ئاغا بە کردەوە سەرۆکی هەمو میراودەلی بوە. هەرکەس لە ئینگلیزەکان کە دیویانە، ستایشی هێز و ژیریی و شارەزاییان کردوە لە کاروباری دەرەبەگی و خێڵەکی دا.

لە سۆنگەی لایەنگریی ئینگلیز و دواتر لایەنگریی حکومەتی تازەدامەزراوی عیراقەوە. بەڕێوەبەرایەتی پشدەر و شارباژێر و مەرگە، قایمقام و مودیری ناحیەکانی. سپێردراوە بە سەرانی تیرەی میراودەلی و، تا کۆتایی سییەکانی سەدەی بیستەم ناوچەی پشدەر لە دانی سەرباز و باج بەخشراوە. لە چلەکانی سەدەی بیستەم دا کەسانێکی ئەم تیرەیە کراون بە ئەندامی ئەنجومەنی گەلی عیراق و، تا روخانی رژێمی پاشایەتی لە 14 ی تەموزی 1958 دا پێوەندی نێوان ئاغا و مسکێن بە شێوەی کۆن ماوەتەوە.

قانونی ئیسلاحی زەراعی و، بە هێزبونی داودەزگاکانی حکومەت و، پەرەسەندنی چالاکی سیاسی حیزبی شیوعی عیراق و پارتی دیمۆکراتی کوردستان دەسەڵاتی ئاغاکانی میراودەلی لەقاند و، لە بەرامبەر دا هۆزەکانی نورەدینی، شیلانەیی، شینکی، ئالانی، سیوەیلی، شاباژێڕی... لە دەسەڵاتی ئاغاکان یاخی بون و، چیتر وەکو جاران نە ئەمان گوێڕایەڵییان ئەکردن و، نە ئەوان ئەیان توانی وەکو جاران ئەمان بچەوسێننەوە.

هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە 1961 دا سەرەتای قۆناغێکی نوێ لە پێوەندی نێوان ئاغاکانی میراودەلی و مسکێنەکانی پشدەر دا دەستی پێ کردوە. ئەگەرچی سەرەتا هەندێ لە ئاغاکان داویانەتە پاڵ شۆڕشەکە بەڵام بەشداری فراوانی جوتیارەکان تەرازوی هێز و پشتیوانی سەرکردایەتی شۆڕشەکە لە جێبەجێکردنی قانونی ئیسلاحی زەراعی، تیرەی میراودەلی لە زۆری دەسەڵاتەکانی روت کردۆتەوە. بەڵکو بە گشتی دای بڕیون لە کۆمەڵگای پشدەری و. ئەو دەلاقە دێرینەی بە درێژایی دەیان ساڵ لە نێوان ئاغا و مسکێن دا دروست بوبو قوڵتر بوەوە. ئاغاکانی میراودەلی بەشێکیان رویان کردۆتە خوێندن و دامەزراندن لە کاری حکومەتی دا. پزیشک و ئەندازیار و پارێزەر و مامۆستایان تێ دا هەڵکەوتوە. کەمێکیشیان چونەتە ریزی پێشمەرگەوە. ئەو رێکخراوە دەرەبەگیە پتەوەی ساڵانێکی دورودرێژ حوکمی ناوچەکەیان پێ کردوە لە بەر یەک هەڵوەشاوە. جیاوازی بەرژەوەندیەکان دابەشی کردون بە سەر حیزبی جیاواز، کاری جیاواز، ناوچەی جیاواز دا. تەنیا شتی هاوبەش، کە بۆیان ماوەتەوە، نازناوی میراودەلیە کە نیشانەیە بۆ رێچەڵەکی هاوبەشی ئەم تیرەیە.


**سەرچاوە**

*بۆ ئاگاداری زیاتر دەربارەی ئەم بابەتە بڕوانە:*

*دبلیو. ار. هی، سنتان فی کردستان 1918 - 1920. نقله الی العربیة، حققه، وعلق علیه: فؤاد جمیل، الجزء الاول بغداد - 1973. الجزء الثانی بغداد - 1973.*

*سی. جی. ادمونز، کرد وترک وعرب: سیاسة ورحلات وبحوث عن الشمال الشرقی من العراق 1919 - 1925. ترجمة جرجیس فتح الله، بغداد - 1971: 198 - 200. ترجمه فارسی، ابراهیم یونسی: 239 - 241.*

*المحامی عباس العزاوی، عشائر العراق، الجزء الثانی، بغداد - 1947: 95 - 98.*

*محمد امین زکی، تاریخی سلیمانی و ولاتی، بەغداد - 1939: 186 - 189.*

*حوسێن حوزنی، سەرجەمی بەرهەمەکانی حوسێن حوزنی، بەرگی دوەم، شاری سلێمانی لە 1934 دا. دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر - 2007: 576 - 578.*

*الدکتور شاکر خصباک، الاکراد، بغداد - 1972: 353 - 368.*

## -1-
## خالیدی لاو

ساڵی 1193 ک لە گوندێکی ناوچەی قەرەداغ، لە خێزانێکی ئاسایی، کوڕێک لە دایک بو، ناوی نرا خالید.
باوک، ئەحمەد حسێن، کابرایەکی خێڵەکیی - هۆزی مکایەڵی جاف.
دایک، فاتیمە، ئەویش کچی کابرایەکی نەناسراو.
ئەم خێزانە جگە لە خالید دو کوڕی تریان بوە ناویان ناوە مەحمود و حەمەخان.
پێ ئەچێ باوکی زو مرد بێ بەڵام دایکی تا دواچونی بۆ بەغداد (1236 ک) مابێ. لەناو "مەکتوبات"ەکەی چەندین نامەی تێدایە، کە دەربارەی کاروباری خێزانەکەیان، بە تایبەتی بۆ ئەوی ناردوە، لە نامەکانی دا دایکی بە "والیدەی ماجیدە" و خوشکەکەی بە "هەمشیرەی بەرگوزیدە" و هاوسەرەکەی بە "هەمخوابەی زەعیفە" ناو ئەبا. حەمە خان خەریکی دنیاداری و کشتوکاڵ بوە، مەحمود روی کردۆتە خوێندنی مەلایەتی و، دواتر شێخایەتی تەریقەت.
لەو سەردەمەدا، قەڵاچواڵان ناوەندی میرایەتی بابان بوە و، یەکێ لە گرنگترین ناوەندەکانی خوێندن لەوێ بوە. کوژرانی سلێمان پاشای میری بابان (1178 ک) بە دەستی یەکێ لە فەقێکان، پشێوی خستۆتە ناو ناوەندی خوێندنەکە و، هەندێ لە مەلاکان و فەقێکانیان بەرەوازەی شوێنانی تر بون. سەرەڕای ئەوەش ململانێی دەسەڵات لە نێوان پێنج لە میرەکان دا، سلێمان و ئەحمەد و محەمەد و مەحمود و عومەر، کە هەر پێنجیان برا بون و کوڕی خالید پاشا بون، هەر جارەی یەکێکیان هێزی رۆم یا عەجەمی هێناوەتە سەر ناوچەکە، ناوچەکەیان توشی وێرانی و هەژاری و نائارامی کردوە.
سەرنجێ لە چارەنوسی ئەم پێنج برایە لایەنێ لە رادەی نائارامیی هەلومەرجی ژیان لە قەڵەمڕەوی بابان دا دەرئەخەن:
ساڵی 1156 ک (1743 ز) خالید پاشای بابان لە دەس هێرشی عەجەم هەڵاتوە لە ئاوارەیی دا لە ئورفا مردوە.
ساڵی 1178 ک (1763 ز) سلێمان پاشا لە سەر تەختی نوستن لە قەڵاچواڵان کوژراوە.
ساڵی 1192 ک (1778 ز) ئەحمەد پاشا دوای شکاندن و گرتنی محەمەد پاشای برای لە کاتی چونی دا بۆ بەشداری لەشکری بەغدا لە رێگە لە چیای سەگرمەی قەرەداغ مردوە.

ساڵی 1194 ک (1780 ز) محەمەد پاشا و عومەر بەگ، کە رایان کرد بو بۆ سنە، بە گیراوی هێنراونەوە و لە ژێر نارە گەورەکەی قەڵاچوالان دا کوژراون.

ساڵی 1198 ک (1783 ز) مەحمود پاشا لە دەس وەزیری بەغداد هەڵاتوە بۆ ئێران، لە ئاوارەیی دا لە موکریان کوژراوە.

ساڵی 1203 ک (1787 ز) عوسمان پاشای کوڕی مەحمود پاشا لە بەغداد دەرمانخوارد کراوە و مردوە.

قەرەداغ کە بەشێ بوە لە قەڵەمڕەوی بابان و هەر جارەی کەوتۆتە ژێر دەستی یەکێک لەو میرانە، بە تایبەتی ئەحمەد پاشا و محەمەد پاشا، بەشێ بوە لەو نائارامیە. سەرەڕای نائارامی جەنگیی، چەند جارێ وەبای تاعون لە ناوچەکەی داوە، هەزاران کەسی کوشتوە، ژیانی خەڵکەکەی پەک خستوە.

یەکێ لە شەڕە خوێناویەکانی کە ململانێی نێوان دو لەو برایانەی تێدا یەکلایی بۆتەوە لە قەرەداغ روی داوە (1192 ک). ئەحمەد پاشا و محەمەد پاشا لە جێشانە داویانە بە یەک دا محەمەد پاشا گیراوە و بە دیلی رەوانەی قەڵای سرۆچک کراوە. دواتریش بۆ ئەوەی جارێکی تر چاو نەبڕێتە میرایەتی بابان محەمەد پاشای برای داربدویەتی لە زیندان دا هەردو چاویان دەر هێناوە.

ساڵی 1197 ک وەزیری بەغداد، مەحمود پاشای لابردوە، لە شوێنی ئەو ئیبراهیم پاشای کوڕی ئەحمەد پاشای لە جێگە داناوە، مەحمود پاشایان راوناوە بۆ ئێران، ئەویش لە شەڕێک دا لەوێ کوژراوە.

ساڵی 1199 ک ئیبراهیم پاشا پایتەختی میرایەتی بابانی لە قەڵاچوالانەوە گواستۆتەوە بۆ شارێکی نوێ، کە خۆی بنیاتی ناوە، ناوی ناوە سلێمانی.

یەکێکی تر لەو شەڕانەی کە ململانێی نێوان دو لەو ئامۆزایانەی تێدا یەکلایی بۆتەوە، دیسان لە قەرەداغ روی داوە (1205 ک). والیی بەغداد ئیبراهیم پاشای لە میرایەتی بابان لاداوە ئەورەحمان پاشای کوڕی مەحمود پاشای لە جێ داناوە. ئیبراهیم پاشا خێزان و باروبنەی بارکردوە، ویستویەتی بە عەزیز بەگی برای دا رەوانەی بەغدادیان بکات. لە گڵەزەردە سەلیم بەگی برای ئەورەحمان پاشا ریگەی بە کاروانەکەیان گرتوە، عەزیز بەگی بە بریندار گرتوە و بە گیراوی رەوانەی بە غدای کردوە.

خالید لەم هەلو مەرجە ئاڵۆزەدا چاوی هەڵ هێناوە.

ناوەندی خوێندن و زانستی بریتی بوە لە مزگەوت و مەدرەسە، کە لە چەند جێگایەکی کوردستان دا، لە لایەن زانای ئاینیەوە بەرێوە براوە. یەکێ لەو ناوەندانە لە ناوچەی قەرەداغ بوە. ناوچەی قەرەداغ هەم ناوەندی زانستی خوێندنی تێدا بوە، هەم ناوەندی ئیرشادی تەریقەتی قادری.

خالید بە منداڵی، لە یەکێ خوێندنگەکانی قەرەداغ دا، خراوەتە بەر خوێندن. خوێندنی سەرەتایی لەوێوە دەس پێ کردوە. خوێندنی مەلایەتی چەند قۆناغێکی هەبوە، هەمو قۆناغەکانی لە یەک مەدرەسە و هەمو زانستەکانی لە لای یەک مەلا تەواو نەکراوە. قوتابی لە دەسپێکەوە تا تەواوبون، تا وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی چەندین مزگەوت و چەندین مەدرەسە گەڕاوە و، چەندین مامۆستای گۆڕیوە.

خالید چۆتە سلێمانی بۆ لای شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجی و شێخ عەبدورەحیمی برای.

- چۆتە سورداش بۆ لای مەلا ساڵحی تەرەماری.
- چۆتە هەورامان بۆ لای شێخ عەبدوڵای خەرپانی و مەلا ئیبراهیمی بیارەیی.
- چۆتە خۆشناوەتی بۆ لای مەلا عەبدورەحیمی زیارەتی.
- چۆتە باڵەکایەتی بۆ لای مەلا محەمەدی ئیبن ئادەم.
- چۆتە بەغداد بۆ لای مەلا سوبغەتوڵای حەیدەری ماوەرانی.
- دواجار، چۆتە سنە بۆ لای شێخ قاسیمی مەردۆخەیی.

ئەمانە زانا بە ناو بانگەکانی ئەوسەردەمەی کوردستان بون. هەر یەکەیان خوێندنگەی تایبەتی یان هەبوە. هەر خوێندنگەیەکیش کەوت بوە سنوری حوکمرانی دەسەڵاتێکی جیاوازەوە. خوێندنگەکانی قەرەداخ و خەرپانێ و بیارە و سلێمانی لە سنوری دەسەڵاتی میرەکانی بابان دا بوە. خوێندنگەکانی باڵەکایەتی و خۆشناوەتی و ماوەرانی لە سنوری دەسەڵاتی میرەکانی سۆران دا بوە. سنە و ناوچەکانی دەوروبەری لە سنوری دەسەڵاتی میرەکانی ئەردەڵان دا بوە. بەغداد، ناوەندی دەسەڵاتی وەزیرەکانی عوسمانی بوە لە عیراق دا.

خالید ساڵی 1112 ک ئیجازەی مەلایەتی لە شاری سنە لە شێخ محەمەد قەسیمی مەردۆخەیی (1143 - 1234 ک) وەرگرتوە و، گەڕاوەتەوە سلێمانی لە یەکێ لە مزگەوتەکانی دا دامەزراوە. وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی لەو تەمەنەدا بەو گەنجیە نیشانەی زیرەکی و هەڵکەوتنی ئەم پیاوە بوە. کەم وا بوە خوێندکاری دینیی لەو تەمەنەدا بەو پلە زانستیە بگا.

گەڕان بەو هەمو ناوچانەدا. خوێندن لە بەردەس ئەو هەمو زانا ناسراوەدا. ناسیاوی و تێکەڵاوی لە گەڵ ئەو هەمو مەلا و فەقێ و قوتابیە دا، دەبێ کاریگەری زۆری لە سەر پێکهاتەی کەسایەتی خالیدی لاودا هەبو بێ.

دەخۆشیی تاعون لە دانیشتوانی سلێمانی داوە. ئەوسا هێشتا چارەسەری دەدۆزراوەتەوە. ژمارەیەکی زۆر خەڵکی کوشتوە. یەکێ لەوانەی بەم وەبایە مردوە، زانای گەورەی ئەو کاتە، مامۆستای پێشوی خالیدی لاو، شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجی بوە. شێخ عەبدولکەریم مامۆستا بوە لەو مزگەوتەدا کە ئەورەحمان پاشای بابان لە گەڕەکی سەرچیمەن دروستی کرد بو. لەو ماوەیەدا کە ئەورەحمان پاشا حاکمی بابان بوە، مەلا خالیدی لاوی لە جێگەی شێخ عەبدولکەیمی مامۆستای، لە هەمان مزگەوت دا، بە مودەریس دامەزراندوە. بە پێی زانیاریەکانی ریچ دانیشتوانی سلێمانی لە ساڵی 1820 ز (1236 ک) دا بریتی بوە لە دو هەزار خێزانی موسوڵمان، سەدوسی خێزانی جولەکە، نۆ خێزانی دیان و کلدانی، پێنج خێزانی ئەرمەنی و، پێنج کاروانسەرا و پێنج حەمامی تێدا بوە.*(ریچ: 125)* ژمارەی مزگەوتەکانی سلێمانی ئەوەندە کەم بون بە پەنجەی دەست ژمێردراون.*(بۆ مزگەوتەکانی سلێمانی بڕوانە: قزلجی: التعریف بمساجد السلیمانیة)* ئەمە هەنگاوی یەکەم بوە بەرەو دەرکەوتنی خالید و سەرکەوتنی بە پەیژەی ناسراوی دا، چونکە سلێمانی ناوەندی حوکمرانی میرایەتی بابان و، ناوەندێکی گرنگی خوێندەواری و ڕۆشنبیریی ئەو سەردەمە بوە. مزگەوتەکانی سلێمانی ژمارەیان کەم و، مەلاکانی دیاریکراو بون. ئەو کە چۆتە ریزی مەلاکانی سلێمانیەوە ئەوە هەڵکشانێکی گرنگ بوە لە پایەی کۆمەڵایەتی دا. پایەیەک کە لە باوک و باپیریەوە، وەکو پایەی میر و ئاغا و بەگ و شێخ و سەیدەکانی کۆمەڵگاکەی، بە میرات بۆی بە جێ نەما بو، بەڵکو خۆی بە رەنجی شان و ماندویەتی مێشکی خۆی بە دەستی هێنا بو.

## خالید و شیعر

خالید بە شیعرەکانی دا دەرئەکەوێ لە تەمەنێکی زوەوە دەستی کرد بێ بە دانانی شیعر و، تا دوا ساڵەکانی تەمەنیشی بەردەوام بوە. زۆری شیعرەکانی بە زمانی فارسین. چەند قەسیدەیەکی بە زمانی عەرەبی و، چەند شیعرێکی کەمی بە کوردی هۆنیوەتەوە.

خالید وەکو لە نامەکانی دا دەرئەکەوێ، شارەزاییەکی باشی لە ئەدەبی فارسی دا هەبوە. سەرەڕای ئەوەی کە خۆی فارسی کردۆتە زمانی هۆنینەوەی شیعرەکانی و نوسینی زۆربەی نامەکانی، لە شوێنی گونجاو دا، نمونە بە شیعری حافز، سەعدی، نیزامی گەنجەوی، جەلالەدینی ڕۆمی، عەبدورەحمانی جامی... دەهێنێتەوە.

بە گشتی شیعرەکانی بە فارسی هەڵبەستوە و، زۆری دیوانەکەی فارسیە. وەکو شاعیرێکی پیشەیی ڕەفتاری کردوە. بابەتی شیعرەکانی جۆراوجۆرن. هەر لە بابەتی دڵداریەوە تا بابەتی دینیی گرتۆتەوە. ئەگەر پۆلێن بکرێن ئەشێ بەمجۆرە جیا بکرێنەوە:

- بەشێکی شیعرەکانی بە بۆنەی سەفەرەکەی بۆ حەج داناوە.
- بەشێکی شیعرەکانی بە بۆنەی سەفەرەکەی بۆ لای شاە عەبدوڵای دیهلەوی داناوە.
- بەشێکی موناجاتە.
- بەشێکی تری تێکەڵاوە لە بابەتی جۆراوجۆری دنیایی، لەوانە:
- غەزەلی دڵداری، مەدحی میرەکانی بابان. مەرسیەی مامۆستەکەی و میرەکانی بابان. سەیران و وەرزش. سۆزی نیشتمان.

لە دیوانەکەی دا لە ئەلفەوە هەتا یائی جێ کردۆتەوە. غەزەل و قەسیدە و موخەمەس و موسەدەس و روباعی و فەردی داناوە. زۆری بە کێشەکانی عەروز داناوە. بەشێکی شیعرە درێژەکانی بە تایبەتی هەندێ لە "موناجات" ەکانی بە شێوازی مەسنەوی هۆنیوەتەوە.

دوای خۆی بە دەیان رونوس لە دیوانەکەی نوسراوەتەوە و ساڵی 1260 ک بۆ یەکەم جار لە ئەستەموڵ چاپ کراوە و، دوای ئەوەش چەند جارێ چاپ کراوەتەوە. لە دیوانە چاپکراوەکانی دا بۆنەی دانانی شیعرەکان نە نوسراون و، شیعرەکان بێ گوێدانە دیاریکردنی کات و بۆنەی دانانی بە پێی حەرفەکانی ئەلفباء "هیجا" ریز کراون. لە بەر ئەوەی بابەتە جیاوازەکانی، قۆناغە جیاوازەکانی ژیانی خالید تێکەڵاوکراون، سەر لە خوێنەر ئەشێوێنێ. بایەخدانی زۆر بە دیوانی شیعرەکانی زیاتر لە بەر گرنگیی کەسایەتی خالید خۆی بوە، تا گرانیی نرخی ئەدەبی شیعرەکانی. رەنگە رەخنەگرێکی شارەزای ئەدەبی فارسی، بتوانێ هەلسەنگاندنێکی بابەتیتر بۆ پایەی ئەدەبیی شیعرەکانی بکا.

پیرەمێرد، زۆری شیعرە فارسیەکانی تەرجومەی کوردی کردوە و، لە چلەکانی سەدەی رابوردو دا لە رۆژنامەی ژین دا بە دوای یەک دا بڵاوی کردونەتەوە. لە هەندێکیان دا پابەندی وەرگێرانی دەقاودەقی مەعناکەی نەبوە، رۆحەکەی وەرگرتوە و، لە هەندێکیان دا مەبەستی مەولانای بە دەستەوە نە داوە.

تەرجومەی شیعرەکان کۆ کراونەتەوە و هەر یەکەیان ژمارەیەکیان بۆ دانراوە و لە کتێبێک دا بە ناوی "رۆحی مەولانا" چاپ کراون.

## خالید و مەدحی میرەکانی بابان

گەشتێ بە ناو دیوانەکەی مەولانا خالیدا دەرئەکەوێ، دوای "نەعت" ی پێغەمەر و "مەدح" ی شاە عەبدوڵا، لە بواری مەدح و ستایش دا، پشکی گەورە بەر میرەکانی بابان ئەکەوێ. خالیدی لاو ستایشی چەندین کەسایەتی لە میرەکانی بابان کردوە، لە کاتێک دا هەندێ لەوانە زۆر دژی یەکتری بون.

### مەدحی ئیبراهیم پاشا

پێ ئەچێ لە ناو میرەکانی بابان دا لە هەمویان زیاتر بە ئیبراهیم پاشا سەرسام بوبێ. ئیبراهیم پاشا کوری ئەحمەد پاشا، ساڵی 1197 بۆتە حاکمی بابان. ساڵی 1199 شاری سلێمانی بنیات ناوە. تا ساڵی 1217 کە بۆ بەشداری لە سەرکوتکردنی ئیزیدیەکان، لە گەڵ لەشکری وەزیری عیراق، بە لەشکری بابانەوە چۆتە سنجار، لە گەڵ ئەورەحمان پاشای ئامۆزای دا مونافیس و مێملی یەکتری بون. سلێمانی هەر جارەی بە دەس یەکێکیانەوە بوە. لە کاتی ئەو لەشکرکێشیەدا نەخۆش کەوتوە و مردوە. لە نزیک نەبی یونس لە موسڵ ناشتویانە. خالید لە ستایشی ئیبراهیم پاشادا زیاتر لە قەسیدەیەکی داناوە. لە یەکێکیان دا ئەڵێ:

خــواهم از نظــم ده سلســله لیــلو نهــار
مــدد مــدحت شــه گــرچه نیایــد به شــمار
انــکه در رزم دلــش خنــده بفــولاد کنــد
وانکه در بزم کفش طعنه زنـد بـر ابحـار
انکه در منقبتش ایـزد همچـون گویـا اسـت
شــاهد حــال بــود ایــت: قلنــا یــا نــار

تا ئەگا بەوەی دزای چاکە بۆ خۆی و منداڵەکانی و، توک لە نەیارەکانی ئەکا، ئەڵێ:

به ابـد ان داور دیـن بـا هـمه اولاد کـرام
ایمـــن از قـــاطبه صـــدمه چـــرخ دوار
بایـد خـرم و فرمـان ده و اورنـگ نشـین
دشمنش بد دل و محروم و سـتمدیده و زار

(رۆحی مەولانا: 20)

تێبینی: بۆ خوێندنەوەی دەقی تەواوی شیعرە فارسیەکانی ئەتوانرێ لە رێگەی دواحەرفی قافیەکانی لە هەر چاپێکی "دیوانی مەولانا خالید" دا بدۆزرێتەوە.

بۆ خوێندنەوەی دەقی تەواوی تەرجومەی کوردی شیعرەکانی ئەتوانرێ بە ژمارەی شیعرەکە لە "رۆحی مەولانا" دا بدۆزرێتەوە.

لە یەکێکی تریان دا ئەڵێ:

از پـــس حمـــد ملـــک ذوالجـــلال
بعــــد درود مه بــــرج کمــــال
به که به اوصـــاف شـــه دادگـــر
خـــامه کـــنم رشـــک ده نیشـــکر

لە دوا بەیتی دا ساڵی بنیاتنانی سلێمانی بە حسابی ئەبجەد بۆ مێژو تۆمار ئەکا و، ئەڵێ:

کـرد خیـرد خـتم سـخن ایـن چنـین
"انـــک فیهـــا لمـــن الخالـــدین"

(رۆحی مەولانا: 81)

**مەدحی حەسەن بەگ**

حەسەن بەگ کوڕی ئەورەحمان پاشا بوە، لـە گـەڵ مـەحمود پاشـا و عوسـمان بـەگ و سـلێمان بـەگ باوکبرا بوە. دایکی ئەمان خوشکی خالید پاشا واتە لە بنەماڵەی بابـان بـوە، بـەڵام دایکـی حەسـەن بـەگ لـە بەگزادەکانی جاف بوە. ریچ لە گەشتەکەی دا کە گەیشتۆتە سلێمانی باسی حەسـەن بـەگ ئـەکا کـە بـە فیتـی تورک فریوی خواردوە، هەڵاتوە بۆ بەغداد، لە سەودایەک دا کە مەحمود پاشا، میری ئەو کاتەی بابان، لە گـەڵ داود پاشای والیی بەغداد کردویەتی، "هەرزانفرۆش" ی کرد بو، بە کەساسی و بە گیـراوی لـە بەغـدادەوە بـە پاسەوانیی 100 چەکدارێ گورجیەوە نارد بویەوە سلێمانی و رادەستی پاشـای بـرای کـرد بـوەوە. ریـچ کـە خۆی لە دانیشتنەکانی دا چەند جارێ دیویەتی بە "گێل" وەسفی ئەکا. (ریچ: 148) ئـەوەی لـە بـەر دەس دایـە

خالید دو شیعری بۆ ستایشی ئەو تەرخان کردوە. بە پێچەوانەی ڕیچەوە ئەم بە "شەجیع و عالم و عادل" و بە "ژیریی" پەسنی ئەدا و، ئەڵێ:

بحمدالله که از اقبال و بخت خسرو ثانی
در درج مروت، اختر برج جهانبانی
چراغ دودمان شیر شیران شاه گردون جاه
حسن بیگ انکه زیبد نور چشم عالمش خوانی... تاد

*(ڕۆحی مەولانا: 74)*

زهی شاهنشه عالی و ظل یزدانی
قرین دولت و شوکت، خلیل رحمانی
کف سخای ترا بحر گفتم و دل گفت
قیاس بحر زکف میکنی ز نادانی... تاد

*(ڕۆحی مەولانا: 73)*

## مەدحی سلێمان بەگ

سلێمان بەگ یەکێ بوە لە کوڕەکانی ئەوڕەحمان پاشا و، یەکێ بوە لە ملۆزمەکانی مەحمود پاشای برای. دوای ڕۆیشتنی خالید لە سلێمانی. کاتێ مەحمود پاشا لە وەزیری بەغدا هەڵ ئەگەڕێتەوە ڕو ئەکاتە ئێران و پەنا ئەباتە بەر عەباس میرزای کوڕی فەتحەلی شا، سلێمان بەگ هاوکاری لە گەڵ داود پاشا ئەکا دێتە سلێمانی. چەند جارێ ئەم دو برایە ئەویان بە یارمەتی عەجەم و ئەمیان بە یارمەتی ڕۆم دەس ئەگرن بە سەر سلێمانی دا و، ململانێیەکی خوێناوی لە سەر دەسەڵات لە گەڵ یەکتری ئەکەن. جارێک لە قەرەگۆل (1243 ک) لە دەشتی شارەزور و، جارێک لە گردەگرۆێ (1244 ک) لە نزیک شاری سلێمانی و، جارێکی تر لە ناڵپارێز (1247 ک) لە نزیک پێنجوێن، داویانە بە یەک دا.(بابانی: 148. زکی: 155).

خالید، کاتێ لە سلێمانی ژیاوە، لە مەدحی سلێمان بەگ دا قەسیدەیەکی داناوە، ئەڵێ:

کیست این کز نگهی رهزن صد جان باشد
هر زمان جلوەکنان بر سر میدان باشد
خسروانه چو پی گویی دواند گلگون
سر صد کوهکنش در خم چوگان باشد
حور از عکس رخش دست ز حسن خود شست
وای بر حال اسیری که از انسان باشد... تاد

*(ڕۆحی مەولانا: 57)*

لە دیوانەکەی دا چەند شیعرێکی تری تێ دایە کە دیارە لە ستایشی کەسێکی گەورەدا دای ناون. بەڵام لە بەر ئەوەی ناوەکانیان دیار نین، ئاماژەیان پێ نەدراوە.

هەڵسەنگاندنی "مەدح" ەکانی خالید، چەند بابەتێکی لێ ئەخوێنرێتەوە کە ئەشێ چەند سەرنجێکی ڕەخنەیی‌یان لێ بدرێ، لەوانە:

**یەکەم**، دارشتنی مەدحەکان، کە بۆ پیاوی ناسراو هەڵبەستراون، لە گەڵ ستایشکردنی دافرەتی نەناسراو دا جیاوازیەکی ئەوتۆیان نیە. هەمان شیعر ئەگونجێ بۆ مەدحی کەسێکی تریش بە کەمێ دەسکاریەوە بە کار بهێنرێ. لە ئەدەبیاتی فارسی دا نمونەی لەم شیعرانە زۆرە.

**دوهەم**، لە ئەندازەبەدەر موبالەغەی لە ستایشی میری "مەدح" کراودا کردوە.

**سێیەم**، لە هەمو شیعرەکان دا کە باسی ئازایەتی، دادپەروەری، کابرای کردوە، باسی بەخشندەیی دارایی میری "مەدح" کراو لە هەمو شیعرەکان دا بابەتێکی سەرەکیە، کە ئەشێ پێوەندی لە گەڵ هەلومەرجی سەختی گوزەرانی خەڵکی ئاسایی دا هەبو بێ.

بە پێی لێکدانەوەی سەردەمی ژیانی میرە مەدحکراوەکان و، ناوەرۆکی شیعرەکان، ئەبێ ئەو شیعرانە هەمویان بەرهەمی پێش سەفەری هیندستان بن. دوای ئەو سەفەرە هیچ شیعرێکی لەو بابەتە، لە دیوانەکەی دا، بەدی ناکرێ.

## خالید و مەرسیە

خالیدی لاو لە ناخۆشی و پرسەی کەسایەتیەکانی ناوچەکەی دا بەشدار بوە. بۆ چەند کەسێکیان مەرسیەی هۆنیوەتەوە و، لە کۆتایی شیعرەکەی دا ساڵی مردنی بە حسابی ئەبجەد دیاری کردون. ئەمەش جۆرێ بوە لە وەستایەتی لە پیشەی هەڵبەستنی شیعردا.

ساڵی 1213 ک وەبای تاعون لە سلێمانی بڵاو بۆتەوە. چەندین کەسی کوشتوە یەکێ لەوانە کەسایەتی زانستی و مامۆستاکەی خۆی، شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجی، بوە. بەو بۆنەیەوە بە زمانی فارسی، مەرسیەیەکی هۆنیوەتەوە:

لە سەرەتاکەی دا ئەڵێ:

پـی گلگشـت در فصـل بهـاری
گذشـتم بـر بسـاط جویبـاری
نـگه کـردم که مـرغ گلسـتانی
نـوا سـنجد در مـرثیه خـوانی

لە ستایشی زانایی شێخ عەبدولکەریم دا ئەڵێ:

کسی چون او به فن حـق پرستی
نگشـته ثبـت در دیـوان هسـتی
کلام و زیج و حکمت بـا نجـومش
بدی یـک قطـره از بحـر علـومش

بۆ تۆمارکردنی ساڵێ مردنی بە حسابی ئەبجەد نوسیویتی:

"بنـی تـاریخهم ربـی الـرحیم
کفاکم خالـدا داری النعـیم: ١٢١٣"

مەرسیەیەکی تری بۆ مەلا ساڵح داناوە. رەنگە مەلا ساڵحی تەرمەاری بوبێ، کە یەکێ بوە لە مامۆستاکانی سەردەمی فەقێیەتی و، دوای ئەوەش لە گەڵ خۆی و لە گەڵ کورەکانی، کە ئەوانیش مەلا بون، بە نامە درێژەی داوە بە دۆستایەتی‌یان. ئەڵێ:

فریـــــد دهـــــر مـــــلا صـــــالح زاد
كه تـــا بـــد داد علـــم و فضـــل میـــداد
روانـــش بـــود مـــرغ گلشـــن قـــدس
روان شـــد ســوی نزگتگـــاه خـــود شـــاد
ســـــتون علـــــم و عمـــــان معـــــانی
هـــــمه اســـــتادها را بـــــود اســـــتاد
رقـــــم زد خـــــامه تـــــاریخ وفـــــاتش
"كه از پـــــا ان ســـــتون علـــــم افتـــــاد"

له هۆنینەوەی "مەرسیە" یش دا دیسان پشکی گەورە بەر کوژراوەکانی بنەماڵەی بابان کەوتـوە. لە شەڕی زرێباردا کە هێزی هاوبەشـی بابـان بە سـەرکردایەتی ئەوڕەحمـان پاشـا و ئەردەڵان بە سـەرکردایەتی ئەمانوڵاخان دژی هێزی هاوبەشی بابان بە سـەرکردایەتی خالیـد پاشـا و وەزیـری بەغـداد بە سـەرکردایەتی سولەیمان کەھیە. روی داوە. شەڕەکە بە سەرکەوتنی ئەڕەحمان پاشا کۆتایی هاتوە. خالید پاشا دەربـاز بـوە. سولەیمان کەھیە بە دیل گیراوە. ئەورەحمـان پاشـا بـۆتەوە بە حـاکمی بابـان. بەڵام لەو شـەڕەدا دو کەس لە فەرماندە نازاکانی هێزەکەی ئەورەحمان پاشا کوژراون. کە یەکێکیان سەلیم بەگـی بـرای و ئەوی تریـان میـر عوسمانی ئامۆزای بوە. مەلا خالید بۆ هەردوکیان "مەرسیە" ی نوسیوە و. ساڵی کوژرانی بە حسـابی ئەبـجەد دیاری کردون.

مەلا خالید بۆ شینی سەلیم بەگ. ئەڵێ:

هزبـر بیشـەی مـردی سـلیم ابـن محمـود آنكـه
بنـوک نیـزماش بـس عقـده واناشـده. وا شـد

له کۆتایی دا ئەڵێ:

ز مـرگ او بسـی اه و دریـغ انـدر جهـان افتـاد
همین تاریخ سال مرگ او "اه و دریغا: ۱۲۲۱" شد

بۆ شینی میر عوسمان. ئەڵێ:

آه ازیـــــن گـــــردون دون صـــــد داد ازیـــــن
نیســـــت جـــــز مـــــردان حـــــق را در كمـــــین

ئینجا ئەڵێ:

مـــــاه ذی الحـــــجه بـــــود. و بیســـــت و یكـــــم
رخـــــش همـــــت كـــــرد در یكشـــــنبه زیـــــن

له کۆتایی دا ئەڵێ:

از پـــــی تـــــاریخ ســـــالش گفـــــت دل
"بـــــاد حـــــد بـــــاره بمـــــرگش افـــــرین: ۱۲۲۱"

بۆ یەکێکی کە لە کوژراوەکانی شەڕی دەربەندی بازیان. کە ئەویش نیسان لە نێوان هێزی بابان بە سەرکردایەتی ئەوڕەحمان پاشا و هێزی وەزیری بەغداد بە سەرکردایەتی خودی وەزیر بوە. بە شکستی خوێناوی ئەوڕەحمان پاشا و کشانەوەی لە قەڵەمڕەوی بابان تەواو بوە. لە مەرسیەی یەکێ لە کوژراوەکانی دا ئەڵێ:

داد از تظلـــــــم فلـــــــک حقـــــــەباز داد
چنـــدین هـــزار خـــرمن هســـتی بیـــاد داد

لە دوا بەیتی دا بۆ تۆمارکردنی ساڵی کوژرانی ئەڵێ:

تـــاریخ رحلـــتش ز خـــرد جســـتم و ز غـــم
"اول "دریغ" گفت و پس انکە بگفت "داد": ۱۲۲۳"

خالیدی لاو، وەکو هەمو گەنجێکی ئاسایی، سەرەڕای نائارامی هەلومەرجی سلێمانی، ڕۆژانە لە تەک ئەنجامدانی کاروباری مزگەوت و مەدرەسەکەی دا، لە بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی سلێمانی دا بەشداری کردوە: چوە بۆ سەیران، وەرزشی کردوە. وەکو بە شیعرەکانی دا دەرئەکەوێ یاری تاوڵە و شەترەنجی زانیوە. تا ئەو کاتەی بە یەکجاری کۆچی کردوە بۆ بەغداد قلیانی کێشاوە *(الخانی: 304)*. لە پرسەی کوژراو و مردوەکانی دا بەشدار بوە، ستایشی گەورە کاربەدەستەکانی کردوە، بە ڕێبازی شاعیرەکانی ئێران دا غەزەلی نوسیوە.

## خالید و سەیران

خالید یەکێ لە قەسیدە درێژەکانی بۆ باسی سەیرانێکی خۆی و چەند هاوڕێیەکی بۆ گوندی عەودالان تەرخان کردوە. عەودالان مەڵبەندی زنجیرەیەک شێخی تەریقەتی قادری بوە، هەر بەو هۆیەوە پڕی بوە لە باخی خۆش و بێستانی ئاوەدان. لە شیعرەکەی دا سەرەڕای ستایشی دارودرەخت و گوڵ و گیا و کانی و ئاوی عەودالان و باڵندە و گیاندارەکانی ئاماژەیەکی تێدایە بۆ مەڵبەندێکی دینی. ئەڵێ:

گـوش بایـد کـرد ازیـن سرگشـتەی انـدوهگین
شـــمەی از صـــنعت خـــلاق گیتـــی آفـــرین
چنـد تـن روزی زهمـزادان ز جـام عـیش مسـت
بهـر گشـت گلسـتان گشـتیم بـا هـم همقـرین
ده بـە ده، صـحرا بـە صـحرا تـا بـە گلـزار ارم
یعنـی بـاغ عبـدالان ان "معـدن اربـاب دیـن"
ناگهـان هـاتف زهـر سـو بانـگ زد کـی بیـدلان
هـــذه جنـــات عـــدن فادخلوهـــا خالـــدین
چـون فـرو بـردیم سـر بهـر تماشـای چمـن
از دل مـا محـو شـد سـودای فـردوس بـرین.. تاد

*(ڕۆحی مەولانا: 44)*

## خالید و وەرزش

گۆبازی یارییەک بوە بە گۆچان و گۆ کراوە. گۆ تۆپێک بوە لە چەرم یا لە تەختە دروست کراوە بە گۆچان لێی دراوە و گێراوەتە نیشانەیەکی دیاریکراو. هەندێ جار بە سواری کراوە و هەندێ جار بە پیادەیی. کوردی لە یەکێ لە شیعرەکانی دا ئاماژە بۆ ئەم یارییە ئەکا و ئەڵێ: "گۆی سەرم چەوگانی میحنەت دایە بەر خۆی رایفڕاند/ ئەلعەجەب بۆ شەهسواری خانەی زینم نەهات؟". گۆبازی وەرزشێ بوە تایبەت بە چینی سەرەوەی کۆمەڵ. خەڵکی ئاسایی توانای دارایی و بواری ئەنجامدانی ئەم وەرزشەی نەبوە. خالیدی لاو چۆتە مەیدانی ئەم یارییەوە. یەکێ لە جارەکان لە باتی ئەوەی نیشانەی دیاریکراو بپێکێ بە هەڵە ناوچاوانی یەکێ لە هاوڕێکانی بەشداری یارییەکەی ئەنگاوتوە و شکاندویەتی و خوێنی پێدا هاتۆتە خوارێ. خالیدی لاو بە شیعر، بە زمانی فارسی، داوای لێبوردنی لە هاوڕێکەی کردوە،

بچوگان قضا بادا شکسته دست چوگانم
که بر هم زد هلال ابروی خورشید تابانم

لە دوا بەیتی دا ئەڵێ:

شفق شد خالد از خون مشرق پیشانی جانان
قیامت خاست، تا کی زنده؟ زین نکته حیرانم.. تاد

*(ڕوحی مەولانا: 33)*

ئەم بەشەی شیعرەکانی دیوانەکەی ئەشێ هی خالیدی سەردەمی لاوی بێ. هی سەردەمی گەنجێکی بەهرەداری خاوەن هیوای گەورە بوە. خاوەن هیوای هەڵکشان بەرەو ئاستێکی کۆمەڵایەتی بەرزتر. خالیدی پیری تەریقەت، خۆیشی لە نامەیەکی دا کە بۆ یەکێ لە دۆستەکانی کۆیەی نوسیوە، دانی بەوەدا ناوە. لە نامەکەی دا، کە پێشەکیەکەی بە پەخشانێکی ئەدەبی دەس پێ کردوە، ئەڵێ:

"دگر اطناب چە ضرور؟ قطعەی لطیفەرا، کە در ایام قدیم، در حالت دوقی گفتە بودیم، اورا وصف الحال دانستە، در رشتەی تحریر کشیدە و روانەی حضور گردید، باقی بیت:

گر بمانیم زندە بردوزیم　　جامەء کز فراق چاک شدە
ور بمیریم عذر ما بپذیر　　ای بسا کە ارزو خاک شدە
در پناە پیران و مورد عنایت فقیران. باشند. والسلام"

خالید دوای ئەوەی دۆستەکەی بە "پەنای پیران و عینایەتی فەقیران" سپاردوە، تەواوی غەزەلەکەی رۆژگاری زوی بۆ نوسیوەتەوە، کە ئەڵێ:

چنان ببریدی اخر رشتەهای اشنائی را
کە نتوان داد داد شکوەء روز جدائی را

لە دوا بەیتی دا ئەڵێ:

بود بس داروا در ناز و نعمت ناسپاسیها
چە سان هرگز روا دارد خدا این داروائی را

*(دەستنوس: 159)*

بـابەتی شـیعرەکانی. سـاڵی دانـانی هەنـدێکیانی. دەری ئەخەن. کە نەک هەر هـی پـێش سـەفەری هیندستان، بەڵکو بەشێکی هی پێش سـەفەری حەجـن. لە مـاوەی سـەفەری حەج دا. کـۆمەڵێ شـیعری دانـاوە هەمویان ئەناسرێنەوە. هەروەها لە ماوەی سەفەری سەحرانەوەردی دا بۆ هیندستان بەرەو "کەعـبەی ئامـال" ی بۆ لای شاه عەبدوڵاهی دیهلەوی کۆمەڵێ شـیعری دانـاوە ئەوانـیش هەمویـان ئەناسـرێنەوە. هەنـدێ شـیعری تریشیان. کە شیعری "موناسەبەت" ن ئەناسرێنەوە. شیعرە "ویجدانی" یەکانیشی بە ئاشـکرا دیـارن. قۆنـاغە جیاوازەکانی ژیانی. لە سەفەر و لە حەزەردا. وە لە غوربەت و وەتەن دا. وەکـو خـۆی لە نوسـینی نامەکـانی دا ئاماژەی پێ داون. زادەی ژینگەی کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی جیاواز بون.

## خالید و زمانی کوردی

لەو سەردەمەی خالیدا هێشتا سلێمانی وەکو شار تازەدامەزراو بو. لە ئەنجامی جەنگی بابانی - بابانی. جەنگی رۆمی - عەجەمی. لە ئەنجامی تێوەگلانی سەرجەم دانیشتوانی ناوچەکەوە. بە میر و گزیر. دەوڵەمەن و فەقیرەوە. بەو جەنگانەوە. هێشتا ئارامیەکی سیاسی. کۆمەڵایەتی. ئابوری. فەرهەنگـی ئەوتـۆ لە نـاوچەکەدا نە گەیشتۆتە پلەیەکی پێشکەوتن. تا ئەم پایتەختە تازەیە. ببێتە ژینگەیەکی ئەوتۆ پێویسـتی بە زمـانێکی تـازەی ئەدەب و نوسـینی فەرمـی کاروبـاری دەزگـای کـارگێڕی بـێ. زمـانی کـوردی - زاراوی سـلێمانی بە جـۆرێ ئەخەملی بو. ببێتە زمانی دانانی شیعر و نوسینی پەخشان.

سەردەمی خالید و پێش ئەو چەند هەوڵێ هەبوە:

- شاعیرێ "موناجات" ێکی بۆ خالید پاشا داناوە.
- مەلا محەمەدی ئیبن ئەلحاج ( ؟ - 1189 ک) "مەهدی نامە" ی بە شیعر هەڵبەستوە.
- مەلا محەمەدی سێوچی ( ؟ - 1192 ک) "تەزکەرەتولعەوام" ی بە شیعر هۆنیوەتەوە.

ئەمانە هیچ کام ئەیان توانیوە ببنە خۆشکەری زەمینەی داهێنـان و دامەزرانـدنی مەدرەسـەیەکی تـازەی شیعری کوردی بە زمانێکی جیاواز لە لەهجەی گۆران. کە ئەوسـا لە باشـور و رۆژهەڵاتـی کوردسـتان زمـانی باوی هۆنینەوەی شیعر و. دارشتنی داستان و مەلحەمە بوە. یا بە زمـانێکی جیـاواز لە لەهـجەی کرمـانجی. کە ئەوسا لە باکوری کوردستان زمانی باوی هۆنینەوەی شیعر و داستان و مەلحەمە بوە. چەند ساڵێ دوای خالید ئەم پرۆسەیە: پرۆسـەی خەملینـی زاراوی سـلێمانی ئینجـا خەملـی و. مەدرەسـەی ئەدەبـی شـیعری بابـان لە سەردەستی سێ کوچکەی شیعری کوردی: نالی. سالم. کوردی. دامەزرا و گەشەی کرد.

خالید نوسینێکی کوردی دەربارەی "عەقاید" لە پاش بە جێ ماوە کە هاوشێوەی "عقائـد" ە فارسـیەکەی خۆیەتی. هێشتا تەواو ساخ نەبۆتەوە. هی خۆیەتی یا تەرجومەی "عقائد" ە فارسـیەکەیەتی و کەسـێکی کە بـۆ کارئاسانی تێگەیشتنی کردویەتی بە کوردی. جگە لەمە نوسینی بە کوردی لە پاش بە جێ نەماوە.

بە کوردی خالید چەند شیعرێکی لە پـاش بە جـێ مـاوە. لەوانـە هەنـدێ شـیعری بـە زاراوی گـۆران هۆنیوەتەوە. لە دەسپێکردنی شیعرەکە و کێشی پەنجەیی و جۆری قافیەکانی دا. پێڕەوی هەمان شێوازی باوی دارشتنی شاعیرەکانی گۆرانی کردوە. ئەمەش نیشانەیە بۆ ئاگاداری خالیدی لاو لە ئەدەبی گـۆران. سـەرەتای یەکێ لە شیعرە هەورامیەکانی بەمجۆرە دەس پێ کردوە:

وە ئەوداڵ ئەکەم
تا کەی خۆم چـون قەیـس وە ئەوداڵ ئەکەم
بـــازوی دەروێشـــیم پـــڕ خڕخـــاڵ ئەکەم
پۆشـاکێ جە لۆنـگ شـا دەسـماڵ ئەکەم.. تاد

لە شیعرێکی تری دا ئەڵێ:

قیبلەم فیراقت
ئـارام لـێم سـەنەن سـەودای فیراقـت
دڵ قەقنـەس ئاسـان جـە ئیشـتیاقت
تاقـەت تـاق بیـەن پـەی ئـەبرۆی تاقـت.. تاد

شیعرێکی تریشی بەمجۆرە هۆنیوەتەوە:

میزام وەفاتەن
قـەدەم رەنجەکـەر وادەی وەفاتـەن
شەهنشـای شـاهیم مـات ئاماتـەن
بتپەرسـت ئاسـا ئـەروام جـە لاتـەن

لە دوا بەیتی دا ئەڵێ:

وەرنـە هـا تـەمام ئـایرەی دوری
وە کـۆی ئـورە کـەرد سـەرتاپای ئـوری

لە شیعرێکی تری دا کە بۆ ناسینی محەمەد، پێغەمەری ئیسلام، داینـاوە و، ئەچێتـە خانـەی هـۆنراوەی فێرکاریەوە، ئەڵێ:

هامسەران نەسەب
مەحبوبیوم هەن شای عالی نەسەب
ئیسمش موحەمەد قورەیشی و عـەرەب | ئـەداش ئامینـەن کناچـەی وەهـەب
تەمامی عومرش شەست و سێ ساڵەن | باب و باپیرش بەی تەرز و حاڵـەن
عەبـدوڵا و عەبدولموتـەلیب هاشـم | عەبدولمـەنافش بزانـاش لازم
نە کۆتا و نە بەرز، سپی و گەندم گون | نەکەوتەن سایەش نە روی دنیـای دون
بـە وەلـەد بیـەن جـە مەکـەی ئـەنوەر | چل ساڵ جاکە مەند بی وە پەیغەمبـەر
وە سـێزدە هـەنی ئـەو خۆرجەمینـە | راهی بی کۆچ کەرد شـی وە مەدینـە
جەوکە موقیم بـی تـا مـودەی دە سـاڵ | مەرگش بی ئاما جە لای بـێ زەوال
بەر شی جە دنیـای فـانی بـێ بونیـاد | ئەبلەە کەسێوەن دڵ پێش کەرۆ شاد
سەدوبیسـت و چـار هـەزار پێغەمبـەر | سێ سەد و سێزدە رەسـول و رەهبـەر
ئیبـراهیم و نـوح، موسـان ئولولعـەزم | عیسا و موحەمەد بزاناش وە جـەزم
سەیدولکەونەین خەتمولمورسەلین
جە ماسیوای حەق بیهتەر جە گردین.

"موناجات" ەکەی کە زیاتر لە سەد بەیتـی مەسـنەویە، بە گرنگتـرین شـیعری کـوردیی ئەو دائەنـرێ. سەرەتاکەی بەمجۆرە دەس پێکردوە:

یا فەردی ئەعزەم
یا حەی، یا قەیوم، یا فەردی ئەعزەم

| | |
|---|---|
| یـا شـنەوەندەی نـاڵەی سـوبحدەم | نە پای بەندییان، بەندیخانەی غەم |
| یـا فەرازنـدەی چەرخـی مـوعەللەق | یا نیگارندەی نـۆ تـاقی ئەزرەق.. تاد |

بەم بەیتە کۆتایی پێ هێناوە:

| | |
|---|---|
| نیـازم ئێـدەن یـا حەی، یـا قەیـوم | خالید جە دەرگـات نەکەری مەحـروم |

لەم موناجـاتە دا، هەردو زاراوی هەورامـی و بابـانی تـێکەڵاو کـردوە و، کەڵکـی لە ڕێزمـانی فارسـی وەرگرتوە بە سەدان وشەی داڕشتەی ئەو زمانەی کوردانەوە. ناوەرۆکی موناجاتەکەی پێ ڕازاندۆتەوە.

لە یەکێکی تریان دا کە بە زاراوی کوردی بابان هۆنیویەتەوە و، دو ڕستەی عەرەبی "تـەزمین" کـردوە، زەمانێ بوە کە ئەم زمانە هێشتا نەبۆتە زمانی شیعر و، هێشتا مەدرەسەی شیعری بابان، لە سەر دەسـتی نـالی و سالم و کوردی دا نەخەملی بو، ڕەنگە لە حیجاز لە ڕۆژانی حەج دا گوتبێتی، ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| دیســـــان دیـــــاری دولبـــــەری | وەک مەشعەلســـــتان دای دیـــــار |
| نــور بـون لـە سـەر کێـوی ئوحـود | تۆمـــار بـــە تۆمـــار ئاشـــکار |
| خـۆش، خـۆش نەسـیمی عەنبـەرین | بۆنخـــۆش دەکـــاتن ســـەرزەمین |
| وەک رائیحـــــەی گوڵعەنبــــەرین | یـــا نافـــەیی موشـــکی تـــەتار |
| بـــێ وادە ئەمشـــەو ڕۆژهـــەڵات | یـا نـوری جانـان سـات بـە سـات |
| رونـــــی کـــــردوە ڕوی بســــــات | فـــی اللیــــل یــــولج النهــــار |
| پــڕ بــو لــە نــور دەشــتی نقــا | گوایـــە حـــەبیبی خـــۆش لیقـــا |
| لـــــیلا علـــــی الســـــمع ارتقـــــی | مـــن نـــور القـــاع اســـتتار |

پێ ئەچێ ئەم شیعرانەی لە سەرەتای لاویتی دا هەڵبەست بێ، کە تازە دەستی کردوە بە دانانی شـیعر. ئەشێ هەر یەکەیانی بە بۆنەیەکەوە دانابێ. شیعرەکانی لاوازن لە ئاستی شیعرە فارسـیەکانی دا نـین. ئەوسـا "نوری" کردۆتە نازناوی ئەدەبی. دواتر وازی لەم نازناوە هێناوە بە ناوەکەی خۆیەوە کۆتایی بـە شـیعرەکانی هێناوە.

## -2-
## خالیدی حاجی (1220 - 1224 ک)

حەج جگە لەوەی فەریزەیەکی دینیە هەر موسڵمانێ توانای دارایی هەبێ ئەبێ ئەنجامی بدا، هەندێ گرنگی تری هەبوە بۆ ئەو کەسەی چۆتە حەج:

یەکەم: لە کوردەواری دا پایەی کۆمەڵایەتی ئەو کەسەی پێ بەرز بۆتەوە. حاجی بون نیشانە بوە بۆ ئەوەی کابرا توانای دارایی هەیە و، ئەگەر نازناوی هەبو بێ دەستەواژەی حاجی بۆ نازناوەکەی زیاد کراوە، ئەگەر هیچ نازناوێکی کۆمەڵایەتی نە بو بێ، حەجکردن نازناوی حاجی پێ بەخشیوە و، لە ناو کۆمەڵگادا ڕێزێکی بۆ زیاد کردوە و، پلەی کۆمەڵایەتی باشتر بوە.

لە کۆمەڵگای کوردی دا حەج روداوێکی گرنگ بوە لە ژیانی ئەو کەسە دا و، هۆیەک بوە بۆ بەرزبونەوەی پایەی کۆمەڵایەتی. سەرەڕای ئەو هەمو ناارامیەی بە سەر قەڵەمڕەوی بابان دا هاتوە وەکو ریچ لە یادداشتەکانی 20 ی ئایاری (1820 ز/ 1236 ک) دا نوسیویتی: "هەر ئەمڕۆ پیرەپیاوێکی کورد سەربانی کردم، کە لەم دواییەدا لە مەکە گەڕا بوەوە. هەر کوردێکیش کە لە حەج بگەڕێتەوە، مێزەرێکی سپی لە سەر دەنێ. لەم سێ ساڵەی دوایی دا نزیکەی دو هەزار کەسێک لە ناوچەی سلێمانی حەجیان کردوە." *(ریچ:121)*

**دوەم:** لە سەرانسەری وڵاتانی ئیسلامیەوە موسوڵمانان رو ئەکەنە مەکە و مەدینە بۆ حەج ئەمەش هەلێکی گەورەی رەخساندوە بۆ تێکەڵاوی و ئاڵوگۆری بیروڕا و یەکترناسینی موسوڵمانانی ناوچە جیاوازەکانی جیهانی ئیسلامی.

حەج هەر وەک روداوێکی گرنگ بوە لە ژیانی کەسەکە دا هەروەها روداوێکی ساڵانەی گرنگیش بوە لە ژیانی دانیشتوانی ناوچەکە دا. پاشا و میرەکان بە دەگمەن خۆیان چون بۆ حەج. هەندێکیان بە پارەی خۆیان مەلا و خەڵکی تریان ناردوە بۆ حەج. ئەوانەی چون بۆ حەج بە زۆری لە چینی ناوەنجی کۆمەڵگا بون. حاجیەکانی هەر شار و ناوچەیەک، بۆ خۆپاراستن لە ڕێگر و جەردەی ڕێگاوبان، بە کۆمەڵ لە گەڵ کاروانی گەورە رۆیشتون. لە گەڵ خۆیان توێشوی سەفەرەکەیان بردوە، خەڵک و خزم و کەسوکارەکانیان بە ناڵا و دەف و موناجاتەوە لە رۆیشتن دا ماوەیەک لە گەڵیان رۆیشتون تا بە ڕێیان کردون و لە هاتنەوەیشیان دا بۆ پێشوازیەکیان بە هەمان شێوە ماوەیەک بەرەو پیریان چون. چون و گەڕانەوەیان دو روداوی گرنگ بون هەمو کۆمەڵگاکەیان بە خۆیانەوە خەریک کردوە.

مەلا خالید ساڵی 1220 ک (1805 ز) رێگەی حەجی گرتۆتە بەر. لە رێگەی موسڵەوە چۆتە شاری حەڵەب. لە رۆژی 4 ی شەوالی ساڵی 1220 دا لە حەڵەبەوە نامەیەکی بۆ مەلا ئەحمەدی باوزێ نوسیوە. لە نامەکەی دا داوای لێ کردوە:

**یەکەم:** دڵنیایی بداتە دایک و کەسوکاری کەوا ئەو سەلامەتە لە گەڵ کاروانی حاجیەکان دا بەرەو شام بە رێ ئەکەوێ.

**دوەم.** نیگەران نەبن. ئەگەر لە هاتنەوە دواکەوت. بە تەمای ئەوە بوە ساڵێک بمێنێتەوە و لە گەڵ کاروانی حاجیانی ساڵی داهاتو دا بگەڕێتەوە.

**سێیەم.** داوای کردوە ئەگەر ئەو ساڵە نەگەڕایەوە هەواڵی "دەعوا" ی عەجەم و فەرەنگی بۆ بنوسێ. *(مەکتوبات. نامە: 26)*

مەلا ئەحمەد. خەڵکی گوندی باوزێی ناوچەی پشدەر بوە. یەکێ بوە لە شاگردە دڵسۆزەکانی مەلا خالید.

## حەجنامە

مەلا خالید سەرەتای سەفەرەکەی بە هەڵبەستنی تەرجیعبەندێک. لە سەر شێوازی تەرجیعبەندەکەی عەبدورەحمانی جامی دەست پێ کردوە. هەڵبەستەکەی حەوت بەندە. بەندی یەکەمی بەمجۆرە داڕشتوە:

ساربانا رحم کن بر ارزومندان زار
وعده شد نزدیک و نبود بعد از این جای قرار... تاد

*(رۆحی مەولانا: 21)*

لە بەندی دوەم دا ئەڵێ:

چون منش بیخود کن از ذوق حدی بهر
دل ز جا شد. تا بکی محمل نمیجنبد زجای
گوش بر بانگ حدی جان سوی جانان
تن بخاک شام. دل با یاد یثرب در هوای
مهبط وحی خدا و مشرق نور هدی
مغرب مهر سپهر رحمت و صدق و صفای.. تاد

*(رۆحی مەولانا: 2)*

لە بەندی سێیەم دا ئەڵێ:

من که سرگردان جانانم چ باک از خان و
یا مرا کی در دل اید فکرت سود و زیان
در دل تنگم چنان سودای یثرب زد علم
جای گنجایش کجا دارد در او یاد جنان.. تاد

*(رۆحی مەولانا: 40)*

لە بەندی چوارەم دا ئەڵێ:

السلام ای چهرەات شمع شبستان وجود
السلام ای قامتت سرو بهارستان وجود.. تاد

(ڕۆحی مەولانا: 12)

لە بەندی پێنجەم دا ئەڵێ:

ای پناه عاصیان سویت پناه اوردەام
کردەام بی حد خطا و التجا اوردەام
بودەام سرگشته تیه ضلالت سالها
این زمان رو سوی خورشید هدی اوردەام.. تاد

(ڕۆحی مەولانا: 66)

لە بەندی شەشەم دا ئەڵێ:

سرور عالم من دل دادە حیران توام
والە و سرگشته سودای هجران توام
شاە تخت قاب قوسینی تو، من کمتر گدا
کی بود یارای ان گویم کە مهمان توام.. تاد

(ڕۆحی مەولانا: 38)

لە بەندی حەوتەم دا، کە دوایین بەشی تەرجیعبەندەکەیەتی، ئەڵێ:

حق انانی کە تا در قید هستی بودەاند
دم بدم در جستجوی خواهشت افزودەاند
هوشیارانی کە در امر خرد زو خیرە اند
لب بتصدیق تو از روشن دلی بگشودەاند.. تاد

(ڕۆحی مەولانا: 60)

مەلا خالید کە نزیک کەوتۆتەوە لە کێوەکانی مەدینە قەسیدەیەکی درێژی تری داناوە، سەرەتاکەی بەمجۆرە دەس پێ کردوە:

عجایب نشئەیی زین دامن کهسار می اید
تو گویی با نسیم صبح بوی یار می اید
ز خاکش یافت تسکین زخمهای سینە ریشم
تعالی الله چە سان از مشک این کردار می اید... تاد

(ڕۆحی مەولانا: 69.
بۆ خوێندنەوەی دەقی تەواو بڕوانە کۆتایی بابەتەکە)

مەلا خالید لەم سەفەرە، جگە لە بەجێهێنانی فەریزەی حەج، بە چەند مەبەستێ گەیشتوە:

**یەکەم:** ئەو شارانەی پێیدا تێپەڕیوە هەوڵی داوە سەردانی ناوەندە زانستیەکانی بکا و، لە گەڵ زاناکانی ئەوێ ناشنایی و ناسیاوی پەیدا بکا، گفتوگۆی زانستی - دینییان لە گەڵ دابمەزرێنێ.(ریاض المشتاقین: 85)

لە شام سەردانی شێخ محەمەد کەزبەری، کە زانایەکی ناسراوی گێڕانەوەی "حەدیس" بوە، کردوە. ئیجازەی گێڕانەوەی حەدیسی لێ وەرگرتوە. هەروەها لە گەڵ شێخ مستەفای کوردی ناسیاوی پەیدا کردوە کە ئەویش لە زاناکانی گێڕانەوەی حەدیس بوە. لە ساڵانی دواتریش دا، لە سەفەرەکانی دا، پێڕەوی ئەم شێوەیەی کارکردنی کردوە.

**دوەم:** گەڕان بە دوای "مورشیدی کامیل" دا کە ئیرشادی بکات و ئەمیش "تمسک" ی پێوە بکا.

ئەوەی لەم سەفەری حەجە دا گرنگە ئاماژەی پێ بکرێ ئەو گفتوگۆیەیە کە لە نێوان ئەو و یەکێ لە پیاوانی خوا دا روی داوە و، دواتر خەلیفە و موریدەکانی لە قاڵبی چیرۆکێکی ئەفسانەیی دا دەماودەم لە ناو خۆیان دا گێڕاویانەتەوە و، دایان ڕشتۆتەوە. نوسەرانی بیۆگرافی خالید، هەندێکیان چیرۆکەکەیان لە زمانی خۆیەوە، گێڕاوەتەوە کە لەوێ گوایە توشی بوە. ئەگەر روداو یاخود دروستکراو بێ، لە هەردو بار دا گرنگیەکی زۆری هەیە.

کاتێ کە لە مەدینە گیرساوەتەوە، ڕۆژانە پرسیاری لە هاتوچۆکەرانی کەعبە کردوە و، داوای ئامۆژگاری و ڕێنمونی رەفتار و هەڵسوکەوتی لێ کردون. توشی پیاوێکی نورانی خەڵکی یەمەن بوە. پرسیاری لەویش کردوە، ئەم وەکو "جاهیل" ێ ئەو وەکو "کامیل" ێ هەندێ ئامۆژگاری بکا دەربارەی هەڵسوکەوت لەو شوێنە پیرۆزە. ئەویش چەند ئامۆژگاریەکی پیرانەی کردوە و، فێری کردوە کە کاروبار لەو شوێنەدا پێویستە چۆن بێ. یەکێ لەو مۆچیاریانە ئەوە بوە:

"ئەگەر گەیشتیتە مەکەی موعەزەمە شەرەفی دابەزینی ئەوێت پێ برا، کە مایەی درەوشانەوەی حەزرەتی تەعالایە، موشەرەف بوی بەرامبەر نیشتەجێکانی و زائیرانی ئەو شوێنە ئاساری ئیعتیراز بە کار مەهێنە، ئەگەر لە کەسێ کردەوەیەکت بینی پێچەوانەی ڕواڵەتیی شەرعی شەریف بو، ئەوە بە بێ حیکمەتی مەزانە و بە بێهودەی مەژمێرە. بە تەوازوعەوە سەیری بکە. عاقل نابێ عیلم و عەقل و ئیدراکی خۆی بە جۆیەک ئەژمێرێ."

کە چوّتە مەکەی موعەزەمە و بەوە دڵخۆش بوە. بەیانی ڕۆژی هەینی بەرامبەر کەعبە دانیشتوە. کەوتۆتە خوێندنەوەی کتێبی "دلائل الخیرات". لە گەورەیی خوا سەرسام بوە، کتوپڕ کابرایەکی دیوە ریشێکی درێژی هەبوە و جلوبەرگی خەڵکی ئاسایی لە بەردا بوە. پشتی کردۆتە کەعبە و روی کردۆتە ئەم. دەریای غیرەتی جۆشاوە، ئامۆژگاری پیری یەمەنی لە بیر چۆتەوە. لەو بێ ئەدەبیە دڵی گۆڕاوە. پیری یەمەنی بەمەی زانیوە و، دڵی ئەوی خوێندۆتەوە. بە شێوەی گلەیی پێی وتوە:

"فلان ئەوەندە نازانی کە حورمەتی مەردی موئمین لە لای حەق سەروی حورمەتی حەرەمە و شەرەفی ئەهلی دڵ لە شەرەفی کەعبەی موعەزەم زیاترە:

دڵ بە دەستهێنان کە حەجی ئەکبەرە
دڵێ لە هەزاران کەعبە باشترە
کەعبە بنیادی خەلیلی ئازەرە
بەڵام دڵ روانگەی جەلیلی ئەکبەرە

کەواتە بۆچی ئەم ڕەفتارەی منت ئینکـار کـرد و ئامۆژگـاریەکەی پیـری یەمەنـی لە مەدیـنەی مـنەوەرە فەرامۆش و دەرگای ئیعترازت کردەوە؟"

خالید کە ئەم کەرامەتەی لەو پیاوە دیوە، بە سۆز و پاڕانەوە، ڕوی کردۆتە ئەو پیاوە و، وتویەتی:

"ئەی گەوهەری دورجی ولایەت دیارە تۆ یەکێ لە پیاوان و ئاگاداری ئەسراری مەبدەئو مەئـالی. یەکەم، ئەم موستەمەندە ببەخشە لەو سوئی ئەدەبە و، دوەم، ئەم گومبـوەی بیابـانی غیـوایەت بە ڕوی نەجات و هیدایەت دلالەت بکە. ماوەیەکە شۆر و هەوەسـێ لە سـەرم دایە و، تەمەسـوک بە کەسێکی وەکو تۆ لە بیـرم دایە، ئەگەر بە لوتـف قبـوڵم کەی و کلـۆمی دەرگـا داخراوەکـانم بە کلیلی هیمەت بۆ بکەیتەوە.

**کابرا وتویەتی:**

"ئەی عاشـقی سـەرگەردان، تـۆ هـی ئەوە نیـت لە گەڵ هەمـو قەل و داڵـێ بـی و، پەروەردەکردنی گوڵێکی وەکو تۆ هی هەمو چیمەنێ نـیە، تـۆ شایسـتەی چەمەن و گـوڵزارێکی تری، بەم ئیشارەتە بەشارەتت ئەدەمـێ کە لەم سـەفەری خەیرولئەسـەرە گەڕایـتەوە بـۆ وڵاتـی خۆت، کەسێ لە هیندستانەوە دێتە سەردانت، پەیامت بۆ ئەهێنێ."

*(ریاض المشتاقین: 89 - 91.*
*اصفی الموارد: 51. الحدائق الندیة: 33)*

خالیدێ لە کوردستانەوە، ئەو ڕێگا دورە پڕ مەترسیەی تەی کرد بێ، بۆ سەردانی پیرۆزگاکانی ئیسـلام و، ئەو هەمـو شـیعرەی لە ستایشـی ئەو شـوێنانەدا هـۆنی بێـتەوە، ئێسـتا کـابرایەکی ڕیشـداری چڵکـن بە جلوبەرگی کەسـێکی هەژاری ئاسـاییەوە پـێی بڵـێ: "لە لای یەزدان مـرۆڤ لە کەعبە، کە پیرۆزتـرین ڕوگەی موسوڵمانانی جیهانە، بەرزترە!" ئەبێ چ "ڕاچڵەکین"ێکی لە ناخی دەرونی خالیدا قەوماند بـێ؟ ئەم قسـەیە کە بـابەتێکی فەلسـەفی کـۆنە، نـاخۆ لە گەڵ قسـەی ئەوانە یەک نـاگرێتەوە کە وتویـانە: "مـرۆڤ بە نرختـرین سەرمایەیە"؟

ئەو کابرایەی پشتی کرد بوە کەعبە و ڕوی کرد بوە خالیـد، خالیـدی تـێ گەیانـدوە کە "فتـوح" ی ئەو لەوێ نـیە بەڵکـو لە لای کەسـێکی تـرە کە لە هیندسـتانە. حـاجی مەلا خالیـد بەو ئومێـدەوە گەڕاوەتەوە بـۆ کوردستان.

مەلا خالیـد چـۆن بە سـۆز و پەرۆشـەوە بەرەو مەکە و مەدیـنە چـو بـو، بە داخ و خەمێکـی زۆرەوە ماڵئـاوایی لە پـێغەمەر و پیرۆزگاکـانی ئیسـلام کـردوە. بەڵام بە پەیـامێکەوە کە بەرەو گەورەبـونی ببـا. بەم بۆنەیەوە ئەڵێ:

وا حسـرتا جـدا شـدم از خـانەیی خـدا
از غصە وقت گشتە شـود دل ز تـن جـدا.. تاد

*(ڕۆحی مەولانا: 3)*

هەروەها لە خواحافیزی دا وتویەتی:

ای جلوەگـــاە ایـــزد دادار الـــوداع
ای قبلەگـــاە احمـــد مختـــار الـــوداع

لە دوایین بەیتی دا ئەڵێ:

خالـد چـو دیـر امـدی و زود میـروی
بـا شـادی کـم و غـم بسـیار الـوداع

لەم سەفەرەدا ئەگەرچی کانیی شیعری مەلا خالید تەقیوەتەوە. بە دەم رێگـاوە گەیشـتۆتە هەر مەنزڵـێ، چەندین شیعری لە "نەعت" ی پێغەمـبەر و ستایشـی داروبەردی مەکە و مەدیـنەدا هۆنیـوەتەوە. لە هەمویـان دا خۆی بە گوناهبار دائەنێ و لە خوا ئەپارێتەوە لێی خۆش بێ و، لە پێغەمەر ئەپارێتەوە "شفاعەت" ی بـۆ بکـا. بە بۆنەی ئەم حەجەیەوە زنجیرەیەک شیعری هۆنیوەتەوە کە هەمویان تایبەتن بەم سـەفەرە، بـە سـەر یەکـەوە نیمچە دیوانێکە. ئەشێ لە دیوانەکەی دا وەکـو "حەجنامـە" پـۆلێن بکـرێن. بابەتەکـانی شـیعرەکان داهێنـانی تازەیان تێدا نیە زۆرتر دوبارەکردنەوەی هەمان بابەتن کە پێش ئەو زۆر شاعیری تر وتویانە.

حاجی مەلا خالید دوای گەڕانەوەی لە حەج چۆتەوە سلێمانی. پـێ نـاچێ وەکـو خـۆی بە تەمـا بـوە لە گەشتەکەی دا بۆ حەج ساڵێکی پێ چو بێ. لە حیجـاز پیـری تەریقەتـی نە دۆزیـوەتەوە. بەڵام بەرچـاوی رون بۆتەوە. لە سلێمانی چۆتەوە مەدرەسەکەی خۆی و، دەستی کردۆتەوە بە کاری مەلایەتی. مەلای مزگەوت ئەشـێ چەند کاری بو بێ: پێشنوێژیکردنی موسوڵمانانی ئامادەی مزگەوت لە هەر پێنج فەرزەکەدا، ئەگەر مـزگەوتەکە خۆی جگە لە مەلا پێشنوێژێکی تری نە بو بێ. دەرس بە قوتابی و فەقێ و هەندێ جار بە پـلەی موسـتەعید. وەڵامدانەوەی پرسوڕای موسوڵمانانی هاتوچۆکەری مزگەوتەکە و کێشەی رۆژانەی خەڵک.

کاروباری سلێمانی لەو ماوەیەدا ئاڵۆز و ئاتارام بوە. ململانێیەکی سەخت، لە نێوان ئەورەحمان پاشای کوڕی مەحمود پاشا و ئیبراهیم پاشای کوڕی ئەحمەد پاشا، کە ئامۆزا بـون، هەبـوە. دوای ئەویـش ململانـێی سەخت لە نێوان ئەورەحمان پاشا و خالید پاشای کوڕی ئەحمەد پاشا دا، ئەوانیش هەر ئـامۆزا بـون، هەبـوە. چەند جارێ ئاڵوگۆڕی دەسەڵات لە رێگەی هێنانی لەشکری ئێران یا تـورکەوە بـوە. لە گەڵ گـۆڕانی ئەوان دا گۆڕان لە دەزگای کارگێڕیی میرایەتی بابان دا روی داوە. هەمو جار بە سەدان کەس و خێزان دەربەدەر بـون. ئەوەش نائارامی زۆری خوڵقاندوە. مەلا خالید تا ئیبراهیم پاشا، بنیاتنەری شاری سـلێمانی، زینـدو بـوە بەو سەرسام بوە. بە چەند شیعر کە تایبەت بۆ "مەدح" ی ئەوی داناوە تا رادەی "موبالەغە" ستایشی کـردوە، بەڵام دوای مردنی ئیبراهیم پاشا (1217 ک) لە موسڵ، ئیتر روی کردۆتە دۆسـتایەتی لە گەڵ ئەورەحمـان پاشـا و کورەکانی؛ مەحمود بەگ، عوسمان بەگ، حەسەن بەگ، سلێمان بەگ... سەرەتای نامەکانی کە بۆ ئەورەحمـان پاشای نوسیون بە: "صاحبا" ئەی خاوەن، "امیدگاها" ئەی جێگەی ئومێد، "داعیان پناها" ئەی پەنای داواکاران، "عدالت پناها" ئەی پەنای دادپەروەری، دەستی پێ کردوە.

بنەماڵەی میرانی بابان لە ناو خۆیان دا ناکۆک و ناتەبا بون. والییەکانی بەغداد یارییان پێ کردون. چەند جارێ ئەورەحمان پاشایان لابردوە، یەکێ تریان لە ئامۆزاکانی لە جێ دانـاوە. چەنـد جـارێ گیـراوە و دور خراوەتەوە.

ساڵی 1220 ک والیی بەغداد ئەورەحمان پاشای لاداوە، ئەورەحمان پاشا ملـی نەداوە. خـۆی ئامـادە کردوە بۆ بەرگری. لە دەربەندی بازیان دامەزراوە. لەشـکری بەغـداد، بە هاوکـاری ئامۆزاکـانی ئەو، خالیـد و سلێمان، هێرشی کردۆتە سەری، هێزی بابـان بەرگەی نەگرتـوە شـکاوە. کوشـتارێکی زۆری لـێ کـراوە. ئەم شەڕە هاوزەمان بوە لە گەڵ حەجی مەلا خالید. ئەورەحمان پاشـا هەڵاتـوە پەنـای بـردۆتە بەر ئێـران. چـۆتە تاران بۆ سەردانی فەتحعەلی شای قاجار. شا رێزێکی زۆری لێ ناوە. وێـنەی ئەورەحمـان پاشـایان لە ریـزی پیاوە گەورەکانی ئەو سەردەمەدا لە سەر یەکێ لە دیوارەکانی ناو "کاخی نیگارستان" کێشـاوە. مەحمـود بەگ (دواتر مەحمـود پاشـا) ی کـوڕی بە بـارمتە لە ئێـران گـل دراوەتەوە. شـا فەرمـانی داوە بە ئەمـانوڵا خـانی

ئەردەڵان والیی کوردستان هاوکاری سپایی پاشای بابان بکا بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە سەر دەسەڵات لە میرایەتی بابان دا. شەڕێکی خوێناوی لە مەریوان لە نێوان لەشکری عوسمانی لە لایەک و هێزی هاوبەشی بابان و ئەردەڵان دا لە لاکەی تر قەوماوە. ئەورەحمان پاشا شەڕەکەی بردۆتەوە. سەرکردەی هێزی عوسمانی بە دیل گرتوە. بەڵام چەند کەس لە برا و کەسە نزیکەکانی لەو شەڕەدا کوژراون.

حاجی مەلا خالید دانیشتوی شاری سلێمانی بوە. لە نزیکەوە شایەتی ئەم روداوانە بوە. "مەرسیە" ی بۆ کوژراوەکانی شەڕەکە داناوە. شەهید کە لە ئیسلام دا تێگەیشتنێکی دیاریکراوی - دینیی هەیە. مەلا خالید شەڕکەرانی بابانی بە "شێری بێشەی مەردی" و "مەردانـی حەق" و کوژراوەکـانی، کە لە شەڕ دا دژی هێزی بەغداد کە بەشێ بون لە هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی، بە "شەهید" داناوە. مەلایەکی سوننی کوژراوی شەڕی دژی خەلیفەی ئیسلام بە شەهید دابنێ فتوایەکی ئاسان نەبوە. شارەزاییەکی زۆری ویستوە لە فیقهی ئیسلام و ئازایەتیەکی زۆری ویستوە لە بەردەم خەڵک دا.

دوای شەڕی مەریوان ئەورەحمان پاشا کاروباری میرایەتی بۆ جاری چەندەم گرتۆتەوە دەست. زۆری نەخایاندوە دیسان نێوانی لە گەڵ والیی بەغداد تێک چۆتەوە. دیسان لەشکری کراوەتە سەر، ئەمیش دیسان خۆی ساز داوە بۆ بەرگری. حاجی مەلا خالید پشتیوانیی لە ئەورەحمان پاشا و هێزی بابان کردوە. ئەورەحمان پاشا ئامادەکاریی کردوە بۆ شەڕ. مەلا خالید ئەم "قیتعە" شیعرەی لە ستایشی خۆی و تۆپەکانی دا هەڵبەستوە، ئەورەحمان پاشای بە شێر و تۆپەکانی بە هەژدیها چواندوە و، مێژوەکەیشی بە حسابی ئەبجەد تۆمار کردوە، ئەڵێ:

عبد رحمان، شیر میدان، شاه گردون جاودان
با عموم شهرتش مهر است مانند سها
طوب اژدرواررا چون بر عرادە تکیه داد
پاره شد خمپارەوش قلب عدو زین اعتنا
حسب حال خصم ملهم گشت تاریخش بدل
"دشمن بد چون رهد از شیر یا از اژدها: ۱۲۲۳"

عبد رحمان، شیر میدان، شاه گردون جاودان
با عموم شهرتش مهر است مانند سها
طوب اژدرواررا چون بر عرادە تکیه داد
پاره شد خمپارەوش قلب عدو زین اعتنا
حسب حال خصم ملهم گشت تاریخش بدل
"دشمن بد چون رهد از شیر یا از اژدها: ۱۲۲۳"

بە پێچەوانەی پێشبینیەکەی حاجی مەلا خالیدەوە "دوژمنی بەد" بە سەر "شێر" ەکە و "هەژدیها" کەدا زاڵ بوە. ئەورەحمان پاشا لەو شەڕەدا شکاوە. بۆ یەکێ لە کوژراوەکانی ئەم شەڕەش "مەرسیە" ی داناوە و، بە حسابی ئەبجەد مێژوەکەی تۆمار کردوە.

ئەورەحمان پاشا کە بە یارمەتی ئێران گەڕاوەتەوە سەر دەسەڵاتی بابان پاش ماوەیەک پەیوەندییەکانی لە گەڵیان تێکچوە. ئێران لەشکری هێناوەتە سەری. مەحمود بەگی کوڕی کە دەسبەسەر بوە لای ئێرانییەکان مەترسی کوشتنی لە سەر بوە.

شەڕ قەوماوە. ئەورەحمان پاشا شکاوە. لە بەردەم هێزی ئێرانی دا کشاوەتەوە کۆیە. زیاتر لە مانگێ لە کۆیە گەمارۆیان داوە. سەرەنجام هێزی ئێرانی بە ناچاری گەڕاونەتەوە دواوە.

ساڵی 1224 ک. حاجی مەلا خالید خەریکی کاروباری دینیی مزگەوتەکەی و وتنەوەی دەرس و ئامۆژگاری بوە لە پڕ، لە لایەن شاە عەبدوڵاوە، دەرویشێ لە هندستانەوە پەیدا بوە. لە مزگەوتەکەی ئەم دا نیشتەجێ بوە و ماوەتەوە. لێرەوە ئیتر "سەحرانەوەردی خالید" دەستی پێ کردوە.*(ریاض المشتاقین: 105. اصفى الموارد: 54. الحديقة الندية: 34)*

**پیرەمێرد قەسیدە فارسیەکەی مەلا خالیدی لە ستایشی پێغەمەر دا بەمجۆرە تەرجومەی کوردی کردوە:**

شنۆی نەشئەی نیشانەی شەئنە وا بۆ من لە کۆهسار دێ
لەگەڵ بای بەربەیانا بۆم دەرکەوت کە بۆی یار دێ
هەمو ئێشی دڵی ڕیشم ئەوا بەو خاکە سارێش بو
خودایە، ئەم دەوایە، چون لە بۆی موشکی تاتار دێ؟
بە مانگی یەکشەوەی جەژنی ویسالی دۆست ئەشوبهێنم
لە ڕێما ناوبەناو شوێنی سمێکی پەیکی ڕەهوار دێ
لە جێیێکی ئەدیوی وا کە نازانم چە شوێنێکە
دەمادەم بۆنی خۆشی دڵکەشی دوکانی عەتار دێ
نیشانەی ڕۆژ و شەو گوم بو، جیهان یەکسانە روناکە
ئەمەندە دوابەدوای یەک پرتەوی پرتاوی ئەنوار دێ
بەڵێ ئەم شوێنە جێی جیلوەی یەکێکی وا بلند جێیە
خەیاڵی عەکسی وێنەی، کەی لە دەست تەسویری ئەفکار دێ؟
ئەگەر پێیەک بەسەر خاکا بنێو بڕوا لە شوێن پێی ئەو
هەتا ڕۆژی حەشر لەو خاکە بۆنی خۆشی گوڵزار دێ
ئەگەر تۆزێ لە تۆزی پێی بکاتە چاوی نابینا
ئیتر ئەو چاوە زۆر تیژتر لە چاوی ئەهلی ئەبسار دێ
بە جارێ سەروی ئازاد ئەبنە بەندەی سەروی باڵای ئەو
ئەهەنگانێ کە هەنگاوی خەرامی تەرزی ڕەفتار دێ
تنۆکی سوری فرمێسکم نقێمی مۆری جەمشیدە
لە شەوقی لەعلی ئاڵی ئەو، لە ئاوی چاوی خوێنبار دێ
دڵە وشیار بە! ئاوی پرتەوی حوسنی ئەزەل لێرە
تەجەللی دەم بەدەم بۆ هەمدەمی قەلبێکی وشیار دێ
ئەوەی هیوام ئەبو بێتە خەوم، بۆم هات بە بێداری،
تەماشاکەن چ فەیزێکە لە سایەی بەختی بێدار دێ
ئەرێ ڕازی نیهان تاکەی لەگەڵ بای بەر بەیان خالید
بە کوردی بێنی خاکی ئەحمەدی موختارە جار جار دێ

ئەمینی "لی مع اللە" مەحرەمی ئەسراری "ما اوحی"
هەتا حەزکەی بەرەوژور تر لە قوەی هۆش و پەندار دێ
شەهی تەختی "لعمرک" شاسواری ساحەیی "لولاک"
سروی پڕ دروی تا ئەبەد لای ڕێی دادار دێ
بە پێ ماچکردنی ئەم فەرشە بە سەر عەرشا برەو دێنێ
بە چ ڕوییێکەوە لەم کارە بۆ بێکارە ئینکار دێ
لە ئەیوانی جەلالی ئەو بە شانازی بە هەر لادا
سەدای دورکەوتنەوە، لاچن! لە دەوری دار و دیوار دێ
چە ئەیوانی کە کەمتر پاسەوانی ئاستانی ئەو
ئەگەر بێتو بڵێن شای ڕوی زەمین تۆی ئەو لە لای عار دێ
لە بەر پێی پایەیا شانازی فیکرەت تا کەناری عەرش
کە ناگاتە مەرام ماندو ئەبێ خوێنی لە مینقار دێ
ئەگەر لەم ڕێیەدا چقڵی عینادان هەڵ چەقێتە پێم
چە باکمە! گوڵ وەچن دڕکی گوڵی کەی لا بە ئازار دێ
ئەگەر دەستم کەوێ تایێ لە تاری تورەیی موی ئەو
ئیتر هەرگیز لە لای من کەی خەیاڵی مشکی تاتار دێ
چە شاهێکە کەوا نابێتە ڕوشتەی وەسفی ئەو هەر چەند
لە گەنجی عەرشی ئەعزەم گەرچی هەرجێ دوڕی شەهوار دێ
سەنای ئەو لای خیرەد هێند قورسە بۆی نایەتە جێ هەرگیز
پەنا بەخوا چ کاری وا لەدەست ئەفکاری ئەفکار دێ
ئەگونجێ چەرخ بچێتە دانەیی خاشخاشەوە ئەمما
لە کوێ مەدحی لە قوەی ڕشتەی تەقریر و گوفتار دێ
کەسێ هەردوجیهان شاباشی ئەو بو بێ بە سەربەرزی
ئیتر دەربارەی ئەو زاتە چۆن تەعبیری سەردار دێ
لە ئەسراری دەرونی. جوبرەئیل داماوە نازانێ
ئەگەر بۆ شەققی سەدری سافی ئەو لای خواوە سەد جار دێ
ئەوەند ڕێی دوری کەعبە تەی مەکە حاجی بە بێهودە
کە بەیتوڵلا ئەوا خۆی بۆ تەوافی قەلبی دڵدار دێ
کەریمێکە لە سایەی ئەو. وجودی "فائز الجود" ە
لە دەریا دوڕ. لە بەرد گەوهەر دەربێت و گوڵ لە ناو خار دێ
دەمادەم لێوی غونچەی پێکەنینی دێتە دەم گاهێ
لە حوسنی خولقی ئەو بایێ. شنوێکی لە گوڵزار دێ
ئەگەر مەیلێکی ئەو ڕو بکاتە تۆ ئەتوانی ڕستگار بی
کە لەم گەردن فرازانە لە ڕۆژێک نالەیی زار دێ
لە تاوانا دولەت بو مانگ. کە ئەو ئەنگوستی بۆ ڕاهێشت.
لە فەیزی ئاوی دەستنوێژی لە دەشتا دەنگی روبار دێ
بە سەودای موی سەری هەودای تەشبیهم لە دەست دەرچو

بە نەعتی کەی کەمالی حوسنی! تا ئەشعار و ئەشعار دێ
لە راستی نافەرینی نافەرین بادی هەوایێکە
مەگەر گیان نافەرین هەر خۆی لە عەهدی نافەرین کار دێ
ئەوەک هەر ناسکی سەحرایی کەوا هاتە زوبان بۆ ئەو
لە سنگی سەنگەوە بۆ موعجیزاتی بانگی ئیقرار دێ
بە چاوقوچاندنێک چو هاتەوە لەو رێگە دورەی وا
لەلای پەیکی خیرەد لێکدانەوەی ئەو رێیە دیشوار دێ
فریشتەی ئاسمان تا سیدرە ریزیان بەست لە سەر رێیدا
بە خۆشی خۆشی مزگێنییان ئەدا تەشریفی موختار دێ
لە راستی موشتەری، خورشیدی روی تیشکێکی خۆی دەرخا
مەهی کەنعان بە نەقدی گیانی، بۆ بازاری بازار دێ
لە دەردی دوریا دار هاتە نالە و تۆ کەچی نامری
ئەگەر تۆ مەردی ناچار لەم ژیانەی دوای ئەوت عار دێ
بەبێ نیسبەت ئەشوبهێنن قەد و روی ئەو بە سەرو و گوڵ
ئەوی ئەربابی زەوق و نەزمە ئەم نەزمەی لە لا خوار دێ
بڵێ رۆژ پرتەوێکی روی ئەوە رونـاکی ئەنوێنێ
بڵێ گوڵ ئارەقی روی ئەو تنۆکێکی لە روخسار دێ
تەجەللی ئەو بو، کەوتە سەر درەختی وادیی ئەیمەن
بەچاو لێکەرییە موسا وا لە تورا خواستی دیدار دێ
غروری قەدری ئەو بو بایەزیدی نارده سەر دۆزەخ
لە دەم مەنسورە وە بانگی ئەنالحەق وا لە سەردار دێ
ئەمە واتەی بە فائیدەو کورتە لام بۆ هێزی بازوی ئەو
لە پەردەی قولە فەقیانەی ئەوا بە دەستی قەهار دێ
لە دەست دەستی سەخای ئەو هەور ئەگەر بگری و بگرمێنێ
کەفی دەستی لە جودا سەد هەزار گاڵتەی بە روبار دێ
لە بیری ئەو ئەگەر بەر قەترەێکی بەر کەوێ جاری
لە وشکیدا بە وشکی قولزومو دەریایی زەخار دێ
لە تۆی ئەو سینگە پاکە ئەو بەزاخاوی "الم نشرح"
وەکو کانی گوهەر، یا زیو و زەڕ گەنجینە ئەسرار دێ
ئەگەر پشتیان بەوە قاییم نەبێ ئەو پێشەوایانە
لە مەحشەردا هەمو پێغەمبەران ترسیان لە سەر بار دێ
بەوە ناموسی ئەکبەر، ئەکبەرە! غاشیەی ئەوی هەڵگرت
بەسەر خێڵی فریشتەیشا بەڵێ بەم نیکتە سالار دێ
گەلێ لەم پایەیە بالاترە و وەسفی بەلام چی بکەم؟
ئەگەر زیاتر بڵێم بۆ نائەهل، سەر مایەی ئینکار دێ
لە بەزمی قودسیان دا کاتێ تەعریفی بەشەر دەکرێ
لەپێشانا موهاجیر، دوای ئەوان تەوسیفی ئەنسار دێ

لە بێشەی شێری دوشمن شکێنی و مەردی و ئازایی
کە بدوێین شێمەیی پێغەمبەرە نەعتی بە تۆمار دێ
لە بەخشین دا بڵێ شەرمەندەییت بۆ مایەوە حاتەم!!
کە کاتێ ناوی ئەو گەردنفرازانە بە گوفتار دێ
ئەوەک وەک پێشڕەوی ئازادەکان سەر دەفتەری ئیمان
کە ناوی هاتە ناو سەر قافڵەی دەستەی کەرەمکار دێ
سەدیقی سەروەر و سدیقی ئەکبەر بوی لە قورئان دا
سەنای "ثانی اثنین" از "هما فی الغار" لە دادار دێ
فریشتە کۆنەپۆشی حورمەتی خەرقەی شڕی ئەو بوون
بەوە موژدەی ڕەزای خوایی لە شەئنی ئەو سزاوار دێ
دەمی ماری بە پێی خۆی بەست مەبادا ژاری بۆ یار بێ
مەپەندار! یاری یاری وا لە دەست هەر تیرەیی یار دێ
مەگەر کیشوەرستێنی تاجبەخشێ خەرقەپەشمینێ
کە عەدل و عەزم و ڕەزم و جەزمی وا تەنها لە قەهار دێ
لە دەست ئەو ڕا دەکەن دێو میسلی مێشولە بەدەم باوە
ئەمە لەو دێ!! ئەگینە کردەوەی وا چۆن لە دەیار دێ
لە عیلم و حیلم و عەقڵ و فەزڵ و عیرفان و کەمالاتی
عەقڵ سەر گەشتەیە گەردوخولی زۆرتر لە پەرگار دێ
لە هەردو سەر کەوا هەردو سەرا سەریان لە ڕێ دایە
دەلیلی بەختیاری دیارە هەر بۆ یاری موختار دێ
ئیتر تۆ داستانی ڕۆستەمی دەستان لە ناو دەرکە
لە کۆڕێکا کە ناوی پەیکەری پەیکاری کەرار دێ
ئەگەر جێی ڕەوگە ئاسکی ئاوکی موشکین نیە بۆچی؟
لە خاکی پاکی ڕێگەی بۆنی خۆشی میسکی تاتار دێ
لە تۆی ئەم خاکەدا هێندە شەهیدی عەشقی نێژراوە
وەکو لالە بە خوێنی سورەوە جەرگی بریندار دێ
لە جێی تورڕەی خەتی میشکی، خەتا ویستن خەتایێکە
کە ئەم دەرمانی مانە بۆ نەخۆش و ئەو بە ئازار دێ
کەمێکی جەزبەی عیشقی پزیشکێکە ئەسوتێنێ
نیاز بۆ بێدڵانە و ناز هەمو کاتێ لە دڵدار دێ
حەکیم، دڵ کوێر بو وا مەعنای نەزانی بو بە سەهوا چو
کە ئەم واسیتەیا، لای ئەو لە دەوری چەرخی دەووار دێ.

*(ڕۆحی مەولانا: 69)*

## -3-

## خالیدی سەحرانەوەرد (1224 - 1226 ک)

حاجی مەلا خالید ماوەیەکی درێژ لە چاوەڕوانی دا نەماوەتەوە تا ئەو پەیامەی پێ بگات کە لە حیجاز لە کابرای یەمەنی بیست بوی. هێشتا دو ساڵ تێ نە پەڕی بو بە سەر گەڕانەوەی دا لە حەج. ساڵی 1224 ک کابرایەک لە هیندستانەوە گەیشتۆتە سلێمانی بە ناوی دەروێش محەمەدەوە بۆ گەیاندنی پەیامی پیرەکەی بە خالید. *(ریاض المشتاقین: 95)*

هەڵبژاردنی خالید لە ناو هەمو مەلاکانی کوردستان دا، بە تایبەتی لە ناو مەلاکانی سلێمانی دا، لە لایەن دەروێش محەمەدەوە ڕێکەوت نەبوە. بەڵکو لە ئاگاداری و شارەزاییەکی پێشوەوە بوە. پیری تەریقەتی نەقشبەندی، شاه عەبدوڵا غولامعەلی (1158 - 1240 ک)، کە خۆی نیشتەجێی هیندستان بوە، لە ناو وڵاتانی ئیسلامی دا، بە تایبەتی لە ناو وڵاتانی سوننەنشین دا، تۆڕێکی فراوانی پەیوەندی لە باوەڕپێکراو، خەلیفە و مورید و مەنسوب هەبوە. دور نیە کابرای یەمەنی و پیاوچاکەکەی ناو کەعبە کە خالیدیان ئاڕاستە کردوە بۆ دۆزینەوەی "مورشیدی کامیل" بچێتە هیندستان و، دەروێش محەمەدی تایەن، کە بە دوای خالیدا هاتۆتە سلێمانی، بەشێ بوبن لەو تۆڕە.

دەروێش محەمەد، ماوەی چەند لە سلێمانی ماوەتەوە، باس و گفتوگۆی لە سەر چی لە گەڵ حاجی مەلا خالید کردوە، وا بە خێرایی قانیعی کردوە، لە گەڵ ئەو ڕێگەی هیندستان بگرێ بە نیازی گەیشتن بە شاه عەبدوڵا، بە نەزانراوی ماوەتەوە. خالید کاتێ کەوتۆتە "سەحرانەوەردی" خۆی نەداوەتە دەست ڕێکەوت، وێڵ و بێ مەبەستی دیاریکراو نەبوە، زانیویەتی بۆ کوێ ئەچێ و بۆ لای کێ ئەچێ و بۆ چی ئەچێ. بەڵام ڕەنگە نەی زانی بێ ئەنجامەکەی چی ئەبێ.

لەو قەسیدەیەدا کە لە مەشهەد بۆ ئیمام ڕەزای داناوە، ئاماژەیەکی لەو بارەیەوە کردوە، ئەڵێ:

پیکی فرست بهر من بینوا به هند
سوی کسی که خاک درش مسک انفر است

لەو قەسیدەیەیش دا کە لە ماڵئاوایی ئارامگای ئیمام ڕەزا دا دای ناوە، ڕونتر ئاڕاستەی ڕێگەکەی و دوامەنزڵی سەفەرەکەی باس ئەکا و، بە ئاشکرا دان بەوەدا ئەنێ، کە گرێی کارەکەی لە شام و مەکە نەکراوەتەوە، بۆیە لە خاکی قەندەهار و هیرات تێ ئەپەڕێ ڕو ئەکاتە جام، سەرەنجام خۆی ئەخاتە بەرخاکی پێی غولامعەلی، واتە شاه عەبدوڵای دیهلەوی، پیری تەریقەتی نەقشبەندی، ئەڵێ:

خالد بیا و عزم سفر زین مقام کن
بر روضه رضا بدل و جان سلام کن
از گفتگوی خام روافض دلم گرفت
بر بندوبار قطع سخنهای خام کن
بدعت سرای طوس نه جای اقامت است
برخیز و روی دل بدر پیر جام کن
از خاک قندهار و هرات نیز درگذر
مقصود دل چو خاص بود ترک عام کن
در شام و مکاک گره از کار وا نشد
من بعد صبح راه بره هند و شام کن
خودرا بخاکپای غلام علی فگن
محو هوای روضه دارالسلام کن
در کار خواجگی همه عمرت بباد رفت
خودرا دمی بخدمت ان شه غلام کن
خالد چو هیچکس بسخن مرد ره نشد
بگذر ز هر چه هست و سخن را تمام کن

*(ڕۆحی مەولانا: 34.*
*پیرەمێرد لە تەرجومەی کوردی ئەم شیعرەدا مەبەستی بە دەستەوە نەداوە)*

هەواڵی سەفەری خالید لە سلێمانی بڵاو بۆتەوە. دیارە خۆیشی پێشتر زەمینەی بڵاوبونەوەی هەواڵەکەی ساز کردوە. خالید، وەکو خۆی لە قەسیدە عەرەبیەکەی دا باسی کردوە، کەسوکار، دۆست و ناسیاو، مەلا و زانا ئاینیەکان، لە گەڵی خەریک بون لەم سەفەرە پەشیمانی بکەنەوە. بەڵام ئەو گوێی نەداوەتە ئەو ئامۆژگاریانە بڕیاری کۆتایی داوە ئەم سەفەرە، کە لەوانە بو سەفەری هات و نەهات بێ، ئەنجام بدا. لە گەڵ دەروێش محەمەدی هیندی و حاجی عەبدورەحمانی سلێمانی، بە ڕێ کەوتوە. سەفەرەکەی خالید سەفەری کابرایەکی "سەیاح" نەبوە، بەڵکو سەفەرێکی بەرنامەدار بوە. لەم سەفەرەدا چەند کارێکی کردوە:

**یەکەم: ناسین و خۆناساندن**

خالید شێوازێکی تایبەتی هەبوە لە کارەکەی دا. چۆتە هەر شارێ نە چۆتە دیوانی فەرمی فەرمانڕەواکان، بە دوای کاربەدەستی شارەکە و دەسەڵاتدارانی ناوچەکەدا نە گەڕاوە، بەڵکو چۆتە مزگەوت و مەدرەسە و ناوەندەکانی زانستی دینی. پرسیاری زاناکانی ئەوێی کردوە و هەوڵی داوە بچێتە لایان، ناسیاوی یان لە گەڵ پەیدا بکا و، "گفتوگۆی فکری" یان لە گەڵ دابمەزرێنێ. زمانی داخافتن هیچ کۆسپێکی دروست نە کردوە، چونکە لەو سەردەمەدا، زمانی فارسی لە سەرانسەری ناوچەکەدا زمانی باوی نوسین و گفتوگۆ بوە. بۆ ڕونکردنەوەی شێوازی کارکردنی خالید بۆ "ناسین و خۆناساندن" ی لێرەدا دو لە چیرۆکەکانی سەفەرەکەی ئەگێڕینەوە:

**چیرۆکی یەکەم،**

ئەگێڕنەوە لە یەکێ لە شارەکانی خوراسان چۆتە ناو کۆمەڵێ خەڵکەوە. لێی پرسیون، ئاخۆ لە شارەکەیان دا کەسانی عالم و فازیل هەیە کە عیلم یا سەلاحیان هەبێ تا ئەم قسەیان لە گەڵ بکا. بە ستایشەوە ناوی کەسێکیان هێناوە. مەلا خالید لە دەروێش محەمەدی هاوڕێی پرسیوە بچن بۆ سەردانی یا نە؟ دەروێش لە ترسی ئەوەی ئەوەکو بکەوێتە ژێر کاریگەریی یەکێکەوە پەشیمانی بکاتەوە لە سەفەرەکەی وتویەتی:

"تۆ کە پاشای کیشوەری عیلم و مەعریفەتی چە پێویستت بەوە هەیە لە گەڵ گەدایەکی بێ سەروپا قسە بکەی؟"

خالید لە ناو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا لە گەنجێک ئەپرسێ:

"تۆ ئەڵێی چی؟"

گەنجەکە لە وەڵام دا وتویەتی:

"تۆ کە دڵت ئاوێنەی ئەنواری غەیبە، بەم هەمو فەزڵەوە ئەگەر بچیتە لای کەسێکی لە خۆت کەمتر چە عەیب و نوقسانیەکی تێدایە!"

خالید قسەی گەنجەکەی بە لاوە پەسەند ئەبێ. بە دەروێشی هاوڕێی ئەڵێ:

"ئەبو تۆ ئەو قسەیەت بکردایە کە ئەو کردی!"

*(ریاض المشتاقین: 100)*

**چیرۆکی دوەم،**

کابرایەکی هیراتی، کە بە قسەی ئەو خالید لە چونی بۆ هیندستان و لە گەڕانەوەی دا لە شاری هیرات لە ماڵەکەی ئەودا ماوەتەوە، گێڕاویەتیەوە:

"زاناکانی هیرات کردویانە بە عادەت هەمو ڕۆژێ لە "مەسجیدی جامیع" کۆبونەتەوە، کۆڕی گفتوگۆی بابەتە دینیەکانیان بەستوە و، هەرجارەی یەکێکیان باسێکی زانستی یا هونەری دامەزراندوە و کردویانەتە بابەتی گفتوگۆ. کاتێ خالید گەیشتۆتە شاری هیرات چۆتە کۆڕەکەیانەوە. لە ناو ئەوان دا ئەم تازە بوە.

لێیان پرسیوە: "لە کوێوە هاتوە و چ کارەیە؟"

خالید وتویەتی: "غەریبێکم لە دیاری عیراقی ڕۆمەوە، بە دوای ڕزقی مەقسوم دا، هاتومەتە ئەم مەرزوبومە."

لێیان پرسیوە: "لە عیلم هیچ بەهرەیەکت هەیە؟"

وتویەتی: "کەم و زۆر".

لێیان پرسیوە: "لە چ هونەرێ بەهرەی تەواوت هەیە؟"

وتویەتی: "لە هەر هونەرێ بە ئەندازەی توانا".

لێیان پرسیوە: "لە نحو، صرف، معانی و بیان ئەزانی؟"

وتویەتی: "بەڵێ کەمێ".

لێیان پرسیوە: "لە منطق و اداب و کلام و حکمت؟"

وتویەتی: "بەڵێ کەمێ".

لێیان پرسیوە: "لە اصولی فقه، اصولی دین؟"

وتویەتی: "کەمتر"

لێیان پرسیوە: "لە حساب و هیئات و علومی ریاضی؟"

وتویەتی: "ئەختێ"..

سەیریان کردوە ئەم کابرایە لە هەمو زانست و هونەرە ئیسلامیەکان دا شتێ ئەزانێ. بە زانایی و شارەزاییەکەی سەرسام بون. بەڕێز و خۆشیەوە ڕێگەیان داوە بەشداری کاری کۆڕی گفتوگۆکانیان بێ. دواییش بە ڕۆیشتنی لە شارەکەیان دڵگران بون. *(ریاض المشتاقین: 104)*

**دوەم: دەربڕینی ناڵەی دەرونی بە دانانی شیعر**

خالید یادداشتی ڕۆژانەی سەفەرەکەی بە جێ نە هێشتوە. بەڵام بە درێژایی ڕێگاکەی گەیشتۆتە هەر مەنزڵێ سەردانی ئارامگای سۆفیە گەورەکانی کردوە و. بە بۆنەی هەندێکیانەوە قەسیدەی درێژی هەڵبەستوە و موناجاتی هۆنیوەتەوە. هەست و ئەستی خۆی دەربڕیوە. ئەو چەپکە شیعرەی بە جێ هێشتوە کە ئەشێ لە دیوانەکەی دا وەکو شیعری "سەحرانەوەردی" ی پۆلێن بکرێن. لە کۆتایی یەکێ لەو شیعرانەی دا. خۆی وتویەتی:

ئەی خالید!
ئەگەر تۆ دێوانە و سەحرانەوەرد نیت،
تۆ لە کوێ و کابول و غەزنەین و خاکی قەندەهار؟

لە ئازەربایجان سەردانی گڵکۆی بایەزیدی بوستامی کردوە. بەو بۆنەیەوە "موناجات" ێکی داناوە، ئەڵێ:

یـا رب! بە حـق تربـت سـلطان بایزیـد
یـــا رب بە قاطعیـــت برهـــان بایزیـــد

*(رۆحی مەولانا: 13)*

لە مەشهەد لە ستایشی بارەگای ئیمام رەزا دا قەسیدەیەکی درێژی داناوە، بەمجۆرە دەستی پێ کردوە:

این بارگاه کیست کە از عرش برتـر اسـت
و ز نـور گنبـدش هـمە عـالم منـور اسـت

*(رۆحی مەولانا: 50.*
*تەرجومەی کوردی قەسیدەکە لە کۆتایی باسەکەدا نوسراوەتەوە)*

مەشهەدی بە جێ هێشتوە بەرەو جام، لە ماڵئاوایی ئارامگای ئیمام رەزا دا وتویەتی:

خالـد بیـا و عـزم سـفر زیـن مقـام کـن
بر روضەی رضـا بە دل و جـان سـلام کـن

لە شاری جام سەردانی گڵکۆی شێخ ئەحمەدی جامی کـردوە، ئینجـا چـۆتە هیـرات، غەزنەیـن، کـابول، قەندەهار. رەنگە گەشتەکەی لەو ناوچانەدا ڕێکەوتـی ڕۆژی جەژنـی کـرد بـێ، یـادی نیشـتمان و دۆسـتەکانی هەستی ئاوارەیی تێ دا بزواندوە. باسی سـەرچنار و بەکرەجـۆ ئەکـا، کە دو سـەیرانگای سـەوز و نـاوداری سلێمانی بون. یەکێ لە شیعرە "ویجدانی" یەکانی بەو بۆنەیەوە هۆنیوەتەوە، وتویەتی:

موسـم عیـد اسـت مـا و نومیـد از دیـدار یـار
عالمی در عیش و نوش و مـا دو چشـم اشـکبار
هرکسی با یار در گشـت گلسـتان اسـت و مـن
ز اشک سرخم شد کنـار از داغ هجـران لالەزار

جـان نثـار مقـدم جانـان نکـرده دم بـدم
چیسـت بهـره از تفرجهـای تخـت جـان نثـار
بـی نـوا و دل پـر از خـار و غریـب و دردمنـد
دست بر دل، سر بزانو، چشـم در ره، دل فگـار
سینه سوزان، دل فروزان، کوچه کـوچه در بـدر
کـس مبـادا همچـو مـن اواره از یـار و دیـار
بکرەجویی شد زهـر چشـمم روان از خـون دل
عاقبـت کـردم دوا داغ فـراق سـرچنار
خالـدا گـر نیسـتی دیـوانه و صـحرانورد
تـو کجـا و کابـل و غـزنین و خـاک قنـدهار

*(رۆحی مەولانا: 16.*
*تەرجومەی کوردی شیعرەکە لە کۆتایی باسەکەدا نوسراوەتەوە)*

دوای ئەفغانسـتان، سـەردانی خوێنـدنگە دینیەکـانی شـارەکانی لاهـور و پیشـاوەری کـردوە و، ڕۆیشـتۆتە ناوچەی پەنجاب. لە نزیک پنجاب چۆتە سەردانی گڵکۆی ئەبو عەلی شەرەف، یەکێکـی تـر لە رەمزەکـانی تەسـەوف. بە شیعرێ ئەویشی بە سەر کردۆتەوە، ئومێدی لێ کردوە "شفاعەت" ی بۆ بکا لای شاە عەبدوڵا. وتویەتی:

از روم تـا به هنـد گـرفتیم جـان به کـف
بهـر نثـار مرقـد شـه بـوعلی شـرف
بـر وی قسـم بجـان عزیـز مبـارکش
کانـدر وفـاش کـرد جـوانی خـود تلـف
هسـت ایـن غلامـرا بـدرش حـاجتی عظیم
لطفـی کننـد بـاز رهـاننش از اسـف
باشـد در اسـتانش امیـد شـفاعتی
در حضرتی که هند ازو یافـت صـد شـرف

در چشـم اهـل دیـده مسـماش همچـو اسـم
ایینەایسـت عکـس نمـای شـه نجـف
خالد خموش، هرچه تو گـویی بطـرز شـعر
بـی دولتـان مبـالغه داننـدش و صـلف

*(رۆحی مەولانا: 27)*

**سێیەم: گەیشتن بە مەبەست**

حاجی مەلا خالید تا گەیشتۆتە جیهانئابادی دیهلی، کە دوا قۆناغی سەفەرەکەی بوە، چەند مانگێکی پـێ چـوە. بە وڵاتانی ئێران، خوراسان، ئەفغانستان، پاکستانی ئێسـتا، هیندسـتان، دا تێپەڕیـوە. لە شـار و ناوچەکـانی: تـاران، خەرقان، سەمنان، نیشاپور، بوستام، توس، مەشهەد، جـام، هێـرات، قەنـدەهار، کـابول، پیشـاوەر، لاهـور... لای داوە و ماوەتەوە. سەردانی مزگەوت و ئارامگا و گڵکۆی پیاوچاکان و داوەندەکانی زانستی کردوە. *(الحديقة الندية: 34)*

ئەو زەمانەی حاجی مەلا خالید گەیشتۆتە هیندستان، هیندستان لە ژێر دەسەڵاتی "کۆمپانیای هیندی شەرقی" دا بوە. بەشێ بوە لە کۆلۆنیەکانی بریتانیا. گەلانی هندستان، لەوانە گەلە موسوڵمانەکانی، لە ژێر دەستی ئینگلیز دا بون. دەزگای بەڕێوەبەرایەتی جیاواز بوە لە دەزگای بەڕێوەبەرایەتی عوسمانی و قاجاری. یەکێ لەو شتانەی ئینگلیز برد بویە ئەو وڵاتەوە چاپخانە بوە. شارەکانی کەلکەتە و بەمبای و لەکنەو چاپخانەی گەورەیان تێدا دامەزرێنراوە. هەندێ لە کتێبە گرنگەکانی زمان و ئەدەبی فارسی لەو چاپخانانە دا چاپ کراون، لەوانە: شاهنامەی فیردەوسی، دیوانی حافز، گولستان و بوستانی سەعدی، هەندێ لە دانراوەکانی جامی. هەروەها چەند ڕۆژنامەیەک بە دو زمانی فارسی و ئینگلیزی دەرچون. یەکەم ڕۆژنامە بە زمانی فارسی لە هیندستان دەرچوە، نەک لە ئێران. دەسەڵاتی بریتانی هەوڵی داوە زمانی ئینگلیزی ببێتە جێگرەوەی زمانی فارسی، بە تایبەتی لە کاروباری دیوانی و فەرمیی حکومەت دا.

بە پێی نامەیەک، کە دوای حەوت مانگ لە مانەوەی لە خانەقاکەی شاە عەبدوڵا، بۆ یەکێ لە نزیکەکانی خۆی لە سلێمانی نوسیوە، ڕۆژی 26 ی زیلحەجەی 1224 ی کۆچی، گەیشتۆتە دوایین مەنزڵی سەفەرەکەی. (*نامە: 29*) کە وەکو خۆی لە قەسیدە عەرەبیەکەی دا ناوی ناوە "کەعبەی ئامال". واتە بەر دەم خانەقاکەی شاە عەبدوڵا، لە شاری دیهلی.

سەرەتای نامەکەی بەم چوارینەیە دەس پێ ئەکا:

واله‌ء شـــوق جمـــال دوســـتان
بـی نصـیب از گشـت بـاغ و بوسـتان
بنـــدهء وامنـــده از وصـــل حبیـــب
خالـــد درمانـــده در هندوســـتان

خالید بە بۆنەی گەیشتنیەوە بە دوا مەنزڵی سەفەرەکەی و، لەپێناوی گەیشتن دا بە دیداری ئەو پیرەی ئەم لە کوردستانەوە ئەو ڕێگا دورە پڕ مەترسیەی پێواوە، دو قەسیدەی درێژی داناوە. هەردو قەسیدەی ناردوە بۆ شاە عەبدوڵا. قەسیدەیەکیان بە فارسی و قەسیدەیەکیان بە عەرەبی.

قەسیدە فارسیەکەی بەم جۆرە دەس پێ ئەکا:

دهید از من خبر ان شاه خوبانرا به پنهانی
که عالم زنده شد بار دیگر از ابر نیسانی
صف نظارەگان در انتظارش چشم در راهند
پری رویان همه جمعند و مطرب در غزل خوانی

لە بەشێکی تری قەسیدەکەی دا ئەڵێ:

بسی توبیخ کردند اهل توران و خراسانم
بدار الکفر رفتن چون پسندی گر مسلمانی
بدهلی ظلمت کفر است گفتند و بدل گفتم
بظلمت رو اگر در جستجوی اب حیوانی

لە کۆتایی قەسیدەکەی دا نوسیویەتی:

تمنـــــای قبـــــولش دارم و دانـــــم کە نـــــاأهلم
مـــدد یـــا روح شـــاه نقشـــبند و غـــوث گیلانـــی
سگم، از سگ بسی کمتر تو نجم الدین صفت جانـا
ببین سـگ بنگـر از روی کـرم زانسـان کە میـدانی
گریـزان از نهیـب بـاز نفسـم صـعوه سـان سـویت
زهـی دولـت بلطـف ایـن صـعوەرا گـر بـاز گردانـی
بخـود کـن اشـنا چـون کـردیم از خـویش بیگـانه
عطـای احمـدی فرمـا چـو مـا کـردیم سـلمانی
بدانسان مظهـری شـد جـان پاکـت جـان جانـان را
بچشـم اهـل بیـنش ایـن زمـان خـود جـان جانـانی
ز جـام فـیض خـود کـن خالـد درمانـدەرا سـیراب
کە او لب تشـنهء تـیە اسـت و تـو دریـای احسـانی

*(ڕۆحی مەولانا: 75.*
*تەرجومەی کوردی قەسیدەکە لە کۆتایی باسەکەدا نوسراوەتەوە.)*

قەسیدە عەرەبیەکەی بەم بەیتە دەس پێ ئەکا:

کملـــت مســـافة کعبـــة الامـــال
حمـــدا لمـــن قـــد مـــن بالاکمـــال
دیـــــدەنی شـــــاە عەبـــــدولا

لە سەر دیداری خالید و شاە عەبدولا و مانەوەی ئەو ساڵەی خەریکی سلوک بوە، زانیاریەکی ئەوتۆ بە دەسـتەوە نـیە، جـگە لە هەنـدێ چیرۆکـی کە نوسـەرانی بیـۆگرافیەکەی بە دوای یەک دا گێراویـانەتەوە و، هەندێکیشی زۆرتـر لە دروسـتکراو ئەچـن تـا ڕوداو. یەکـێ لەو چیرۆکـانەی کە گێڕاویـانەتەوە و، ڕەنـگە لە ڕاستیەوە نزیکتر بێ، ئەمەیە:

"بۆ ئەوەی لە گەڵ خەڵکی ئاسایی هیچ جیـاوازیەکی نەبـێ و ڕەفتـاری تـایبەتی لە گەڵ نەکـرێ خالید داوای لە پیرەکەی کردوە:

**یەکەم**، نازناوی مەلایەتی لە سەر هەڵبگرێ و، وەکو هەر کەسـێکی ئاسـایی بە نـاوی خالیـدەوە بانگی بکا و لە گەڵی بدوێ.

**دوەم**، لە خواردن و نوستن و ژیانی ناو خانەقادا وەکو خانەکانی تری خانەقا ڕەفتاری لە گەڵ بکرێ.

**سێیەم**، پاککردنەوەی ئاودەستەکانی خانەقای پێ بسپێرێ."

پیرەکەی داوای یەکەم و دوەمی لێ قوبوڵ کـردوە، بەڵام لە بـاتی پـاککردنەوەی ئاودەسـتەکان، ئەرکـی ئاوکێشان "سەقایی" ی خانەقای پێ سپاردوە. *(ریاض المشتاقین: 114)* خالیـد مـاوەی پێـنج مانـگ بە سـەری ڕوت و بە پێی پەتی ئاوی کێشاوە. هەمو ڕۆژێ لە بەیانیەوە تا ئێوارە چەند جـارێ چـۆتە سـەر ئەو بیـرەی ئاوی لێ هەڵێنجاوە. بۆ ئەوەی ئەم ئازار بدەن و گاڵتەی پێ بکەن هەمو ڕۆژ دەوری بیرەکەیان پـیس کـردوە،

ئەمیش، بێ ئەوەی هیچ بڵێ، دەوری بیرەکەی پاک کردۆتەوە و خەریکی کارەکەی خۆی بوە. هەمو ڕۆژێ بایی پڕکردنی چل گۆزەی گەورەی خانەقا ئاوی کێشاوە و حەوشەی خانەقاشی ئاوپشێن کردوە. ئەگەرچی شان و ملی هەموی بوە بە برین بەڵام نە بۆڵاندویەتی و نە ناڵاندویەتی و نە گلەیی کردوە، تا ئەو کاتەی پیر داوای دەسلێهەڵگرتنی لێ کردوە. بە دڵێکی خۆشەوە درێژەی بە ئەنجامدانی ئەرکی ڕۆژانەی داوە.

دوای ئەم قۆناغە پیری تەریقەتی نەقشبەندی، شاه عەبدوڵا، ئیتر خالیدی لە سەقایی بەخشیوە و لەوانی تری جیا کردۆتەوە. ماوەی دە مانگ لە "خەڵوەت" دا هێشتویەتیەوە، دەرسی داداوە. نهێنیەکانی تەریقەتی فێر کردوە. پاش ئەوەی هەمو قۆناغەکانی "تەسەوفی" بڕیوە، ئینجا "ئیجازە" ی داوەتێ. شاه عەبدوڵا ئیجازەنامەکەی بە زمانی فارسی بۆ خالیدی نوسیوە. ئەمە دەقەکەیەتی:

**ئیجازەنامەی مەولانا**

"بسم الله الرحمن الرحيم - بعد حمد و صلوات، فقير عبدالله نقشبندى مجددى - عفى عنه - گزارش مى نمايد كه سرامد علماى دين و گزيدهء طالبان راه حق اليقين، حضرت مولانا خالد - سلمه الله تعالى - براى طريقهء نقشبندى از ملک كردستان نزد اين فقير رسيد. تا ده ماه در خلوت ترک به اذكار و اشغال به كمال جد و جهد پرداختند. الحمدلله كه به عنايت الهى - سبحانه - به واسطهء پيران كبار - رحمة الله عليهم - به مدارج طريقه، ترقيات كردند و به حضور و ياداشت و تهذيب لطايف عالم امر فنا و بقا و بيخوديها فايض شدند و انوار سير لطايف عالم خلق و كيفيات و حالاتى كه بر هيأت وحدانى سالک در طريقه حضرت مجدد - رحمة الله عليه - فايض مى شوند، باطن ايشان را منور ساختند و از كمال طريقه به تكميل ان رسيدند.

پس ايشان را به اجازه و خلافت و تربيت طالبان ممتاز فرموديم و در طرق قادريه و چشتيه و سهروردیه و كبرويه - رحمة الله عليهم - نيز مجاز و مأذون ساختيم چنانكه معمول اين طريقه است. دست ايشان دست من است و ايشان نايب و خلف الصدق پيران منند. رضاى ايشان رضاى من و خلاف ايشان خلاف من. به دوام ذكر و توجه و مراقبات و اتباع سنت سنيه و اجتناب از بدعت رويه و صبر و توكل و تسليم و رضا و شغل علوم تفسير و حديث صوفيه و هدايت طالبان مشغول باشند. اللهم اجعله للمتقين اماما وصلى الله على سيدنا محمد و اله و صحبه و سلم."

*(رياض المشتاقين: 129)*

**لە ئەم ئیجازەنامەیەدا ئەشێ چەند تێبینیەک تۆمار بکرێن:**

شاه عەبدوڵا شایەتی بۆ حاجی مەلا خالید داوە:

لە خاکی کوردستانەوە بۆ وەرگرتنی تەریقەتی نەقشبەندی چوە بۆ لای ئەو.

ماوەی دە مانگ لە بەر دەستی ئەودا لە خەلوەت دا سلوکی کردوە. قۆناغەکانی ڕاهاتن و فێربونی نهێنیەکانی تەریقەتی نەقشبەندی، بە پێی تێگەیشتنی خۆیان، لەوانە: خەلوەت، مەداریجی تەریقەت، حضور، یادداشت، تەهزیب، فەنا، بەقا، بیخودی، باتین، بە سەرکەوتویی بڕیوە تا گەیشتۆتە پلەی "کەمال".

هەروەها لەو ماوەیەدا بە ئەندازەیەک شارەزایی لە تەریقەتەکانی: قادری، چەشتی، سوهرەوەردی و کوبرەوی دا، پەیدا کردوە مامۆستاکەی لە هەمو ئەو تەریقەتانەدا "موجاز و مەئزون" ی کردوە.

شاه عەبدوڵا کە گەورەترین پیری تەریقەتی نەقشبەندی ئەو سەردەمە بوە، لە ئیجازەنامەکەدا خالیدی بە "سەرامەدی عولەمای دین و گوزیدەی تالیبانی ڕێگەی حەقولیەقین." ژماردوە و. بە "حەزرەتی مەولانا

خالید"، ناوی بردوە و، وتویەتی "دەستی خالید دەستی ئەوە. ڕەزای خالید ڕەزای ئەوە. خیلافی خالید خیلافی ئەوە."

حەزرەتی مەولانا خالیدی ناناوە بە جێگرەوەی خۆی و جێنشینی ڕاستاڵی پیرەکانی تەریقەتی نەقشبەندی و، دەسەڵاتی ئیجازە، خەلافەت، پەروەردەکردنی خوازیارانی تەریقەتی ناوەتێ. بەوەش ئیتر خالیدی کوردی شارەزوری، لە خەلیفەیەکی خۆجێیی تەریقەتەوە بۆتە پیری تەریقەتی نەقشبەندی لە ئاستی جیهانی ئیسلامی دا، لە سنوری چینەوە تا سەروی ئەفریقا.

لێرەوە ئیتر ئەستێرەی خالید کەوتۆتە درەوشانەوە. لە حاجی مەلا خالیدەوە بۆتە "حەزرەتی مەولانا خالید" و، خۆی ئامادە کردوە بۆ گەڕانەوە بۆ کوردستان.

– 1 –

**پیرەمێرد قەسیدە فارسیەکەی حاجی مەلا خالیدی لە ستایشی ئیمام ڕەزا و ئارامگاکەی لە شاری مەشهەد، بەمجۆرە تەرجومەی کوردی کردوە:**

کـــام بارەگـــایە. بەرزی لەگەڵ عەرش بەرامـــبەرە؟
لەو نـــوری گـــومەزەوە هەمـــو عـــالەم مـــونەووەرە
ڕۆژ مـــۆری تـــاوڵەیەکە لە شـــەوقی قـــوبەی زەری
لای تەخـــتە نەردی چەرخـــی چـــوارەم لە شەشـــدەر
عەکســـــی گوڵئاتەشـــــی ئەو دەرکەوتـــــوە بەوە
ســـەر بەردەکـــانی شـــوێنی خلیســـکی ســـەمەندەرە
نوعممـــان خەجـــاڵەتە لە نمـــونەی خەوەرنەقـــی
کیســـرا بە کەســـری تـــاقی دڵیشـــی موکەســـەرە
بـــۆ خـــاکی ڕێ، کە کەوشـــی میـــوان دابنـــێن بە ڕیـــز،
دەرگـــانەکەی بە ڕیـــز ســـەفی خاقـــانو قەیســـەرە
ئەم بارەگـــایە جـــێ ســـیری ســـەرداری ئەولیـــا
یـــا خوابگـــاهی نـــوری دو دیـــدەی پێغەمـــبەرە
بگـــرە لە ڕۆژهەڵاتەوە تـــا خۆرنشـــین بە ڕیـــز
ئەم زاتە فەیـــزی بـــۆ ســـەر هەمـــوان بە ســـێبەرە
ڕەوزەی ڕەزایە ئێـــرە، کە فەرزەنـــدی کـــازمە.
تـــازەگوڵێکی گەش لە گولســـتانی جەعـــفەرە
ســـەروی ســـپی لە گوڵشـــەنی ســـوڵتانی ئەنبیـــا
ئەوبـــاوەی حەدیـــقەی زەهـــرا و حەیـــدەرە
ئاگـــاتە قـــافی قـــودرەتی، ســـیمورغی عەقڵـــی کەس
کەی کەعـــبە شـــوێنی فـــڕینو فـــڕەی بـــاڵی کـــۆترە؟
ئەم خـــاکە جیســـمی پـــاکی ئەوی وا لە باوەشـــا
وا بـــۆی لـــواوە فەخـــری لەســـەر چەرخـــی ئەخـــزەرە
ســـیرێ لە ئەهلـــی بـــاتینەوە ئاشـــکرا دەبـــێ
تێکـــڕا هەمـــوی لە ســـوچی دڵـــی پاکیـــا مـــوزمەرە

ئەم شەوقی ڕۆژە نووری جەمالی ئەوە بەڵێ
وایە جەزا موافیقی ئیحسان موقەڕەرە
هەرچی لە دو جیهانە کە کەمەر بەستەی ئەوە
لای ئەنگە پێی بڵێن ئەمە شای حەوت کیشوەرە
حاجی! ئەچیتە کوێ وەرە مەشهەدێ کەوا
ئەم شوێنە وەقفەیەکی وەکو حەجی ئەکبەرە
بێ زوڵمەت ئاوی خزری لە دەرگا بخۆرەوە
گەنجێکی وایە حەسرەتی گیانی سکەندەرە
ئەی زائیرینە! لێرە بە هێواشی پێ بنێن
فەرشی زەوی لە باڵی مەلەک پڕ لە شاپەڕە
کاکۆڵی بەستوە بە گەسک خادمی بەهەشت
غافڵ نیە هەمیشە لە ماڵینی ئەم دەرە
شاها! ستایشت بە زوبانو بەعەقڵی من
نابیژرێ ئەو سەنایە لە عەقڵم بڵندترە
بێتو گەدایەکی وەکو من وەسفی تۆ بکا
وەک مشتومالی ئاوێنەی میهری ئەنوەرە
گیانە! بە شاهی مەسنەدی لەولاک کە ناوی ئەو
بۆ سەر. سەری نەبیی ئولولعەزم ئەفسەرە
ئینجا بە حەقی ئەو کەسە تەئریخی ڕۆژگار
بابی لە دەفتەری هونەری بابی خەیبەرە
ئینجا بە نووری عیسمەتی ئەو ناوە نامیە
قوفڵی زوبانو حیرەتی عەقڵی هونەروەرە
ئینجا بە سۆزی سینەی ژارچەشتوەکەی کەوا
ئێستایش بەشینو ماتەمی چاوی جیهان تەڕە
ئینجا بە خوێنی ناهەقی سوڵتانی کەربەلا
تەئریخی ئەم جیهانە بە خوێناوی ئەحمەرە
ئیتر بە هۆی ئەوەی کە لە بەحری مەناقیبی
ئینشای بوفیراس لە تنۆکێکی کەمترە
ئیتر بە ڕوحی ئەقدەسی باقیر کە ناو دڵی
خەزنەی خودایە پڕ لە دوڕی سیڕ و گەوهەرە
ئیتر بە حەقی موسای کازم کە ناوی ئەو
لای خوا لە ڕیزی مەردی بەسەندی سەبتی دەفتەرە
ئیتر بە نووری تەلعەتی تۆ کاتێ دەرکەوی
میحرابی مانگی چواردە و شەمسی خاوەرە
ئیتر بە تەقیەی تەقیو پاکی نەقی
ئینجا بە عەسکەرێ کە هەمو جیسمی جەوهەرە

ئینجـــا بە عەدلـــی ئەو شـــەهە وا دادی حـــوکمی ئەو
بـۆ، بەرخـی کـۆرپە، گـورگ بە جـگەر سـۆزیی. مـادەرە
ڕوحمـــیێ بە خالیـــدت بـــکە وەک بـــیێ کەنـــاری ئـــاو
لەرزانـــــی ترســـــی زەمـــــزەمەی ڕۆژی مەحشـــــەرە
تـــــــــۆ پادشـــــــــای دادگەری و ئەو گەدای هەژار
مەغڵـــوبی دێـــوی سەرکەشـــی نەفســـی ســـتەمگەرە
تـــۆ ســـایەداری لوتـــف و ئەویـــش بەزاری عەفـــو
دەســـتێکی بگـــرەو ڕایکێشـــە بفەرمـــو: کـــورە وەرە!
نـــا ئەهلـــەو ســـزای ئەوە نـــیم ڕو بکەیـــتە مـــن
چـــاک و خـــراپ لە لای کەرەمـــی تـــۆ بەرامـــبەرە
پەیکـــیێ بنێـــرە بـــۆ منـــی بـــیێ خانومـــان بە هینـــد
بـــــۆ لای ئەوەی کە خـــــاکی دەری موشـــــکی ئەزفەرە
دێـــوی موریـــدی لە پـــێش ئەزەری هەر موریـــدی ئەو
مێشـــــولەیەکە مـــــوعەرەزی بـــــایەکی سەرســـــەرە
ســـــەر قـــــافڵەی قەتـــــاری تەریقـــــی هیـــــدایەتە
ئاگـــــای لەســـــەر بەنـــــدەگی حەیـــــی ئەکـــــبەرە
ئاســـودە وەرە رەو بـــکە لە ســـەر مەنزڵـــی بەقـــا
بـــۆ مەملەکەتـــی ســـەرووی حەرەمـــی قودســـی ڕەهـــبەرە
چـــاوم لە چـــاوی پـــڕ فەنـــی ئەو ڕەحمەتـــی ئەویێ
مـــــن موفلیســـــم، نیگـــــاهی ئەویـــــش کیمیـــــاگەرە
یـــــاخود مســـــی شکســـــتەو هیـــــوام هەیە بە ئەو
بـم کـا بە زێـڕ، کە مـس، بە نیگـای ئەو هەمـوی زەڕە.
(ڕۆحی مەولانا: 50)

– 2 –

**پیرەمێرد شیعرە فارسیەکەی حاجی مەلا خالیدی لە دەربڕینی هەستی ئاوارەیی دا بەمجۆرە تەرجومەی کوردی کردوە:**

جەژنە وا مـــن ناهومێـــد و بـــیێ بەشـــی دیـــداری یـــار
خەڵکی خورەم، من بە خورەم، ئـاو لە چـاوم دێـتە خـوار
گشت لە گەشتی دەشـتە داوێـن پـڕ گـوڵاڵەی ئـاڵ و مـن
ئەشـــکی ســـوری، داخـــی دوری، دەوری کـــردمە لالەزار
بـیێ ئەوا و، دڵ لە خەم کەیـل و، غەریـب و بـیێ نسـیب
دەست لە سەر دڵ، سەر لە ئەژنۆ، چاو لە ڕێـگەی پرسـیار
دڵســـوتاو و، چەرگبـــڕاو، کـــۆڵان بە کـــۆڵان دەربەدەر
کەس بە دەری مـــن ئەچـــیێ، دورکەوتەیـــی یـــار و دیـــار
خوێنی دڵ وا هات بە چاوما، بو بە جـۆگەی "بەکرەجـۆ"

هەردو سەرچاوەی چەمێکن کردمە تاسەی "سەرچنار"
باوەمردەی "باوەمردە" م. "ئالبولاغە" چاوەکەم
خۆزگە ئەم دی پێم بڵێن وا "باوەگێڵدی" گەیە شار
پێم بڵێ: خالید. ئەگەر تۆ وا ڕەهەندە و شێت نەبی
تۆ لە کوێ و غەزنەین و کابول، خاکی هیند و قەندەهار؟
*(ڕۆحی مەولانا: 16)*

– 3 –

**پیرەمێرد قەسیدە فارسیەکەی مەلا خالیدی لە ستایشی شاە عەبدولای دیهلەوی دا بەمجۆرە تەرجومەی کوردی کردوە:**

تو خوا سا بۆم بڵێن بەو شاهی جوانانە بە پەنهانی:
کە زیندو بونەوە، عالەم، بە فەیزی هەوری نیسانی
هەمو دەستەی پەرستشکاری ئەو، چاویان لە ڕێ دایە
پەریرویان لەوێن، وا موتربیش کەوتە غەزەلخوانی
بە لەنجەولارەوە سەروی چەمەن دێن و دەچن یەکسەر
بەپیر ئەو پیرەوە وا دێتە ناو بەزمی گولستانی
قدومی مەرهەمی داخی دڵی لالەی جگەرسۆزە
نیگاهی داخە بۆ رویی لالەرویانی غولامانی
ئەبا ناوی لەتافەت لەو گوڵی تازەی نەپشکوتو
ئەدا ئاوی خەجاڵەت بەو نیهالانی خەرامانی
لە ڕاستی قەددی ڕاستی سەروی ئازاد سەر فرۆ دێنێ
بە چاوپێکەوتنی، شمشاڵ ژەنە، شمشاد بە گۆرانی
هەمو جوانان لە رویا رو بە خوێنی دڵ ئەکەن سوراو
پەری تاوس پەرێشانە لە تاو جیلوەی پەرێشانی
گزنگی چاویە وا داویە لە نەرگس چاوی روناکە
بە خاکی پێی ئەوە سونبول ئەکا ڕەیعانی ڕەیحانی
بە یەک دا دێن هەرایانە بە دەعوای دولبەری دولا
لە نەوزادانی بوستانی و دلارامی شەبوستانی
پەچەی لادا بە ئارایشتەوە دولبەر لە شکڵی دا
کە لەو نەقشی خودایە، دڵشکستی حەسرەتە، مانی
لە یەکی تریش ڕەنگێکی وا دەنوێنێ باغچەی گوڵ
کە وەسفی نایەتە تەحریر، وا کەوتومە حەیرانی
بە دەستی سنعەتی خوا خامەیی قودرەت کە نوسیویە
لە سەر سەحنی چەمەن شیعری بەدیعو خەتی ڕەیحانی
وەنەوشە مل کەچە بۆ خاڵی جانان، سوجدەیە پیشەی
لە شەرمی ڕووی، گوڵ وا ئارەقی خەجڵەتیە پێشانی

دەمــی خــونچە بە مەدحــی ئەو دەمە ئەکــرێتەوە هەردەم
بە تیلای چاوی نێرگس رەنگی زەردە حەددی خۆی زانــی
رەشـە رەیحـانە خەتــی لێـوە، سـونبول زوڵفـی مەحبـوبە،
قەدی سەرویش، لە گەڵ بـاڵای جوانـان، کەوتە هاوشـانی
بە رووی پەڕەی گـوڵا شـەونم کە ئەدرەوشـێتەوە هەروەک
بە سـەر لەعلـی یەمـانی دانە مـرواری بەحـری عومـمـانی
بە فەرشی سەوزی خوا پێداو لە زەمروت جوانترە چیمەن
لە راســـتی لالە، لاڵە، کەمـــرەوە، یـــاقوتی روممــــانی
دەمـێ عیسـاو دەمــێ بــای بەربەیـانی هـاودەمن دەمدەم
پەیـــامی مــــردو زینــــدوکردنەوەی دا هەوری نیســـانی
بە گریەی هەورەوە گوڵ پێکەنی، ئەم گـریەو ئەم خەنـدە،
وەکـو مەعشـوقی بــێ پەروا لە نــاڵەی عاشــقی فــانی
بە بـۆنی گـوڵ هەزاران چـاوی کـوێر کەوتـونەوە بینـین
وەکـو یەعقـوب بە بـۆنێکی کراســی مــاهی کەنعــانی
سەمەندەر هاتنە سایەی، گوڵناتەش ئاوی گوڵیان چەشـت،
بە جارێ هـاتنە ژێـر بەیـاخی بـاخ، وەحشـیو بیابـانی
هەزاران گـوڵ کە پشـکوتون بە بـایەکی بەیـان هەروەک
دڵــی دەســـتەی موریـــدانو نیگــاهی قــوتبی رەببــانی
چـرای رێی نـافەرینش، رۆژی بـورجی دانـشو بیـنش،
کلیلـی گەنجـی حـیکمەت، خەزنەی ئەسـراری سـوبحانی
دەلیـلو رێ نیشـاندەر، شـەمعی جەمعـی ئەولیـای نـایین
پەنــاهی پێشـــەوایان، قیـــبلەی ئەعیــانی روحـــانی
ئەمینــی قودســی عەبــدوڵا شـــەهێکیوا نیگـــاهێکی
گەیشـتە بەردی رەش ئەی کـا بە لەعلێکـی بەدەخشـانی
ئیمــامی ئەولیــا، ســەییاحی ئیقلیمــی خــودا بینــی،
نەدیمــی کیبریـــا، غەواســی نـــاو دەریـــای خـــودادانی
لە یـــومنی مەقــــدەمی ئەمنــــی یەمەن هیندوســــتانێکە
وەکـو وادیـی ئەیـمەن جـێی تەجەللی فەیـزی روحـانی
لە زۆر خەتــی خەتـــاوە تــاکو رۆژئـــاوا نــیە ئەمـــڕۆ
یەکێکــی تــر بیــێ لەو پــایەدا تـــا بێـــتە مەیـــدانی
ئەگەرچــی مەنبەعــی شــوعلەی جیهانئابــادە دونیـــایەک
بە جـــارێ نـــوری تـــێ دایە بـــوەتە مەشعەلســـتانی
لە تیشـکی رۆژی فەیـزی شەمشـەمەکوێرە نەبـێ، کـوێرە
بە غەیری خێڵ کە دو بینـە ئیتـر ئەی دیـوە کەس سـانی
لە دوای مەزهەر لە دونیا دا ئەوە بـۆ سـیری حەق مەزهەر
کەمـــالاتی زهـــوری کـــرد لە لای قەییـــومی رەببـــانی

چلۆن نازێ بێ بۆ ڕۆژ تا بڵێ وەک ئەو جیهانگیرەم
لە کێویش نایە وەک ئەو هیممەتە دەعیەی گرانجانی
ئەگەر پێشکەوتوانی پێشو، ئەم ئەییامە بونایە
لە مەجلیسیا ئەبون، بێ فاسیلە، هەر بۆ سەبقخوانی
ئەوانەی وان لە بەر دەرگای سەفەریان شوێنی خۆیانە
لە خەڵوەتیان، لە خزمەتیان، وەر ئەگرن فەیزی ڕوحانی
بوزرگانی لە سەد دەفتەر لە سەد مەعنا لە بەریانە
کە ئەو دەرکەوت هەمویان دەبنە منداڵی دەبوستانی
گەلێکی وا هەیە لای بوستامە وە یا مەنسور
بە تەمکینن "ئەنالحەق" نابیەی یا جۆشی سوبحانی
لە ئەقتابی جیهان دا کەس نیە هاوشانی ئەو بڕوا
لەگەڵ ڕۆژا سوها چۆن بۆی دەگونجێ لافی ڕەخشانی
بە ڕوحی ئەو کە دەهلی باغی ڕوحانی‌یە ئیتر
قەڵایێکە گوزەر ناکا بە لایا فیکری نەفسانی
ئەگەر چی کافرەستانە بەڵام فەیزی وجودی ئەو
ئەوی‌ی کردوە بە جەننەت ئەک خیلافی نەسسی قورئانی
گولستانی هیدایەت، سیس‌و ژاکاو بو لە دنیا دا
بەجارێ فەیزی ئەو خستیەوە سەر سەوزی‌و شادانی
ئەگەر میعماری لوتفی قەسری ئیمانی لە سەر نوێوە
ئەی هێنا بێتەوە مەیدان لە ناو چو بو بە وێرانی
هەتا ئەم دی بو بەرقاپی سەروکارم لە گەڵیا بو
کە دیم فەرقی ئەما خەڵکی عیراق و پیر و میللەتانی
گەلێ تەوانجی ئەدا لێم ئەهلی توران‌و خوراسانی
کە بۆچی ئەچیە "دارولکوفر" دوە گەر تۆ موسڵمانی
ئەیان گوت: دیهلی زوڵماتێکی کوفرە. من: وتم ئەی دڵ
سکەندەر کەوتە ناو زوڵماتەوە بۆ ئاوی حەیوانی
لە تولی سوحبەتی ناو ئەولیای بەتحا و یەثروب دا
ئەکەوتە دەست، ئەوەی لێرە وەرم گرتوە، بە هەرزانی
بە گیان‌و دڵ ببە بەندەی ئەگەر پێویستە ڕستگار بی
لە تەفرەی نەفسی ئینسانی، لە مەکرو فێڵی شەیتانی
ئەگەر چنگ ئەهریمەن کەوتایە، موری عەهدی ئەو ڕۆژێک
بە مێرولەی نە دەکرێ حاسڵی موڵکی سلێمانی
لەبەر بەد بەختی خۆی شایانە بکرێ ئەو سیابەختەی
لەوێ دایە کەچی مەیلی دەگاتە عالەمی فانی
لە ئێمێ پێی وتم وا من لەوێدام بۆچی نایناسم
وتم ڕاستە ئەبوجەهلی، (محمد) بۆیە نازانی:

ئەوانە گەسکی بەردەرگای ئەدەن پێیان ئەڵێم ئامان
لەدەست خۆتانی مەدەن ئیکسیری ئەعزەم وا بە ئاسانی
نیازی بەندەگی ئەو وا لە دڵما ئاه!! کە نا ئەهلم
مەدەد یا روحی شاهی نەقشبەندو غەوسی گەیلانی
لە تاوی بازی نەفسم هەر وەکو پاساریێ دێم بۆ لات
چ خۆشە گەر لەچنگ بازی دەرێنی وا بە ئاسانی
سەگم کەمتر لە سەگ!! سا تۆیش وەرە بۆم بە بە ئەجمەعین
تەماشایەکی حاڵم کە بە ئینسانی کە دەیزانی
بە ئاشنایی قبولم کە. بێگانەم لە خویشو خۆش
تەجەللی ئەحمەدیی بنوێنە وە بزانە کە سەلمانم
بەڕەنگێکی وەها گیانت نمونەی جانی جانانی
بەچاوی ئەهلی بینایان بەوێنەی جانی جانانی
لە پیاڵەی لوتفی تۆ با خالیدی لێوتینو تێر ئاو بێ
کە ئەو لێو وشک هەڵاتوی تینوەتیو، تۆ بەحری عوممانی
*(رۆحی مەولانا: 75)*

## -4-
## خالیدی پیری تەریقەت (1226 - 1230 ک)

سەفەرەکەی مەولانا خالید بۆ هیندستان، لە چونیەوە هەتا گەڕانەوەی، نزیکەی دو ساڵی خایاندوە. لە گەڕانەوەدا وەکو چونەکەی زۆری پێ نەچوە، چونکە ئەمجارەیان لە یەکێ لە بەندەرەکانی هیندستان سواری کەشتی بوە، بە ڕێگای دەریادا ڕۆیشتۆتە بەندەری مەسقەت لە خەلیج و، لە وێوە بە ڕێگای وشکایی دا بۆ شارەکانی شیراز، یەزد، ئەسفەهان، بەرەو هەمەدان، ساڵی 1226 ک (1811 ز) گەیشتۆتە شاری سنەی پایتەختی میرایەتی ئەردەڵان. *(الحديقة الندية: 39)*

بڵاوکردنەوەی تەریقەتی نەقشی لە ناو شیعەدا زەمینەی فکری نەبوە. لە بەر ئەوە نەیتوانیوە کەسێ لە زاناکانی شیعە رابکێشێ بۆ سەر تەریقەتەکەی، بەڵام کە گەیشتۆتەوە کوردستان، لە شاری سنەوە دەستی کردوە بە بانگەوازی تەریقەتەکەی و، هەر لەوێ یەکەم هەنگاوی ناوە و یەکەم سەرکەوتنی بە دەس هێناوە. شێخ محەمەد قەسیمی مەردۆخەیی، کە مامۆستای خۆی و کەسایەتیەکی ناسراوی بنەماڵەی شێخانی مەردۆخەیی و، یەکێ لە زانا بە ناوبانگەکانی ئەو سەردەمە بوە، چۆتە سەر تەریقەتەکەی. هەروەها چەندین مەلا و کەسایەتی تر.

مەولانا خالید لە سنەوە چۆتە گوندی سەرگەت. ماڵی حەمەخانی برای لەوێ بوە. سەرگەت گوندێکی گەورە بوە سەر بە ناوچەی گوڵعەنبەر (شاری خورماڵی ئێستا)، ئەو کاتەی ئەوڕەحمان پاشا، خالیدی بە مەلای مزگەوتەکەی خۆی لە سلێمانی دامەزراندوە، بۆ دابینکردنی پێویستیەکانی ژیانی مەلا خالید و براکانی داهاتی گوندی سەرگەتی بۆ تەرخان کردون. *(نامە: 159 . دەستنوس: 129)* بنەماڵەکەی مەلا خالید هەر ئەو کاتە گوێزاویانەتەوە بۆ ئەوێ و، لەوێ نیشتەجێ بون و، خەریکی کشتوکاڵ بون.

نزیکەی سێ حەفتە لە سەرگەت ماوەتەوە لەو ماوەیەدا، هەم پێشوازی کردوە لەوانەی چون بۆ بەخێرهاتنەوەی، خزم و دۆست و ناسیاوەکانی بە سەر کردۆتەوە، هەم سوسەی دەنگدانەوەی هەواڵی گەڕانەوەکەی خۆی کردوە لە ناو خەڵک دا، بە تایبەتی لە ناو خەڵکی سلێمانی دا. لە گوندی سەرگەتەوە چۆتەوە شاری سلێمانی. بەڵام وەکو شاه عەبدوڵا لە هندستان ئامۆژگاری کرد بو، لە سلێمانی نەماوەتەوە، سەرەتا روی کردۆتە بەغداد بۆ سەردانی ئارامگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی.

مزگەوتی گەیلانی لە بەغداد ناوەندی ئیرشادی تەریقەتی قادری بوە، لە هەمان کات دا ناوەندی خوێندنی زانستی - دینیی بوە. مەولانا خالید ماوەی پێنج مانگ لە بەغداد لە مزگەوتی شێخ عەبدولقادری

گەیلانی دا جێگیر بوە. لەوێ لە گەڵ فەقێ عوسمانی هەورامی، دواتر شێخ عوسمانی سیراجودین (1195 - 1283 ک)، ئاشنایەتی و دۆستایەتی پەیدا کردوە و، بۆتە هاوڕێ و باوەڕپێکراوی و، لە پاشەڕۆژدا بوە بە یەکێ لە ناسراوترینی خەلیفەکانی لە ناوچەکەدا.

## تەریقەتی نەقشبەندی

**خالیدی سەحرانەوەرد لە هیندستانەوە چی لە گەڵ خۆی هێناوەتەوە بۆ کوردستان؟**

تەریقەتی نەقشبەندی، پێش هاتنەوەی خالیدی سەحرانەوەرد، ئەگەر خەلیفە و موریدیشی هەبو بێ، لە کوردستان، لە ناو خەڵک دا، تەریقەتێکی نەناسراو بوە. هیچ نفوزێکی مادی یا مەعنەوی نەبوە. لە گەڵ گەڕانەوەی خالیدا ئیتر تەریقەتی نەقشبەندی بڵاو بۆتەوە، لە ناو خەڵک دا بە تایبەتی لە ناو مەلاکان دا لایەنگری پەیدا کردوە و، پەرەی سەندوە.

تەریقەتی نەقشبەندی تەنیا لە ناو ئەهلی سوننەت و جەماعەت دا بڵاو بۆتەوە. لە ناو مەزهەبی سوننەش دا پێرەوی ڕێبازی ئەشعەری کردوە، بە پێچەوانەی موعتەزیلەوە ئەمان پێیان وا بوە: نەقڵ حاکم و ئەقڵ خادمە. شیعەیان بە "رافزی" زانیوە. خالید لە سەفەرەکەی دا ئەوەی نە شاردۆتەوە. لە شیعرەکانی دا ڕەنگی داوەتەوە. کاتێ چوە بۆ مەشهەد بۆ سەردانی ئارامگای ئیمام ڕەزا و گفتوگۆی لە گەڵ زانایانی شیعە کردوە، لە ماڵئاوایی دا ئەڵێ:

خالـد بیـا و عـزم سـفر زیـن مقـام کـن
بـر روضـه رضـا بـدل و جـان سـلام کـن
از گفتگـوی خـام روافـض دلـم گرفـت
بـر بنـدوبار قطـع سـخنهای خـام کـن
بدعت سرای طـوس نه جـای اقامـت اسـت
برخیـز و روی دل بـدر پیـر جـام کـن..

لەو قەسیدە عەرەبیەدا کە دوای گەیشتنی بە دەروازەی جیهانئاباد بۆ شاە عەبدوڵای هۆنیوەتەوە باسی "رافزی" یەکان ئەکا و ئەڵێ:

وأعـــانني مـــن فرقـــة أفاكـــة
وأجـــارني مـــن امـــة جهـــال
أعنـــي روافـــض اذربيجـــان التـــي
هـــم أشـــنع المخلـــوق فـــي الافعـــال

شاە عەبدوڵاش هەمان باوەڕی هەبوە. لە گەڕانەوەدا بەرەو کوردستان خالیدی ڕاسپاردوە سەردانی، مەولانا عەبدولعەزیزی حەنەفی، نوسەری کتێبی "تحفەء اثناعشریە" بکا، کە لە دژی شیعە نوسیوێتی. تەریقەتی نەقشبەندی، لە سەر دەستی مەولانا خالیدا، خەلیفە و موریدی لە ناو ئەهلی سوننەت دا، لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامی دا، پەیدا کردوە. بەڵام نەی توانیوە، یا نەی ویستوە، تەنیا یەک کەسی سەر بە مەزهەبی شیعە، کورد بێ یا نەکورد، بۆ سەر ڕێبازی تەریقەتی نەقشبەندی ڕابکێشێ.

پەروەردەکردنی خەلیفە و مورید لای خالید ڕێوشوێنێکی تایبەتی هەبوە. لایەنێکی پەروەردەی ئایدیولۆجی و، لایەنێکی تری ڕاهێنانی سایکۆلۆجی بوە. مەولانا هەوڵی داوە، لە هەر شار و شارەدێیەک

کەسێ بدۆزێتەوە بیکا بە خەلیفەی خۆی بۆ ئیرشادی تەریقەت و، ریزی یەکەمی خەلیفەکانیشی لە ناو مەلا زانا و ناودارەکان دا هەڵ بژاردوە. ڕێنمایی کردون شەریعەت و تەریقەت پێکەوە گرێ بدەن. لە قورئان و سوننەت لا نەدەن. خۆی دەرسی داداون و فێری ڕێوشوێنەکانی تەریقەتی نەقشبەندی کردون، خۆی پەروەردەی کردون و تاقی کردونەتەوە و، دوای ئەوەی لێیان دڵنیا بوە، ئینجا ئیجازەی ئیرشادی پێ داون، هەر خۆیشی بەردەوام ڕێنمایی و چاودێری کردون و، هەمویان ڕاستەوخۆ بەستراون بە خۆیەوە. لە ژیانی خۆی دا چەند خەلیفەیەکی، کە لە ڕێنماییەکانی ئەو لایان داوە، لە تەریقەت دەرکردوە. تا خۆی زیندو بوە، جگە لە خۆی کەسی کە بۆی نە بوە ئیجازەی ئیرشاد و پلەی خەلیفایەتی بە کەس ببەخشێ. لە هەرجێیەک خەلیفەیەکی دانا بێ، خەلیفەکانی تری ئەو جێیە ئەبو گوێڕایەڵی ئەو بن. لەم بارەیەوە نامەیەکی بۆ یەکێ لە خەلیفەکانی نوسیوە، ئەم پرنسیپە ڕێکخراوەییەی بە ئاشکرا ڕون کردۆتەوە. نوسیویتی:

> "نوسراوی سەراپا سەرزەنشتی ئێوە بە حزوری ئەم مەهجورە گەیشت، مامەڵەی ئێمە لە گەڵ مەلا عەبدورەحمان نە لە ئاوردانەوەی زیاترەوەیە، یاسای تەریقەتی بەرز ئاوایە: هەر کەسێک، لە جێیەک، دابنێین پێویستە هەمو یاران هاودەنگ و گوێڕایەڵی بن. ئەگەرچی لەویش گەورەتر بن. نابینی عەبدوڵا ئەفەندی لە گەڵ مەلا محەمەدی جەدید و هیدایەتوڵا لە گەڵ مەلا محەمەدی بێتواتەیی مامەڵەی موریدانە ئەکەن؟ وێڕای ئەوەی کە هیچ کامیان بە تۆزی داوێنی یەکێک لەو دوانە ناگات. خەڵکی تر بەم شێوەیە زۆرن. بە تایبەتی من لەو ڕۆژەوە کە تۆم هەڵبژاردوە، بە تەرازوی هیچ کەسێک هەڵت ناسەنگێنم، جگە لە عەبدورەحمانی برات جاروبار."

لە برگەیەکی تری نامەکەی دا پرنسیپێکی تری تەریقەتەکەیان ڕون ئەکاتەوە، ئەڵێ:

> "بڕیاری هەمو ئەولیایە هەرکەس بە پیرەکەی بڵێ: بۆچی؟ ئەوە قەت ڕزگار نابێ. کەچی لە نوسراوەکەی ئێوەدا حەفتا بۆچی زیاتر هەبو. عەبدولقادری بەغدادیمان بە هۆی ئەو کاغەزانەوە کە ئەی نوسین و ئەو شەفاعەت و تکایانەی بۆ مەلا عەبدورەحمانی ئەکرد کە بۆ ئەوێ نارد بو، لە خەلافەت بەرکەنار کرد."

*(سەباح بەرزنجی، نامە: 160)*

خەلیفەکانی ڕاسپاردوە مورید و مەنسوبەکانی لە ناو توێژەکانی تردا بدۆزنەوە و، لە ڕێگەی "تەوەجوه" و "ڕابیتە" وە پەروەردەی تەریقەتییان بکەن. ڕابیتە (الرابطة)، یەکێ لە ڕێگە سەرەکییەکانی پەروەردەکردنی خەلیفە و موریدەکانی بوە. خالید لە نامەیەکی دا کە بۆ هەندێ لە موریدەکانی ئەستەمولی نوسیوە، ئەڵێ:

> "... وقرع سمع هذا المسكين، ان بعض الغافلين عن اسرار حق اليقين، يعدون الرابطة بدعة في الطريقة، ويزعمون انها شئ ليس له اصل ولا حقيقة، كلا انها اصل عظيم من اصول طريقتنا العلية النقشبندية، بل هي اعظم اسباب الوصول، بعد التمسك التام بالكتاب العزيز وسنة الرسول..."

*(الرقعة: 4)*

"... بە گوێی ئەم مسکینە گەیشت، هەندێ بێئاگا لە نهێنیەکانی حەقولیەقین، ڕابیتە لە تەریقەت دا بە "بیدعەت" ئەژمێرن، ئەڵێن ئەمە شتێکە نە ئەسڵی هەیە و نە حەقیقەت، نەخێر ئەمە بنەمایەکی گەورەی بنەماکانی تەریقەتە بەرزەکەی نەقشبەندیمانە، بگرە گەورەتری هۆی "وصول" ە، لە دوای دەسگرتنەوە بە کیتابی عەزیز و سوننەتی پێغەمەر...

مەولانا خالید ئیتر ئاشکرا بوە کە بانگەوازی زیندوکردنەوەی تەریقەتی نەقشبەندی گرتۆتە ئەستۆ و، بە کردەوە کەوتۆتە ئەنجامدانی ئەو کارەی کە پیرەکەی لە هندستان پێی سپارد بو. لە گەڵ فەقێ عوسمان و

چەند کەسێکی تر لە هاوبیرەکانی گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی. بە تەما بوە سلێمانی بکاتە ناوەندی کاری خۆی. لەو نامەیەدا کە لە جیهانئاباتەوە ناردویەتی بۆ سلێمانی، ئەو کاتە ئاگاداری کردون کە چاوەڕوانی رەزامەنـدی پیرەکەیەتی بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە و، داوای کردوە تا خۆی نەگـاتەوە پەیـامەکەی بە "دۆسـتان و هەواداران" ی رابگەیەنن. هەر زو خەڵکێکی زۆری لێ کۆ بۆتەوە. لەو کاتەدا ئەوڕەحمان پاشا حاکمی بابـان بـوە. خالیـد لە گەڕانەوەی دا بۆ سلێمانی بە تەما بوە، ئەوڕەحمان پاشای میری بابان، نەک هەر بۆ بەخێرهێنانەوەی بچـێ بە پێشوازیەوە بەڵکو ئەویش خۆی بە دەستەوە بدا بچێتە سەر تەریقەتە تـازەکەی و ببێتـە موریـد و پشـتیوانی ئەو. *(ریاض المشتاقین: 140)*

## هەڵوێستی ئەوڕەحمان پاشا

ئەوڕەحمان پاشا لە گەڵ مەلاکانی سـلێمانی تـێکەڵاو بـوە. چەنـدین مزگەوتـی لە سـلێمانی و دەرەوی دروست کردوە. بە دەیـان کتێبـی گرنگـی بە نوسـینەوە داوە و وەقفـی مـزگەوت و مەلاکـانی کـردوە. وەکـو ئەگێڕنەوە خۆیشی هەندێ جار سەردانی مزگەوتی کردوە دەرسی بە فەقـێ وتـۆتەوە. *(قزلجـی: 52)* مەلاکـانی سلێمانی، بە تایبەتی شـێخ مـارفی نـۆدێ، کە هەم مەلای مزگەوتـی گەورەی سـلێمانی و هەم شـێخی تەریقەتـی قادری بوە، ئەم ملۆزمە نوێیەی پێ قوبوڵ نەکراوە. بە توندی کەوتۆتە دوژمنایەتی خالید. ئەوڕەحمان پاشای لێ هان داوە، هەروەها ویستویەتی زاناکانی سلێمانی و موسڵ و بەغداد بکاتەوە بە گژی دا. بـۆ ئەو مەبەسـتە خۆی نامیلکەیەکی لە سەر نوسیوە و نامەی تایبەتی بۆ زاناکان ناردوە. یەکێ لەو زانایانەی کە ئەم نـامەی بـۆ نوسیون مەلا یەحیای مزوری (؟ - 1250 ک) بوە.

لە یەکێ لە نامەکان دا نوسراوە:

"... علامة الدنيا على الاطلاق والدين، حجة المسـلمين مولانـا وشـيخنا، الشـيخ يحيـى المـزوری العمادی، متع الله المسلمين بطول حياته، اما بعد:

فقد ظهر عندنا خالد وادعی الولاية الكبری والارشاد، بعد عوده من الهنـد الـی هـذه الـبلاد، وهـو رجل قد ترک العلوم بعد تحصيلها علی وجه الكمال، واختار سبيل الضلال. ونحن قد عجزنـا عـن الزامه وافحامه، فيجب عليک ان تتوجه الی طرفنا لافحامه ودفع ضـلاله ومـرامه، والا فقـد عـم... وعليكم السلام و رحمة الله وبركاته."

*(الرسائل المغنية: 22)*

مەلا یەحیای مزوری یەکێ بوە لە زانا ئاینیە ناسراوەکانی کوردسـتان و عیـراق، تەمەنێکـی درێـژی بە مەلایەتی بە سەر بردوە، لە بادینان و لە بەغداد دەرسی وتۆتەوە و مامۆستایەتی کردوە، ئیجازەی مەلایەتـی بە دەیان زانای کورد و عەرەب داوە. کاتێ مەلاکانی سلێمانی سـکاڵا لە دەس مەولانـا ئەکەن و تاوانبـاری ئەکەن بە دەرچـون لە دینـی ئیسـلام و داهێنـانی دینێکـی تـازە، مەلا یەحیـا و چەنـد مەلایەکـی تـر راسـپێردراون لێکۆڵینەوە لە دروستی و نادروستی ئەو پرسە بکەن و دوا بڕیار بـدەن. مەلا یەحیـا چـۆتە سـلێمانی روبەڕو خالیدی دیوە و گفتوگۆی لە گەڵ کردوە. لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەدا ئەوەندە بە مەولانا خالیـد سەرسـام بـوە، هەر ئەو کاتە مەلا یەحیا بۆتە موریدی مەولانا و بـۆتە یەکێ لە سەرسـەختترین داکۆکیکارەکـانی مەولانـا لە بەرامبەر ئیدیعاکانی شێخ مارفی نۆدێ و هاوبیرەکانی دا. بە نامە و بە نوسین بەرپەرچی هەمـو ئیتیهامەکـانی شێخ مارفی داوەتەوە.

مەلا یەحیا لە یەکێ لە نامەکانی دا بۆ شێخ مارف نوسیویێتی:

"وان انکارهم علیه، قدس سره العزیز، من حیث احواله واقواله واذابه وخصاله، فیا اخی ما صاحبتموه ولا خالطموه، فان کل من صاحبه وعلم احواله وخصاله، وسمع اقواله، سلم ولایته الکبری. انه من المقربین والصدیقین، وانه قطب الطریقة، وکل من خالطه ندم من انکاره والتعصب معه. کیف وهو، قدس سره العزیز، یامر المریدین بجمیع مامورات الشرع الشریف، وینهاهم عن جمیع منهیاته..."

*(الرسائل المفنیة: 46)*

لە نامەیەکی تری دا نوسیویێتی:

"اعلم ایها الاخ الشقیق:
انک قد کتبت الینا اعتراضات واشکالات لا یقع فیها من له خبرة بکتب الشرع، فضلا عن کتب السلف الصالحین الجامعین بین علمی الظاهر والباطن العالمین بهما. فکتبنا الیک اجوبتها الماخوذة من کلام من یعتد باقواله فی الشرع والتصوف، فلا نعیدها فی هذه الورقة. لکن نرجو العفو ان وقع منا سوء ادب فیما کتبنا.
یا اخی الشفیق: موحموله ماکتبت الینا ظاهر فی التعصب والمیل عن سبیل الاستقامة، فهذا هو الانکار المنهی عنه، والایذاء المضر المشار الیه فی الحدیث القدسی: "من اذی لی ولیا فقد اذنته بالحرب"."

*(الرسائل المفنیة: 51)*

نامەکانی مزوری کاری لە شێخ مارف نەکردوە و نەبۆتە هۆی ڕاستکردنەوەی هەڵوێستەکانی لە مەولانا خالید. هەر سور بوە لە سەر دوژمنایەتی کردنی.

ئەورەحمان پاشا جگە لەوەی هەندێ لە مەلاکان و ساداتی سلێمانی هانیان داوە جێگەی مەولانا نە کاتەوە خۆیشی تەجروبەی پێشوتری هەبوە لە گەڵ هەندێ بزوتنەوەی دینیی دا. لە عێراق ئاگاداری کێشەی سوننە لە گەڵ بزوتنەوەی "وەهابی" و لە ئێران ئاگاداری کێشەی شیعە لە گەڵ بزوتنەوەی "شەیخیە" بوە. لە سەر داوای دەوڵەتی عوسمانی، جارێک بە لەشکری بابانەوە نێردراوە بۆ سەر وەهابیەکان. لەو لەشکرکێشیەدا سەدان کەسی هێزەکەی فەوتاون. ئەورەحمان پاشا نەی ویستوە کێشەیەکی دینیی لەو بابەتە لە وڵاتەکەی ئەمیش دا دروست بێ.

ئەورەحمان پاشا ئەک نە چۆتە سەر تەریقەتە تازەکەی مەولانا خالید، وەکو بە هیوا بوە، بەڵکو زۆر بە ڕونی بە مەولانای ڕاگەیاندوە: کە ئەگەر وەکو جاران مەلایەتی ئەکا و خەریکی وتنەوەی دەرس و پێگەیاندنی قوتابی و فەقێ ئەبێ، ئەوا باشە و بەخێر بێتەوە، ئەتوانێ لە سلێمانی لە شوێنەکەی خۆی دا بمێنێتەوە. خۆ ئەگەر خەریکی ئیرشاد و بڵاوکردنەوەی تەریقەتەکەی ئەبێ، عالمەکانی سلێمانی ڕازی نابن، ئەبێ لە سلێمانی نە مێنێتەوە بڕوا بۆ لایەکی تر. *(ریاض المشتاقین: 141)*

لەو ماوەیەدا لە سلێمانی ئاڵوگۆڕێ لە دەسەڵات دا ڕوی داوە. والیی بەغداد ئەورەحمان پاشای لاداوە. خالید پاشای کوڕی ئەحمەد پاشای لە جێی ئەو کردۆتە میری بابان. خالید پاشا، ماوەیەکی کورت لە دەسەڵات دا ماوەتەوە، بەڵام هەمان هەڵوێستی ئەورەحمان پاشای هەبوە لە مەولانا و تەریقەتەکەی و مانەوەی لە سلێمانی. مەولانا نە چۆتە ژێر باری داواکەی ئەورەحمان پاشا و خالید پاشاوە. ڕێگەی دوەمی هەڵ بژاردوە. سلێمانی بە جێ هێشتوە ڕوی کردۆتە بەغداد. لەو سەردەمەدا سەعید پاشا والیی بەغداد بوە. دڵدەی مەولانا خالیدی داوە مزگەوتێکی داروخاوی بە یارمەتی هەندێ دەوڵەمەندی بەغدای بۆ ئاوەدان کردۆتەوە. خالید لەوێ دا دامەزراوە. هەم ئیرشادی کردوە، هەم دەرسی وتۆتەوە. بە زیرەکی و لێوەشاوەیی خۆی سەرنجی زۆرێک لە زانا گەورەکانی بەغدای ڕاکێشاوە. هەندێکیان لە سەر دەستی ئەودا تەریقەتیان وەرگرتوە و، بون بە خەلیفە و مورید و مەنسوبی ئەو.

شێخ مارف و هاوبیرەکانی لە بەغدادیش لە کۆڵ مەولانا نە بونەتەوە. لە سلێمانیەوە مەزبەتەیان نوسیوە، بە مۆری چەندین زانای ئەو کاتەوە، مەولانایا تاوانبار کردوە بە کافری و جادوگەری و دەستێکەڵاوکردن لە گەڵ جنۆکە، ناردویانە بۆ سەعید پاشا کە لە بەغداد دەری بکا. سەعید پاشا ئەم کێشەیەی روبەروی چەند زانایەکی عیراق کردۆتەوە، زاناکان لە سەر مەولانا خالید بە دەنگ هاتون، داکۆکیان لێ کردوە، ئەو تومەتانەیان بە درۆ خستۆتەوە. یەکێ لەوانە محەمەد ئەمین ئەفەندی موفتی پێشوی حیللە، مامۆستای مەدرەسەی عەلەویە بوە، نامیلکەیەکی لە وەڵامی تومەتەکانی ئەوان دا نوسیوە و بە مۆری زاناکانی بەغدادەوە بۆیان ناردونەتەوە. *(سل الحسام الهندی: 65)*

هەر لەو ماوەیەدا ئەورەحمان پاشا جارێکی تر کاروباری گرتۆتەوە دەست، بەڵام ساڵی 1228 ک (1813 ز) نەخۆش کەوتوە. پێشتریش چەند جارێکی تر بە سەختی نەخۆش بوە، تەنانەت جارێکیان کە والی بەغداد زۆری لێ کردوە بچێتە بەغداد بە سواری ولاخ لە تەختەرەوان دا بردویانە بۆ بەغداد. ئەمجارەیان نەخۆشیەکەی کاری تێ کردوە مردوە. کورەکانی و سەرانی وڵات کۆبونەتەوە دوای مردنی ئەورەحمان پاشا، مەحمود بەگی کوریان بە جێنشینی باوکی هەڵبژاردوە. بۆ ئەو مەبەستە بە کۆمەڵ مەزبەتەیەکیان بۆ وەزیری بەغداد نوسیوە. والی بەغدایش پلەی میری میران و پاشایەتی پێ بەخشیوە. مەحمود پاشا بۆتە میری بابان. مەولانا لە نامەکانی دا چەندین جار منەتی بە سەر مەحمود پاشادا کردوە و داویەتیەوە بە چاوی دا کە بە هیمەتی ئەو بۆتە حاکمی سلێمانی. *( نامە: 61 و 62 و 63. دەستنوس: 145)* رەنگە لەم پرسەدا کە ئەویش لە بەغداد بوە و، جۆرێ پەیوەندی لە گەڵ سەعید پاشا و نفوزی لە بەغداد هەبوە، قسەیەکی هەبوبێ لەو دانانەدا.

مەولانا خالید لە گەڵ ئەورەحمان پاشا و کورەکانی دا، بە تایبەتی لە گەڵ مەحمود پاشا و عوسمان بەگ و حەسەن بەگ، پەیوەندی بە هێزی هەبوە. لە ساڵانی رابوردودا چەندین نامەی دۆستانەیان ئاڵوگۆڕ کردوە. ئومێدێکی زۆری بە مەحمود پاشا هەبوە، ببێتە هاوباوەڕ و هاوکاری.

ساڵی 1228 کاتێ مەحمود پاشا بۆتە میری بابان، پێ ئەچێ مەولانا خالید، کە هێشتا نیشتەجێی بەغداد بوە، نامەیەکی، بۆ پیرۆزبایی مەحمود پاشا، بە بۆنەی دانانیەوە بە پاشای بابان، نوسی بێ، کە ئەمە بەشێکیەتی:

> "ئەگەرچی دەربڕینی خۆشی لە روانگەی فەقیرانی بێ مورادەوە، لە سۆنگەی دەوڵەتێکی ناپایەداری دنیاوە، پێچەوانەی مەشرەبی ئەربابی فەنایە، بەڵام چونکە سروشتی مرۆڤ وەها راهاتوە کە بە خۆشیی دۆستانی وەفاداری خۆی و بە شادیی یارانی مروەتشوعاری خۆی شادمان ئەبێ، لە بیستنی "ئیالەتی" ئەو یارە وەفادارە، جەلادەت کردارە، کە مایەی دڵخۆشی لایەنگرەکانی و، دڵتەنگی حەسودانی بەدنیژاد بو، ئەوەندە شادمان بو کە بە هیچ کارێکی دنیایی تر ئەوەندە خۆشحاڵ نەبوە..."

لە برگەیەکی تری نامەکەی دا، "ئومێدی لە خوا بۆ ئەخوازێ کە لە رێنوشوێنی پاشایەتی و دابینکردنی ئاسودەیی رەعایا و بەرایا سەرکەوتو بێ."

ئینجا کەوتۆتە دادانی وەعز و نەسیحەت و داوای لێ ئەکا:

> "فریوی شەیتان نەخوا و بە جوانیی دنیا لیقای مەحبوبی حەقیقی فەرامۆش نەکا...
>
> لە گەڵ ژێردەستان دەختی مروەت و، جاروبار بیری ئاخیرەت و، لە گەڵ مەولای خۆیا ئەدەبا مەحەبەتی هەبێ، ئەوسا دەستی ئەو و داوێنی دۆست. ئومێد لە بەندە و بەخشین لە خوا."

*(دەقی فارسی نامەکە لە کۆتایی باسەکەدا نوسراوەتەوە)*

یەکێ لەوانەی چۆتە سلێمانی بۆ پیرۆزبایی لە مەحمود پاشا، مەلا یەحیای مزوری بوە. مەولانا خالید لە بەغداد بوە، بەڵام نامەیەکی بۆ مەحمودی برای نوسیوە، داوای لێ ئەکا ئەو دوسێ ڕۆژەی مەلا یەحیا لە سلێمانی ئەمێنێتەوە، ئەو لە خزمەتی دا بێ و، ژورە تایبەتیەکەی خۆی بۆ چۆڵ بکا. لە نامەکەیشی دا ئاماژەی کردوە بەوەی مەلا یەحیا نامەی پیرۆزبایی زوبێر پاشای میری بادینانی پێیە بۆ مەحمود پاشا، بە بۆنەی دانانیەوە بە میری بابان. *(دەقی فارسی نامەکە لە کۆتایی باسەکەدا نوسراوەتەوە) (دەسنوس: 90)*

– 1 –

**دەقی فارسی نامەکەی مەولانا خالید بۆ مەحمود پاشا**

"مسکین بینوا، مصدع رای عقدەگشا می گردد:

کە اگرچە بحمدالله حاصل کون و مکان در نظر فقرای بیمراد قدر ذرەء و خسی و مقدار پر مگسی ندارد، و سرور و ابتهاج را سبب بدولت ناپایدار دنیا منافی مشرب ارباب فنا می نگارد. نهایت چونکە طبیعت بشری مجبول است بر اینکە بسرور دوستان وفادار خود مسرور و بابتهاج یاران مروت شعار خود قرین بهجت و حبور گردد. از استماع ایالت ان یار وفادار جلالت کردار، کە مسرت فزای قلوب هواخواهان، و تبرکی بخش فؤاد، کدورت نهاد حساد بدنژاد است، نە چندان مسرور شد کە بە هیچ امری از امور دنیویە محصول رسد. امید بخدای مفیض التوفیق والهدایە و امداد روحانیت یکەتازان عرصەء ولایت، اینکە رسم سامی پاشائی و نام نامی (مربان!) زمانرا، بر وجود شریف انعزیز کامل عیار میمون، و برفاهیت کافەء رعایا و برایا مقرون، لسان الغیب شیرازیرا گفتە است:

جهان و کار جهان جملە هیچ در هیچ است

هزار بار من این نکتە کردەام تحقیق

دوستان این زمانە همەرا (همزبان!) شاهراە رییند و، دام کید و خدعەء شیطان لعینند، بفریب انها از راە نروند، و بتلبیس نفس خسیس، و بمکر و اغوای ابلیس، بزینت بیهودەء دنیای دنیە، لقای محبوب حقیقی را، فراموش ننمودن از عقل دورانديش دور، و از شیوەء ارباب استقامت مهجور است، مامول این مسکین از شما (دروش!) پدر سبکتکین است بلکە با زیردستان اندک مروتی، و گاە گاهی فکر اخرتی، و با مولای خود اندی محبتی، پس انگاە دست ما و دامن دوست، امید از بندە و عفو از خداوند.

*(دەسنوس: 75 و 76)*

تێبینی: هەندێ وشەی دەسنوسەکە ساخ نەکرانەوە، لە بەر ئەوە تا بەراورد ئەکرێن لە گەڵ نوسخەیەکی تر، وەکو خۆی ڕونوس کران.

– 2 –

**دەقی فارسی نامەکەی مەولانا خالید بۆ مەحمودی برای:**

"محمود برادر خودرا با همە انحراف و بی استقامتها سلام رسانیم!

جناب قدوة الانجاب، وقرة عیون الاحباب، مولانا یحیی افندی، از طرف مخلص خاندان، زبیر پاشا، بتبریک و تهنیت مخلص قدیم، محمود پاشا، وارد اندولا شدند، دوسە روز کە در انسامان میباشند، چنانکە شیوەی این مهجور است، بقدر مقدور در ابادانی و غایة شروط میزبانیرا معمول داشتە، ظاهرا و باطنا حسن رفتار را بایشان عین رضای این مسکین دانستە، حجرەی خودرا در ان دوسە روز برای انجناب خالی نمودە، تا بسلامت بصوب مقصد راهی میشوند والدعا.

وعرض دستبوسی والدەی ماجدە با غایت انکسار بدمە شما معول است."

*(دەسنوس: 90)*

## -5-
## مەولانا لە سلێمانی (1230 - 1236 ک)

سەعید پاشا لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات دا گەنجێکی کەم ئەزموون بوە. گەنجێکی جوانی بەدناویش هاودەم و هاوکاری بوە. هاورەگەزبازی‌یان داوەتە پاڵ. زۆری کاربەدەستەکانی بەغدادی لە خۆی ڕەنجاندوە. هەندێکیان لە ترسی کوشتن هەڵاتون. یەکێ لەوانە داود پاشای زاوای بوە. داود هەڵاتوە بۆ سلێمانی بۆ لای مەحمود پاشا. کەوتۆتە کۆکردنەوەی هەمو دوژمن و ناحەزەکانی سەعید پاشا. سەرەنجامی روداوەکان دیار بوە. پێ ئەچێ لەو هەلومەرجە ئاڵۆزەدا خالید بەغدادی بە جێ هێشت بێ و گەڕا بێتەوە سلێمانی.

کەسایەتیەکی زۆر و هێزێکی زۆر لە داود پاشا کۆ بونەتەوە. داوایان لە بابی عالی کردوە سەعید پاشا لا ببا و ئەم دابنێ لە جێگەی. سەرەنجام داواکەیان گیرا بوە. فەرمانی دانانی داود پاشا دەرچوە. بە لەشکرەوە بەرەو بەغداد بە ڕێ کەوتوە کاروبار بگرێتە دەست. سەعید پاشا ملی نەداوە. سەرەنجام سەعید پاشا کوژراوە (1231 ک) داود بۆتە والی عیراق (1232 ک). مەحمود پاشا، کە هاوکاری داود پاشا بوە بۆ وەرگرتنی دەسەڵات بۆ پشتیوانی و پیرۆزبایی لە داود چۆتە بەغداد.

نوسەرانی بیۆگرافی مەولانا ئەڵێن، کە مەحمود پاشا چۆتە بەغداد، پلە و پایەی بەرزی مەولانای لە ناو کەسایەتیەکانی بەغدادا دیوە. داوای لێ کردوە بگەڕێتەوە سلێمانی. بەڵام روداوەکان دەری ئەخەن مەولانا پێش چونی مەحمود پاشا بۆ بەغداد گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی. جا مەحمود پاشا داوای لە مەولانا کرد بێ بگەڕێتەوە سلێمانی یان مەولانا خۆی داوای لە مەحمود پاشا کرد بێ ڕەزامەندی دەربڕی بێ بۆ گەڕانەوەی، مەولانا گەڕاوەتەوە سلێمانی. مەولانا پێش کوژرانی سەعید پاشا و پێش دانانی داود پاشا بە والی، گەڕاوەتەوە سلێمانی. مەحمود پاشا بۆ ڕێزنان لە مەولانا، پێش ئەوەی داود پاشا ببێ بە والی، مزگەوتێکی تازەی بۆ دروست کردوە (1230 ک)، کە مەولانا کردویەتی بە خانەقای ئیرشاد و شوێنی خوێندن. بۆ دابینکردنی پێویستیەکانی خانەقا و ژیانی خۆی چەردەیەک داهاتی بۆ تەرخان کردوە. *(ریاض المشتاقین: 147)*

ئەستێرەی خالید ڕۆژ بە ڕۆژ لە درەوشانەوەدا بوە. ڕۆژ بە ڕۆژ موریدو مەنسوبی لە زیاد بون دا بوە. خەڵکێکی زۆری لێ کۆ بۆتەوە. هێزێکی مەعنەوی و روحانی گەورەی پەیدا کردوە، بۆتە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی فراوان.

ریچ لە گەشتەکەی دا بۆ سلێمانی لە 24 ی حوزەیرانی (1820 ز/ 1236 ک) دا نوسیویێتی:

"سلێمانی سۆفیەکی گەورەی لێیە. ناوی شێخ خالیدە. کوردەکان پێیان وایە ئەگەر لە حەزرەتی مەولانا کەمتری پێ بوترێ، ئەنگیە و وتەکانیشی بە فەرمودە دادەنێن. لە خێڵی جافە و لە سەر ڕێبازی نەقشبەندیە. لە دەهلی لە سەر دەستی سۆفی بە ناوبانگ سوڵتان عەبدوڵادا بۆتە سۆفی. لە سەراسەری تورکیا و وڵاتە عەرەبەکان دا دوازدە هەزار موریدی هەیە. کوردەکان هەمویان بە وەلی دەزانن. زۆری تریشیان لە ریزی پێغەمەرەکەیان دا دای دەنێن. عوسمان بەگ پێی وتم: خۆی و مەحمود پاشا و زوربەی سەرانی کورد موریدی ئەون. چونکە بە لای کەمەوە لە گەڵ شێخ عەبدولقادری (گەیلانی. وەرگر) بە ناوبانگ دا لە یەک پلەدان."

*(ریچ، 142)*

**لێرەدا پرسیارێ دێتە پێشەوە:**

بۆچی تەریقەتی نەقشبەندی لەو ماوە کورتە دا لە سەر دەستی کوڕی خێزانێکی نەناسراوی چینی جوتیار دا بە چەشنێ پەرەی سەندوە بڵاوبونەوەکەی بۆتە "دیاردە" و دیاردەکەش بۆتە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی؟

بۆچی تەریقەتی نەقشبەندی وا بە خێرایی لە کوردستانی عوسمانی دا قەڵەمرەوی بابان، سۆران، بادینان و بۆتان و، لە کوردستانی قاجاری دا قەڵەمرەوی ئەردەڵان و موکریانی گرتۆتەوە. مەولانا لە هەر هەمویان دا بە سەدان خەلیفە و مورید و مەنسوبی دڵسۆزی لێ داڵاوە؟

بۆچی تەریقەتی نەقشبەندی بۆتە جێگەی مەترسی بۆ تەریقەتی قادری و. بۆ مەلاکانی سوننە و. لە دوایی دا بۆ دەسەڵاتی میرەکانی بابان؟

## سەرچاوەی داهاتی مەولانا

مەلا موچەی دیاریکراوی مانگانە یا ساڵانەی نەبوە. داهاتی مەلایەک، بە گوێرەی پلەی زانایی مەلاکە و گرنگیی مزگەوتەکە و، دەوڵەمەندی ناوچەکە. لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاواز بوە.

**سەرچاوەی داهاتی مەلای مزگەوت بریتی بوە لە:**

داهاتی ئەو وەقفانەی کە بۆ دابینکردنی خەرجی مزگەوت و ژیانی مەلاکەی، لە لایەن خێرومەندان و حاکمی ناوچەکەوە، تەرخان کراوە. داهاتی زەوی و گوند و کارێز و ئاشی ئاو و خان و خانو و دوکان و کتێب کراون بە وەقفی مزگەوت و مەلا.

زەکات و سەرفترە. برێکی دیاریکراو بوە. بە پێی شەرعی ئیسلامی، خراوەتە سەر سامانی گوێزراوە و نەگوێزراوە. ساڵانە وەرگیراوە.

سەرقەڵەمانەی نوشتە و گرێبەستی نیکاح و تەڵاق و خوێندنی یاسین و تەڵقین و، دابەشکردنی میرات.

مەولانا لە خێزانێکی دەوڵەمەند نەبوە. میراتی زۆری لە باووباپیریەوە بۆ بە جێ نەماوە. خۆی لە پەیجوریی دابینکردنی پێویستیەکانی ژیانی خۆی و بنەماڵەکەی دا بوە. مەولانا کە بۆتە مودەریسی مزگەوت لە جێگەی شێخ عەبدولکەریمی مامۆستای. ئەورەحمان پاشا، گوندی سەرگەت، کە سەر بە مەڵبەندی گولعەنبەر (خورماڵی ئێستا) بوە، بەرەو روی کردۆتەوە. حەمە خان و مەحمودی برا و دایکی چونەتە ئەوێ. خەریکی کشتوکاڵ بون. ئەم گوندە بە دەس حەمەخانی برایەوە ماوەتەوە، تا مەولانا کۆچی کردوە بۆ شام، وەکو مەولانا لە نامەکەی دا بۆ شێخ عەلی قازی ئاماژەی پێ داوە، ئەوسا لێیان سەندراوەتەوە. *(دەستنوس، 124 و 129)*

دوای گەڕانەوەی مەولانــا بــۆ ســلێمانی بــاری دارایــی مەولانــا قورســتر بــوە. ئەرکــی بەڕێــوەبردنی خانەقاکەی سلێمانی و، قوتابی و خوێندکار و، میوانەکانی، کەوتوتە سەر. ناچار بوە خــۆی دەس بخــاتە نــاو کاروباری دارایی بنەماڵەکەی و، چەردەی داهات و جۆری دابەشکردنی.

بە پێی نامەکانی مەولانا، کە بۆ کەســانی پێوەندیــداری نوســیوە، جــگە لە داهــاتی ســەرگەت، داهــاتی گوندەکانی هاڵە و دارتوی بۆ تەرخان کراوە. هاڵە و دارتو دو گوند بون سەر بە ناوچەی بازیان. دانەوێڵە و چەڵتوک و پەموی تێ دا بەرهەم هێنراوە. خۆیشی بە پارەی خۆی کارێزێکی لە وڵوبە هەڵکەندوە.

## کارێزی وڵوبە

یەکێ لە سەرچاوەکانی ئاو، کە دانیشتوانی شاری سلێمانی، چ بۆ پێویستی ناوماڵ و، چ بــۆ کشــتوکاڵ و کێڕانی ئاش، بە کاریان هێناوە، ئاوی کارێز بوە. کارێز دەستکردی مرۆڤ بــوە. نزیکــی پەنجــا کــارێز لە سلێمانی هەبوە. بە گــونج راکێشــراوە بــۆ مــاڵە زەنگینەکــان و حەوزی لە بەردەم دا دروســت کــراوە. حەمــام و مزگەوتەکانی سلێمانی لە سەر رێی ئــاوی کــارێز دروســت کــراون. خەڵــک ئــاوی کــارێزی بە خــۆڕایی لە مزگەوت و حەمام بۆ پێویســتی ماڵەکانیــان بــردوە. بەو بــۆنەیەوە وتویــانە: "فــلان پیــاوەتی بە ســەر ئــاوی حەمامەوە ئەکا!"

کارێز لە لێژایی دا لێ دراوە. لە بناری شاخی گۆیژەوە بیر بە ریز، چەند مەترێ دور لە یەکتر بە دوای یەک دا، هەڵکەنراوە تا دامێنی خوارەوە. بیرەکان، بۆ ئەوەی ئاوەکانی کۆ بکرێتەوە، لە ژێــرەوە بە تــونێلێکی درێژ پێکەوە بەستراون. لە نزیک دواپین بیری لێژاییەکە دەرگای تونێلەکە بە بەرد هەڵ چنراوە و، ئاوەکەی بە جــۆگە، یــا بە گــونج راکێشــراوە بــۆ شــوێنی مەبەســت، یــان دەســتێلێ لە بەر دەم دا کــراوە ئــاوەکەی تێــدا کۆکراوەتەوە بۆ بەکارهێنانی. پرۆژەی کارێزکەنی پێویســتی بە توانــای دارایــی و کەســی لێــزان و وەســتای شارەزا و کاری پشودرێژ هەبوە.

مەولانا لە سەر کیســەی خــۆی کــارێزێکی لە گونــدی وڵــوبە هەڵکەنــدوە. وڵــوبە گونــدێ بــوە لە لای خواروی شاری سلێمانی. لە سەر خاوەنێتی زەویەکانی بەردەمــی ئەم کــارێزە توشــی کێشــە بــوە. پــێ ئەچــێ نەیارەکانی کەسانێکیان لێ هان دابێ گێچەڵی پێ بکەن. کێشــەکە بــراوەتە بەردەم قــازی بــۆ ئەوەی بە پــێی شەرع یەکلایی بکاتەوە. قازی هەقی داوە بە مەولانا. مەحمود پاشا بڕیارەکەی قــازی شــەرعی پەســند کــردوە، زەویەکانی بە "اقطاع الرقبة" بۆ رەزای خوا داوەتە مەولانــا. لە بەڵگەیەکــی نوســراو دا (*دەستنوس: 134*) ئەو کێشەیە بەمجۆرە رون کراوەتەوە:

مەولانا، لە پایینی شاری ســلێمانی، لە دەوری کێڵگەکــانی گونــدی وڵــوبە، کــارێزێکی "احــداث و حفــر" کردوە. وا باو بوە کە ئاو سوڵتانە. واتە ئاوەکە موڵکی کێ بێ ئەو ئەرزانەی کە ئەکەوێــتە ژێــر ئــاوەکەوە، لە دێمەوە ئەبێتە بەراو، دەسەڵاتی بە کارهێنانی ئەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی خاوەنی ئــاوەکە. واتە دوای هەڵکەنــدنی کــارێزەکەی وڵــوبە، ئەو ئەرزانەی کەوتــونەتە بەردەمــی ئــاوی کــارێزەکە، چانــدن و کــێڵان و بەرهەمهێنــانی کەوتونەتە ژێر دەسەڵاتی مەولانا و کرێکارەکانی. ئەویش داوێتی بە ئیجار.

کەسێ بە ناوی عەلی قەساب ئیدیعای خاوەنێتی ئەو زەوییانەی کــردوە. زەویەکــان پــێش هەڵکەنــدنی کارێزەکە دێم بون و، دوای ئەوە بونەتە بەراو، عەلی قەساب ئیدیعای خــاوەنێتی ئەو زەویــانەی کــردوە، لای سەرکارەکانی گوندەکە شکاتی کردوە، گێچەڵی بەردەوامی بە مەولانا و کرێکارەکانی کردوە.

بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەی دەسەڵاتی بە کارهێنانی زەویەکــان لە نێــوان مەولانــا و عەلــی قەســاب دا، مەولانــا پــێی بــاش بــوە بــۆ بەجێهێنــانی: "مــروەت و عەدالەتگوســتەری و شــێوەی دیــانەت و صــیانەت و

رەعیەتپەروەری" واپێویستی کردوە "بێ هیچ تێبینی و تەرەفداری کەسێک نەبێتە مانیعی مورافەعەی شەریعەتی غەرا" پرسەکە "حەواڵەی شەرعی ئەنوەر" بکرێ.

"پاش ریعایەتی مەسەلەی شەرعی مەعلوم بوو". کە عەلی قەساب. "دەعوای ناحەق ئەکا. ئەو هەموو لایە و نیزتیراب و بێ قەراری و عەجولیەی کە نوانندویەتی تەنیا لە سۆنگەی مەکرئەنگێزی و حیلەئامیزییەوە بوە" بەوەش ویستویەتی "بێ وەجهی شەرعی بە فریب و خدعە و تەلبیس" زەویەکانی کە هی مەولانا بوون بکا بە هی خۆی. دەرکەوتوە کە ئەو زەویانە "ئەسڵەن وە لا قەتعەن پێوەندییان بە عەلیەوە نیە" و "ئیعلامی قازی موشتەمیل بە بوطلانی دەعوای ناوبراوە و بەرائەتی ئەستۆی" مەولانا "لە ئیفتەرایەک کە عەلی دابویە پاڵ مەولانا" دەرکەوتوە.

لە سەر ئەو بڕیارە زەوییەکان بە "عینوانی اقطاع الرقبە و تملیکی ابدی" بڕاوەتەوە بۆ مەولانا. سنورەکانی لای سەروی و خواروی و رۆژهەڵاتی و رۆژئاوای دیاری کراون. کاربەدەستانی گوندی وڵوبە و ناوچەکەش راسپێردراون بڕیارەکە بە قازانجی مەولانا جێبەجێ بکەن. و. رێگە نەدەن لەوە بە دواوە کەس تۆخنی ئەو زەوییانە بکەوێ." (دەستنوس: 135)

**چەند تێبینیەک:**

لەم بەڵگەیەدا لە هەرجێ ناوی مەولانا هاتبێ. بە "حەزرەتی مەولانا زیاندین - قدس سرە یا قدس سرە العزیز -" ناو براوە. ئەمە نیشانەیە بۆ بەرزی پلەی دینیی و پایەی کۆمەڵایەتی مەولانا لەو کاتە دا.

گێچەڵی عەلی قەساب بە مەولانا. وەکو لێکۆڵینەوەی دادگا دەری خستوە بێ بنەما بوە. دروستکردنی ئەو گیروگرفت و کێشانە. ئەشێ لەو چوارچێوەیەدا بو بێ کە نەیارەکانی مەولانا لە سلێمانی سەروەر دروستیان کردوە بۆ ئەوەی هەمیشە ئازاری بدەن تا لە سلێمانی دەری پەڕێنن.

لەو سەردەمەدا. کە دەسەڵاتی میرایەتی بابان بوە. کار بە سەرەتای "اقطاع الرقبة" کراوە بۆ خاوەنێتی زەویوزار. هێشتا رێوشوێنی "تۆماری تاپۆ" نەبوە و کاری پێ نەکراوە.

بە هۆی ئەم کارێز و زەوییانەوە مەولانا لە گەڵ چەندین کەس سەودا و رەفتاری کردوە ناوەکان و نازناو و پیشەکانیان جێگەی سەرنجە. لەوانە:

**لە نامەیەک دا کە بۆ یوسف زێوەیی، باوکی هاوسەرەکەی - خەزوری، نوسیوە، بە توڕەییەوە پێی ئەڵێ:**

"لە ناومالی خۆت دا دەسبردن بۆ نێچیر و بە زۆر راکێشانی قەتا زۆر نامەعقولە. بەلام لە بێ ئەقڵی ئێوە ئەم جۆرە رەفتارانە رو ئەدەن.

دوەم. فەرمانم دابوو بە ئیسماعیلی زەنبوەرکچی کارێزەکە هەڵ بکەنێ. ئێوەش لە بەرهەمی کارێزەکە پارەکەی بدەنێ. ئیستە نازانم ئێوە پارەکەتان نەداوەتێ یا ئیسماعیل دریخی کردوە؟ وەڵام رەوانە بکەن.

سێیەم. حەمە خانم تەمێ کردوە بڕواتە لای کەیخوسرەو بەگ. ئەو لە کاغەز و موریدەکان باشترە. والدعا"

(دەستنوس: 130)

**لە نامەیەکی تر دا کە بۆ عەلی چاوەش، سەرکاری گوندی وڵوبەی نوسیوە، ئەڵێ:**

"پارچە زەویەکی کەوتۆتە ژێر ناوی کارێزەکەی ئەو "مسکین" ە. مەبەستی خۆیەتی. کە بە تەنیشت ئاشی مەحمود کەچەڵەوەیە. بە گرێبەستی کرێ لە "عالی جەناب مەلا ئەحمەد" ی وەرگرتوە. ئەگەر بە ناوی کارێزەکەی ئەو کشتوکاڵی تێ دا کرد. لە وەرزی هەڵگرتنی بەروبومی ساڵەکەدا "بیست مەن گەنمی بازاڕ" ی بدرێتێ. ئەگەر بە ناوی کارێزەکەی ئەو شیناییی تێ دا نەکرێ. خۆیان نازانن لە بەکارهێنانی ئەرزەکە دا.

ئەم گرێبەستە لە غورەی رەبیعەلئەوەلی 1231 دا کراوە. ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە لەو ساڵەدا کارێزەکە تەواو بوە و، بە کارهێنراوە و، مەولانا بۆ گوزەرانی خۆی سودی لە داهاتەکەی وەرگرتوە.

(دەستنوس: 128)

**لە نامەیەکی تری دا کە بۆ ئیسماعیل زەنبوەرکچی نوسیوە، ئەڵێ:**

"جەنابی.. مەلا ئەحمەد. پێش ئەوە گورونی مەنزڵچی یەک پارچە زەوی لە ئەرزەکانی گوندی وڵوبەی دابو بەو. ساڵی پار رەسولی تۆپچی باشی. کە داروغەی وڵوبە بوە. ئەرزی مەزبوری لە داوبراو سەندۆتەوە و. هەڵبەتە بە هەر جۆرێ بێ رەعیەتەکانی گوندەکەی رازی کردوە. پارچە زەوی مەزبور لە گەڵ پارچەیەکی تر کە لە خوار ئاشی میرزا ئاغادایە بە عالی جەنابی داوبراو بسپێرن. مایەی خۆشنودی ئەم مسکینە و سەوابی ئاخیرەتی ئێوەیە. والسلام والاکرام".

(دەستنوس: 119)

دازناوی کەسانی پێوەندیداری ئەم نامەیە: زەنبوەرکچی، مەنزڵچی، تۆپچی باشی، داروغە.. پلەی سپایی چەکدارەکانی پاشای بابان بون. یەکێ لە شێوەکانی بەڕێوەبەرایەتی پاشاکانی بابان، بریتی بوە لەوەی لە جیاتی موچەی مانگانە یا ساڵانە بدەن بە فەرمانبەر و کاربەدەستەکانیان، ئەوانیان کردوە بە برابەشی داهاتی جوتیارەکان. ئەوەش چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتی و روتاندنەوەی دابوری، هەم دارایی و هەم بەروبومی، جوتیارەکانی لێ کەوتۆتەوە.

**لە نامەیەکی دا کە بۆ حەمەخانی برای نوسیوە، ئەڵێ:**

"لەم کاتەدا رەئی ئەم مسکینە لە سەر ئەوە گیرساوەتەوە، کە ئێوە هەقتان بە سەر زەکاتی رەعیەتەکان و کوردەکانی هاڵەوە نە مێنێ. دەروێش حسێن مان ناردوە زەکات و سەفترە لە عالەم کۆ بکاتەوە.

زەکاتی "ئەغنام" بۆ تۆیە.

جگە لەوەی ئێوە، بە پێی شەرعی شەریف هەموی دوای کۆکردنەوەی رادەستی نەقیبی خانەقای موتەبەڕیکە، مەلا عەبدوڵای هیرەوی، بکری. هیچ موخالەفە و خودداریەکتان لێ قوبوڵ ناکەم."

(دەستنوس: 129)

مەبەست لە رەعیەت جوتیاری گوندنشین و مەبەست لە کوردەکان دەوارنشینەکانی ناوچەکە بوە.

زەکات لە بەروبومی کشوکاڵ و ئاژەڵ بەشێ بوە لە سیستەمی باجگیری، جوتیار و ئاژەڵدار ئارەزومەندانە نەیان داوە، هەمو ساڵێ لێیان سەندراوە.

**لە نامەیەکی تری دا کە دیسان بۆ حەمەخانی برای نوسیوە، ئەڵێ:**

"ئەگەر دۆستی خوا بن هەمو کارەکانی دنیا و دینی ئێوە بە موراد ئەبێ.

وە ئەگەر هەرچی ئارەزوی نەفسانی خۆتان بێ بەوجۆرە بکەن. گیانی پیرانی مەزن ئازار ئەدەن.

ئەگەر بتەوێ بگوێزیتەوە بۆ ئەردەڵان لەم لایەنەوە رێ پێ دراون.

برایەتی و دۆستایەتی ئەم مسکینە بە بێ وازهێنان لە هەوا و فەرمانبەری خودا و رەسول بە جێ نایەت. والسلام"

(نامە: 127)

**لە نامەیەک دا بۆ مەحمود قاپی و ئیسماعیل زەنبوەرکچی نوسیوە، ئەڵێ:**

"گامێشەکانیان سەعاتی یەکەم لە گوندی هاڵەوە هێناوە هەمویان فرۆشتوە. پارەکەیان بە تەواوی بردوە. بیهێنن بۆ ئێرە. زۆر زەروریە. دەفتەری بەروبومی گوندی هاڵە بە تەواوی لە دانەوێڵەی نیوەکارەکان و چەڵتوک و پەمو تۆمار بکەن و لە گەڵ خۆتان بیان هێنن. هەموی تەسلیمی موسای حاجی رەحیم بکەن. قبوڵ ناکەین دەنکێکی و پەرە کایەکی بدرێ بە حەمەخان و. هەڵبەتە بە حەمەخان بڵێن کە بەو چەشنەی ماڵەکەی خۆی گوێزاوەتەوە بگەڕێتەوە سەرگەت. ئەگینا بۆ ئەو باش تێ نا پەڕێ."

**لە برگەیەکی تری نامەکەی دا بە گلەییەوە نوسیوێتی؛**

"حسێن پاوەیی چ جۆرە خزمەتکارێکە کە بێ فەرمانی ئەم لایەنە بەروبوم ئەدا بە حەمەخان. ئەگەر ژیانە چاو بە چاو ئەکەوێتەوە." والدعا.

لە بەشەکەی تری نامەکەی دا تەگبیری بۆ کردون. چۆن وڵاخ لە دۆستەکانی: شێخ ئیسماعیل و شێخ ئەحمەدی سۆڵە بخوازن و، مەحمود و یوسف زێویەیی و محەمەد حەسەن ئەفەندی و بایەزید و مەحمود شێخە و دەروێش محەمەد. لە گەڵ بەهادینی کوری. کە لەو کاتەدا مناڵ بوە. و خێزانەکەی بگوێزنەوە بۆ لای ئەو.

ڕەنگە ئەم نامەیەی دوای بەجێهێشتنی کتوپڕی سلێمانی لە بەغدادەوە نوسی بێ. *(دەسنوس: 121 - 122)*

**لە نامەیەک دا بۆ موسای حاجی رەحیم، سەرۆکی بازرگانەکانی سلێمانیی، نوسیوە ئەڵێ:**

"دۆستانی وەفادارم بە دو کەلیمە یاد و شادمانیان کردوم و دەریان خستوە کە هەندێ قەرزیان داوەتەوە زۆر خۆشنود بوم. بەڵام ئەم مسکینە کاتێ ئامادە بوم مبلغی پازدە کیسەم لەوێ حەواڵەی ئێوە کرد و. بەروبومی ئەمساڵم بە ئێوە سپارد کە کەسێ دەخلی تیا نەکا. ئێستا ئەبیستین حەمەخان بە خودسەری. بێ ئیزنی ئەم فەقیرە. ئەیەوێ پەموی گوندی هاڵە بیبا. هەرگیز ئەم خودسەری و بێ دەربەستیە. نە لە ئێوە و نە لە حەمەخان. قبوڵ ناکەین. هەڵبەت قۆزاخەیەک پەمو بە حەمەخان نەدەن. ئەم رەفتارە گەوجانەیە پەسەند ناکەین و ئەگەر مویەک سەرپێچی بکەن ئەنێرم ماڵی حەمەخان دوبارە بیەنەوە بۆ سەرگەت.

پێویستیی زۆرم بە برێ پارە هەیە. والدعا."

*(دەسنوس: 107)*

**لە نامەیەکی تری دا، کە پێ ئەچێ لە سەرەدەمی دورکەوتنەوەی لە سلێمانی، بۆ ئوستاد یوسف و ئەسەدولای نوسی بێ، ئەڵێ:**

"لە دانەوێڵەی دارتو. میقداری بیست تەغار دانەوێڵە بە "چارەک بالمناصفە" هەمو ساڵێ. بدەن بە دڵسۆزانی فەدەوی. حاجی ئەحمەد و ئەورەحمان کوڕانی حاجی سلێمان و. خۆت لە خزمەتی فەقیر و. کۆکردنەوەی دانەوێڵە و بەروبومی ئەملاکی فەقیر دا کۆتایی نەکەن. خۆتان لە سەرکێشی و بێ ئەدەبی لابدەن و سەری مویەک زاهیر و باتین سەرپێچی ئێمە نەکەن. بۆ ئێوە مەترسی تەواوی هەیە. دوریی زاهیریی ئێمە ئێوە غەڕا نەکا.

ئیتر هەر ساڵێ ئەبێ زەکاتی دانەوێڵەی کارێزی پایینی شار بە تایبەتی بە ئەحمەد بدەن. تا ئیمتیازی خۆی بزانێ. والسلام."

*(دەسنوس: 135)*

**لە نامەیەکی دا کە بۆ مەلا ئەحمەدی باوزێی نوسیوە، ئەڵێ:**

"هەلگری نامە ئیدیعای نوێنەرایەتی و، پەشیمانی لە کارە ناپەسەندەکانی ئەکا و، ئەڵێ لە وەرزی زستان دا گواستنەوە گیروگرفتی هەیە و، ئەگەر مەلا ئەحمەد تا وەرزی وشکی بە تەواوی لە کرداری ئێمە رازی نەبو، ئێمە خۆمان بار ئەکەین. لە بەر ئەوە ئەگەر متمانەت بە بەڵێنی کابرا نەکەی وازیان لێ بێنن."

**لە هەمان نامەدا داوای لێ ئەکا:**

"بە زویی ئەسپەرە و کلکی بێڵەکان بنێرێ." (دەستنوس: 131) ئەسپەرە و کلکی بێڵ بۆ راکێشانی جۆگا و جۆماڵ و ئاودانی کشتوکاڵ، بە کار هێنراوە.

**لە نامەیەکی تر دا کە بۆ مەحمودی برای نوسیوە، ئەڵێ:**

"هەندێ لە خۆشەویستانی ئەوێ پێیان باشتر بو کە بەروبومی ئەمساڵ لە گوند نەهێڵرێتەوە، لە شار، لە خانویەکی نشیمەن دا، کە چۆڵ بێ، کۆ بکرێتەوە پارێزراوترە. تا بە خاوەنی مافەکانی ئەگات. لەم بارەیەوە بۆ محەمەد حەسەن جەژنانی م نوسیوە. دوژمنایەتی و کێشەی لە گەڵ دروست مەکەن."

**لە بەشێکی تری نامەکەی دا نوسیویەتی:**

"قەرزەکانی ئێرە زیادی کردوە ئاگاتان لەم لایەش بێ خراپ نیە."

لەم نامەیەدا بێزاری خۆی دەربڕیوە لە دەس کێشمەکێشی کەسە پێوەندیدارەکان، کە گەیشتۆتە رادەی بێ ئەدەبی و، داوا ئەکا ئەو بەزمانە بەرەوروی "ئەو فەقیرە" نەکەنەوە بۆیە "بۆ محەمەدی نوسیوە، سی تەغاری لادێ دانەوێڵە، بدەن بە حەمەخان. ئەگەر بە باشی نەزانی خۆی بێتە کارەکەوە، با کەس و وڵاخ بنێرێ بی بات.."

(دەستنوس: 89)

**لە نامەکانی مەولانا خالیدا دەرئەکەوێ:**

**یەکەم**، ئەو کاتەی لە سلێمانی بوە و دوای ئەو کاتەش کە کۆچی کردوە بۆ بەغداد، هەمیشە کێشەی لە گەڵ حەمەخانی برای دا هەبوە. حەمەخان ناوی مەولانای بۆ قازانجی خۆی بە کار هێناوە و، دەستی بردوە بۆ بەشی مەولانا و خەڵکی تر لە داهاتی ساڵانە.

**دوەم**، باسی دەسکورتی و هەندێ جار قەرزاری خۆی کردوە، بەڵام ئامۆژگاری خێزانەکەی و خەلیفەکانی و موریدەکانی کردوە، سەربەرز بن و بۆ "جیفەی دنیا" خۆیان سوک نەکەن.

**سێیەم**، مەولانا لە کاروباری دارایی خۆی و بەڕێوەبردنی بەرژەوەندیەکانی دا ناوی ژمارەیەکی زۆر کەسانی جیاوازی هێناوە، کە پێوەندی‌یان لە گەڵ ئەو بابەتە هەبوە، لە ناو ئەوانەدا خەلیفە و مورید و وەستای تێدایە. کە ئەو رای سپاردون بۆ ئەنجامدانی کارەکانی. بەڵام لە ناو ئەوانەدا موسای حاجی رەحیم، سەرۆکی بازرگانەکانی سلێمانی، کە موریدێکی دڵسۆزی خۆی بوە لە هەمویان زیاتر. جێگەی متمانەی بوە. چەندین جار ناوی هاتوە.

**چوارەم**، جۆری ژیانی شێخی تەریقەت و جۆری پەیداکردنی سەرچاوەی داهات بۆ دابینکردنی پێویستیەکانی گوزەران و خەرجی ئەرکەکانی، بەوەی پشت ببەستێ بە بەروبومی زەوی کە بەرهەمی کاری جوتیار بێ، زەمینەی خۆشکردوە بۆ ئەوەی شێخی تەریقەت بگۆڕێ بۆ خاوەنی زەوی و گوند و، لە رابەری روحیەوە بگۆڕێ بۆ دەرەبەگی زەویدار. ئەمەش بە تێپەڕینی زەمان. لە ناو کۆمەڵی کوردی دا، توێژێکی

زەویداری نوێی بەرهەم هێناوە. بە تەنیشت توێژە زەویدارە میراتیەکانەوە لەوانە: بنەماڵەی میـر و خانەکـان، ئاغـا و بەگەکـان. سـەرەنجام سیسـتەمی شـێخایەتی تەریـقەت بـۆتە شـێوەیەکی دروسـتبونی سیسـتەمی دەرەبەگایەتی زەویدار.

## مەولانا و کتێب

هەرچەندە لەو سەردەمەدا چاپ لە ئەوروپا بڵاو بـوە و، لە هەنـدێ وڵاتـی عەرەبـی و ئیسـلامی دا، بە کـار هێنراوە. بەڵام هێشتا دەزگای چاپ نەگەیشت بوە کوردستان. تەنانەت نەگەیشت بوە بەغداد. کتێبی چـاپکراویش نەگەیشت بوە بازاڕی کوردستان. تەنیا ڕێگەی زیادکردنی کتێب هەر نوسینەوەی بوە. لە بەر ئەوە ژمارەی کتێـب کەم و دەگمەن و، نرخی نوسینەوە زۆر و کڕینی گران بوە. زۆر جار بۆ ئەوەی سەرچاوە بۆ فەقێ و مەلا دابـین بکرێ، وەکو کارێکی خێرخوازی کتێب وەقف کراوە و، بۆ خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی دەستاودەستی پێ کراوە.

مەولانـا خالیـد سـەرەڕای سـەرقاڵی ڕۆژانەی بە کاروبـاری ئیرشـادی تەریـقەت و بینینـی خەڵـک و پەروەردەکردنی خەلیفە و موریدەکانی، لە نامەکانی دا دەرئەکەوێ هەمیشـە بە دوای کتێـبەوە بـوە و، لە کتێـب دانەبڕاوە. هەندێکی پەیدا کردوە و کڕیوە، هەنـدێکی بە نوسـینەوە داوە، هەنـدێکی بە دیـاری بـۆ هـاتوە. لە نامەکانی و لە نوسینەکانی دا، وەکو سەرچاوە، ئاماژەی بە چەندین کتێبی گرنگی بواری زانستەکانی دینیی و تەسەوف کردوە.

مەولانـا ڕۆژانە پێویسـتی بە کتێبەکـانی بـوە. هەنـدێکی بـۆ گفتوگـۆی بـابەتی شـەرعی و فیقهـی و تەریقەتی، لە گەڵ زاناکانی هاوشانی خۆی و، هەندێکی تری وەکو سەرچاوە لە نوسینەکانی دا بە کار هێنـاوە بۆ سەلماندنی بیر و باوەڕەکانی.

کە لە بەغدایش بوە چاوێکی لە سەر کتێبەکانی کوردسـتانی بـوە. چەنـد جـارێ داوای کـردوە بـۆی ڕەوانە بکەن و، هەندێ جار بە ناو کتێبەکانی دیاری کردوە کە لای کـێن، بـۆ ئەوەی وەری بگـرنەوە و بـۆی بنێرن. هەندێ جار کاغەز و پارەی دابـین کـردوە بـۆ نوسـەرەوەی کتێبـێ کە بە نوسـینەوەی داوە. داوای لە نوسەرەکە کردوە چەندی تەواو کردوە بۆی بنێرێ.

مەولانا کتێبەکانی بە بەشێکی گرنگ لە سامان و داراییەکانی ژماردوە.

### بەشێ لە نامەکانی دەربارەی کتێب و کتێبەکانیتی.

لە نامەیەکی کە بۆ میرێکی بابانی نوسیوە، دەربارەی بە کارهێنانی نامەشروعی کتێبی دینیی، داوای لێ کردوە، کتێبی "شرح العباب" ی بۆ بنێرێتەوە، کە هی مەلا محەمەد سابق بوە و، بە ئەمانەت لای مەولانـا بـوە. "وکەلای عالی" کە یەکێ لە میرەکانی بابان بوە، بە ئەمانەت لە مەولانای خواسـتوە. بە سـەری دا مەلا مـحەمەد مردوە. منداڵەکانی وەکو بەشـێ لە میراتـی باوکیـان داوای کتێبەکەیـان لە مەولانـا کـردۆتەوە. "وکەلای عـالی" کتێبەکەیان بۆ نەناردۆتەوە. لەو بارەیەوە نامەیەکی بۆ پاشای بابان نوسیوە، ئەڵێ:

> "بە کـار هێنـانی کتێبـی دینـی بە شـێوەیەکی "نامەشـروع" کـارێکی نـاڕەوا و هەرەشـەیە بـۆ بەکـارهێنەرەکەی." داوای کـردوە کە یـان بـۆی بگێـڕنەوە تـا بیـداتەوە بە خـاوەنەکەی، کە خێزانەکەی مەلای ناوبراون. یا ناچارە خۆی بە پارە بۆیان قەرەبو بکـاتەوە، چـونکە بە پـێی شەرع: "عاریە در ضمان مستعیر است بهر وجە کە تلف شـد." واتە، شـتی خواسـتراو، بە هەر هۆیەک بفەوتێ، بژاردنی لە ئەستۆی وەرگرنایە.

*(دەستنوس: 64. نامە: 19)*

ئامۆژگاری شێخ لوتوفوڵا ئەکا کە بەشێکی کتێبی "تهذیب" ی بە خەتی خۆی بـۆ نوسـیوە و بە دیاری بۆی ناردوە، کتێب چۆن بنوسێتەوە و وردبینی تێدا بکا.

(نامە: 93)

لە نامەیەکی دا کە بۆ مەلا ئەحمەدی بـاوزێ و مەلا عەبـدولعەزیزی ئیسـماعیل ئاغـای نوسـیوە، داوایان لێ ئەکا کاغەز بدەن بە لا مەحمـود بـۆ ئەوی کتێبەکـانی "اشـکال" و "شمسـیە" ی بـۆ بنوسێتەوە. هەروەها کتێبی "شرح نخبە الفکر" یشی بدەنێ بۆ هەمان مەبەست.

(نامە: 39. دەستنوس: 94 و 37)

داوای لە مەلا محەمەدی خورماڵی کردوە کتێبی "فتح المبـین" ی بـۆ بنوسـێتەوە و، چەنـدی لـێ تەواو کردوە بۆی بهێنێ. هەروەها داوای لە شێخ ئیسـماعیل کونەکـوتری کـردوە لە گەڵ خـۆی کتێبی "مواهب" ی بهێنێ و، هەر کات کتێبی "اعلام" یش تەواو کرا ئەویش لە گەڵ خۆی بۆ بیا.

(نامە: 120 . دەستنوس: 180)

لە نامەیەکی دا کە بۆ، شێخ عەبدولقادری برای شێخ عەبدوسەمەدی قازی نوسـیوە، داوای وەرگـرتنەوەی کتێبەکانی کردوە، کە هەریەکەی لای یەکێ لە دۆست یا شاگردەکانی بوە. ئەڵێ:

"رشحات" لای مەلا محەمەدی مەلا سـابقە، "حاشـیەی سـیوطی" لای حسـێنی سـیتەکیە، "روضـە" لای شێخ عەبدوڵڵەتیفە، "مقامات" لای مەلا ئەورەحمانی قەرەداخیە، لە گەڵ هەمو کتێبەکانی تر ئەمانەوێن."

(دەستنوس: 95. نامە: 44)

مەولانا لە کۆچەکانی دا هەمیشە لە خەمی کتێبەکانی دا بوە. کاتێ کوچی کردوە بۆ بەغداد، لە نامەیەکی دا کە بۆ هاوسەرەکەی، وەکو خۆی ناوی هێناوە: "زەعـیفەی عەفـیفە، هەمخـوابەی شـەریفە، کچـی یوسـف" ی نوسیوە دەربارەی چونی خێزانەکەی بۆ بەغداد، داوای لێ کردوە:

"... هیچ کتێبێ بە جێ نە هێڵن، هەموی بهێنن..."

(دەستنوس: 57)

هەروەها کاتێ کۆچی کردوە بۆ شام، لە نامەیەکی دا کە بۆ محەمەد ئەسعەد ئەفەندی نوسیوە ئەڵێ:

".. وعلی کل تقدیر، کتێبەکان لە گەڵ یەکەم قافڵەدا رەوانە بکەن. پێویستیەکی زۆرمان بە کتێب هەیە..."

(دەستنوس: 19)

دو جار، کە گومانی لە گەڕانەوەی هەبوە لە سەفەر، کتێبەکانی، کە لای ئەو سەرمایەیەکی بە نـرخ بـون، وەقفی تایبەتی بنەماڵەکەی و گشتی خەلیفەکانی کردوە:

- جارێک، کە ساڵی 1241 کە بۆ جاری دوەم لە شامەوە چوە بۆ حەج،
- جارێکی تر، ساڵی 1242 کە نەخۆشی تاعون لە شام لێی داوە، نزیکی مرد بۆتەوە.

## مەولانا و کتێبی "اطباق الذهب".

لە ناو لیستی سەرناوی نوسینەکانی مەولانا دا باسی نوسـینی چەنـدین بـابەت و چەنـدین حاشـیە و شەرحی کتێب ئەکەن، کە هێشتا بڵاو نەکراونەتەوە، لەوانە:

- شەرحی "مەقامـاتی حەریـری" گـوایە، ئەمەی بەر لە سـەفەری هیندسـتان دەس پـێ کـردوە، بەڵام تەواوی نەکردوە.
- شەرح و تەرجومەی "اطباق الذهب".
- "اطباق الذهب فی المواعظ البلیغة"، کتێبـێکە پێکهـاتوە لە سـەد "مقالـة" ی وەعـز و ئامۆژگـاری. لە نوسینی شرف الدین عبدالمؤمن بن هبةالله المغربی الاصفهانی، کە ساڵی 600 ک مردوە.

چەند جارێ لە هیند و میصر و لوبنان چاپ کراوە.

تەرجومە و شەرحەکەی مەولانا هێشتا لە بەر دەس دا نیە. ئەم بەرهەمەیان، ئەبێ چیرۆکێکی جیاوازی هەبێ لە بەرهەمە نوسراوەکانی تری مەولانا. چونکە وەکو لە نامەکانی دا دەر ئەکەوێ، لە سەر داوای مەحمود پاشا ئەنجامی داوە.

مەولانا لە نامەیەکی دا بۆ مەحمود پاشای نوسیوە، سەرەتاکەی بە ستایشی پاشا دەس پێ ئەکا، ئینجا ئەنوسێ:

"نەوازشنامەی پڕ لە ئادابی مەکاریمی ئەخلاق بە یادداوەری ئەم گۆشەنشینەی زاویەی سوتان.
کە ئاماژەی تێ دا بو بە داوای تەرجومەی کتێبی اطباق الذهب، نوسیبوتان و نارد بوتان.
ئەم مسکینە بە هۆی بەدبەختیەوە کە لە چارەی عەریزەی دڵسۆزانەوە دەرئەکەوێ، نوسرانی رونوسی گۆرین بە جوان نازانێ. و کەسێکی خۆشخەت کە ئێستا لە دەسوپێوەندەکانی ئەم بینەوایە لێرە ئامادە بێ ئیسماعیلە. دوای تەشریفبردنی ئەو کەریمی کوڕی کەریمە بیمار و سەقیم بوە. هەمو ئامادەبوانی تری ئێرە خەتەکەیان مایەی مەعیوبی ئەبێ. لە بەر ئەوە ئەبێ یا ئاماژە بفەرمون کە لێرە کەسێکی خۆشنوسی وەکو شێخ محەمەد یا شێخ مەولان بەم مسکینە بگا. هەرچی ئەڵێم بینوسێ وەکو لە کاتی تەرجومەی کتێبی گۆرین دا لە لایەن وکەلای عالی فەرمان کرا بو، یان چاوەڕێ بفەرمون. تا بە خێر سەید ئیسماعیل لە پێخەفی نەخۆشی هەڵ ئەسێتەوە. ئەگەر ئەش فەرمون بە خەتی خۆم بینوسم و لە بەدنوسی سڵ ناکەن راوەستاوی ئیشارەتین. پێویست بو بابەتەکە عەرز بکرێ. بە هەرچی راستبینینی رەئی گرێکەرەوە بێ ئەیکەین.
زیادە سەرئێشە ئەبێ. بە دوعا کۆتا بێ پشتئەستور بە پشتیوانی ئاستانەی ئیلاهی بێ.
والسلام.

(دەسنوس: 38 - 39)

مەولانا کارەکەی ئەنجام داوە. دیارە مەحمود پاشا بە دڵی نەبوە. وەکو لە نامەیەکی تری مەولانادا دەر ئەکەوێ، جارێکی تر بۆی ناردۆتەوە. بەم بۆنەیەوە نوسیوێتی:

"دوای حک و ئیسلاحی ریسالەی "حاوی المقالات"، عەرز بێ، لە روی ئیلتیفاتەوە نوسخەی "اطباق الذهب" دوبارە بە عینوانی تەواوکردنی تەرجومە و حک و ئیسلاح رەوانە فەرمورا بو، سەرەڕای سەرقاڵی زۆر و، زۆری ئاڵوگۆری حاڵ، بە پێی گونجانی کات بۆ راستکردنەوەی کتێبی ناوبراو کۆشش کرا، ئەوەندەی شایستەی تەرجومە بێ لە هەڵهێنانی وشەی ناناشنا و رونکردنەوەی تلمیحاتی سەیر، لە نێوان دێڕەکان و پەراوێزی کتێبی ناوبراودا، نوسیمان.
بەڵام چونکە جگە لە یەک نوسخە لەم وڵاتەدا بە دەست نەهات، ئەویش پڕە لە هەڵە و، خۆی نوسەری تەرجومەی گۆرین نەبوە. ئەگەر کەموکوڕیەک لەوەدا روی دابێ بە هیوای لێبوردنە، هەروەها تەفسیلاتی کتێبێکی وەها بە بێ شەرحی درێژ تەنیا بە تەرجومەکردنی رون نابێتەوە، بەڵام "ما لایدرک کلە، لا یترک کلە".
لە کاتی بەکارهێنانی دا ئەگەر ئێلیەک بە بیری شەریف دا هات، کاتی یەکتربینین لە دڵسۆزی خۆت پرسیار بکە، ئینشائەڵا رون ئەکرێتەوە."

(دەسنوس: 43، نامە: 9)

جاری سێیەم دو بابەتی کتێبەکەی بۆ نـاردوە. پـێ ئەچـێ ئەو دو بـابەتەی بە ئەنقەسـت نـارد بـێ. ویسـتویەتی پەیـامێ بە مەولانـا بـدا کە وەلـی و پیـاوی خـوا، نـابی خویـان دەرخەن. ئەبـێ لە پەنـا دا بە شـاردراوەیی بمێنـنەوە. تـێکەڵاوی خەڵـک نەبـن. مەولانـایش ئەو بـۆنەیەی بە هەل زانیـوە، هەم وەڵامـی بۆچونەکانی ئەوی داوەتەوە. هەم گلەییەکانی خـۆی بە تونـدی پـێ راگەیانـدوە. لە نـامەکەی دا بـۆ مەحمـود پاشای نوسیوە:

"رۆژێ کە ئێوە ئەسیری حەپسی عەجەم بون و ئەم فەقیرەش لە هندستان لە ئاسـتانی مەلایـک پاسەوانی مورشیدا، قدس سرە العزیز، مەشـغولی سـلوک بـوین، هەر رۆژێ نزیکـایەتیم پەیـدا ئەکرد، لەو ئاستانەیە بـۆ شـفاعەت و رزگـاری ئێـوە و گەورەبـون و مەنسـەبوەرگرتنی ئێـوە، هەروەکو کورتەیەک لە سەید مەحمود ئەبیستن. تا ئەوەی بە فەزل و کەرەمی ئیلاهی خۆمـان بە دەوڵەتێ گەیشتین. یەک دەقـیقە لە ئیعـانەت و ئیمـدادی ئێـوە چ بە خـۆم و چ بە ئیسـتیمدادی روحـانیەتی پیرانـی کیـبار، نە لە هینـد و نە لە بەغـداد و نە لە وڵاتـانی غـوربەت، سسـتیمان نەنواند تا بە لوتکەی دنیای خۆت گەیشتی.

ئەگەر بەو شێوەیە ئیدیعای نزیکایەتی دەربڕی جێگەی خۆیەتی. بەڵام ئەو جەنابە لە رۆژێکەوە کە بە دەوڵەتی مستعارەی خۆت گەیشتی کام پاداشتی حەمیەتی فەقیران و کام پاداشتی هیمەتی بەرزی ئەربابی فەقر و فەناتان داوەتەوە؟

کەسێ کە بە هیوای دنیا نەبو، بە هیوای ئەوە بـو جـارێ بە خەڵـک بڵـێن: تەریقەتـی نەقشـبەندی حەقە، فـڵان ئەگەر گوناهبـاریش بـێ، بەڵام دەسـتی بەو زنجیـرە بەرزەوەیە، قبـوڵ ناکەین کەس تەنگی پێ هەڵ بچنێ.

لە هەمو دنیا خەڵک ئەم مسکینە وەکو تاج لە سەر سەریان دائەنێن... تاد"

*(نامە: 145)*

مەولانا ئەگەر شەرحی "اطباق الذهب" ی نوسی بـێ، یـا تەرجـومەی فارسـی کـرد بـێ، لە سـەر داوای مەحمود پاشا بوە. رەنگە ئەویش لەوە دو مەبەستی هەبوبێ:

**یەکەم:** توانای مەولانا لە بواری ساخکردنەوە و تەرجومە و شەرحی کتێبەکە دا تاقی بکاتەوە، چـونکە "اطباق الذهب" چەند قەرن لەوە پێش، بە زمانێکی سەخت و سەجەعێکی رەقی نوسراوە. وشە و رسـتەکانی لە زمانی عەرەبی دا کەمناسراو و کەمبەکارهێنراو بون.

**دوەم:** بە خوێندنەوەی کتێبەکە، مەولانا بخـاتە هەڵوێسـتێکی نەخـوازراوەوە، لە بەر ئەوەی نـاوەرۆکی هەندێ لە وتارەکانی لە گەڵ رەفتار و هەڵسـوکەتی ئاشـکرای وەلـی و پیـاوی خـوا نـاگونجێ، کە ئەشـێ بـۆ تانەدان بو بێ لە جموجوڵی مەولانا.

## خالید و تۆڕی پێوەندی رێکخراوەیی

لە دوای گەڕانەوەیە لە هیندستان، مەولانا لە هەر جێیەک بوبێ بەردەوام خەریکـی فراوانکردنـی تـۆڕی پێوەندیەکانی بوە. هەوڵـی داوە لە هەر نـاوچەیەک و لە هەر شـارێک و لە هەر شـارەدێیەک خەلـیفە، موریـد، مەنسوب، بـاوەڕپێکراو، دۆسـتێ پەیـدا بکـا. هەوڵـی داوە خەلـیفە و موریـدەکانی لە نـاو تـوێژی سـەرەوەی کۆمەڵگادا هەڵبژێرێ، بە تایبەتی لە ناو مەلاکان دا. لە ناو مەلاکانیش دا لە نـاو زانـا نـاودار و هەڵکەوتوەکـان دا. ئەوانە ئەڵقەی یەکەمی رێکخراوەیی دەوری تەریقەتەکەی بون.

مەولانا، کەسێکی ڕۆشنبیر، شاعیر و ئەدیب، شارەزای زانستەکانی دینیی ئیسلام بوە، خاوەنی کەسایەتیەکی باوەڕبەخۆبوی بەهێز بوە، و توانایەکی گەورەی کارتێکردنی کەسی گوێگر و بەرامبەری هەبوە، لە هونەری "اقناع" دا کەموێنە بوە. پیاوێکی وەکو مەلا یەحیای مزوری، بە شێخ مارف ئەڵێ تۆ هاوڕێیەتیت نە کردوە، لە گەڵی دا نە نیشتوی و گفتوگۆت لە گەڵ نە کردوە بۆیە هەڵوێستت بەوجۆرەیە. بە واتایەکی تر ئەگەر تێکەڵاوی لە گەڵی هەبوایە کاری تێ ئەکرد و دۆستانە رەفتاری لە گەڵ ئەکرد.

مەولانا خانەقاکەی سلێمانی کردۆتە مەکۆی کۆکردنەوەی هەندێ لە خەلیفە و شاگردەکانی. دەرگای هاتوچۆی بە روی لایەنگرەکانی دا کردۆتەوە. زۆری نەخایاندوە ژمارەیەکی زۆر خەلیفەی باوەڕپێکراوی لە سەرانسەری کوردستان دا پێ گەیاندوە.

یەکێ لە شێوەی کاری مەولانا بۆ ڕاکێشانی ئەوانە بۆ سەر تەریقەتەکەی و دروستکردنی دۆستایەتی و ئاشنایەتی، نوسین و ناردنی "نامە" بوە. مەولانا سەرەڕای کاری ڕۆژانەی ئیرشاد و، بینینی دۆست و لایەنگرەکانی و، ئامۆژگاری زارەکی مەنسوبەکانی و، دانانی دەرسی مورید و مەنسوب و خەلیفەکانی. وەکو لە "مەکتوبات" هکەی دا دەر ئەکەوێ، پێی وا بوە "المراسله نصف المواصلة" *(نامە: 20)* بۆیە بە سەدان نامەی بۆ کەسایەتی جۆراوجۆر نوسیوە. لە ناو ئەوانەدا مەلا، بازرگان، میر و دەسەڵاتدار... لە هەمو نامەکانی دا، ئامۆژگاری کردون، پێرەوی کیتاب و حەدیس و سوننەت بکەن، دور بکەونەوە لە بیدعەت. داوای لێ کردون دەس بگرن بە زنجیرەی پیرانی تەریقەتی نەقشبەندییەوە.

## پەیکەری ڕێکخراوەیی تەریقەت

لەو سەردەمەدا لە کوردستان شاری گەورە، تەنانەت شاری ناونجی، تێدا نەبوە. هەمو شارەکانی لە باشترین حاڵەت دا ئەشێ پێیان بوترێ شارەدێ. مەولانا لە هەمو شارەدێکانی کوردستان دا خەلیفەی باوەڕپێکراوی خۆی تێدا داناوە و، ڕاستەوخۆ لە گەڵ خودی خۆی لە پێوەندی دا بون.

رابەڵەی پێوەندی تەریقەت، پێوەندی مورشیدی کامیل لە گەڵ خەلیفەکانی، پێوەندی خەلیفە لە گەڵ موریدەکانی، پێوەندی پیری تەریقەت بە گشتی لە گەڵ مەنسوبەکانی، سنوری بنەماڵە، ئێل، هۆز، زمان، رەگەز و، گوند و شار و ناوچە و، وڵاتی تێ پەڕاندوە. مەنسوبەکانی تەریقەتی نەقشبەندی هەمویان بە دین موسوڵمان و بە مەزهەب سوننی بون. بەڵام موسوڵمان بون و سوننی بون بە تەنیا بەس نەبوە. بۆ بونە هاوبیری ڕێبازی نەقشبەندی، مرۆڤ، وەک تاک بۆتە گرێیەکی رابەڵەکە، "پێوەندی رۆحی" بەستویەتی بە پیرەکەیەوە، نەک پێوەندی هاوبینی، هاومەزهەبی، هاورەگەزی، هاوزمانی، هاوخوێنی، یا هاوشوێنی. لە ناو خەلیفە و موریدەکانی مەولانا دا، جگە لە کورد، عەرەبی عیراقی و شامی و فەلەستینی و حیجازی، تورک و ئەفغانی و خوراسانی و شیروانی... هەبون.

لایەنگرەکانی مەولانا پلەی تەریقەتیان هەموی وەکو یەک نەبوە. خەلیفە و مورید و مەنسوب هەریەکەیان جۆرێ لە ئەرک و ڕێگەی پێوەندییان جیاواز بوە.

**خەلیفە:** ئەوانە بون، کە لە بەر دەست پیری تەریقەت دا پەروەردەکراون تا گەیشتونەتە قۆناغی "فەنا" و "بەقا" کە دوا قۆناغی پێگەیشتنی تەریقەتی بوە و، هەمو کەس نەی توانیوە بەم پلەیە بگات. مەولانا هەوڵی داوە خەلیفەکانی لە ناو زانایانی ئاینی دا، بە تایبەتی لە ناو مەلاکان دا، هەڵ بژێرێ. مەولانا ئیجازەی ئیرشادی پێ داون، بونەتە کەسێکی پێشەیی. خەلیفە بە ناوی مەولاناوە، ئەلقەی زیکر و رابیتە و خەتمی خواجەگانیان بە موریدەکان، ئەنجام داوە.

**مورید:** ئەو کەسە بوە کە دڵسۆزی خۆی بۆ تەریقەت و بۆ پیری تەریقەت دەربڕیوە. لە ئەلقەی زیکر و رابیتە و خەتمی خواجەگان دا، بە رابەری یەکێ لە خەلیفەکان، بەشدار بوە. بەڵام ژیانی ئاسایی خۆی و کار و

پیشەکەی ئەنجام داوە. بە زۆری لە چینی ناوەنجی و هەژاری کۆمەڵگا، دوکاندار، پیشەکار، جوتیار، بـون. زۆر لە مانە دازناوی سۆفی یان هەڵگرتوە.

**مەنسوب:** هەمو ئەوانە بون بە جۆرێ لە جۆرەکان دۆستایەتی، پشتیوانی، لایەنگیـری، هاوسـۆزی یان لە گەڵ تەریقەتەکە هەبوبێ. بەڵام پێویستی نەکردوە لە ژیانی تایبەتی خۆیان و لە ژیانی گشـتی نـاو کۆمەڵگـادا پابەندی رێنماییەکانی تەریقەت بن.

ئەگەر بە پێی ئەوانەی مەولانا نامەی بۆ نوسیون و، ئێستا نامەکانی لە بەر دەس ماون، پۆلێن بکرێن، تۆڕی پێوەندی کۆمەڵایەتی مەولانا، لە چاو زەمانی خۆی دا، کە هێشتا هۆیەکانی پێوەندی سادە و سـەرەتایی بون، تۆڕێکی فراوان و بەربڵاو بوە، لە سەر ئاستی کەسایەتیە کاریگەرەکانی ناو کۆمەڵگـا و، لە سـەر ئاسـتی سـنوری جوگرافیـا. ئەوانەی لەم تـۆڕەدا بە دی ئەکـرێن، خەڵکـی شـوێنی جیـاواز بـون، لە پـلەی جیـاوازی کۆمەڵایەتی و زانستی و سیاسی دا:

- هەندێکیان مامۆستاکانی سەردەمی فەقێیەتی بون.
- هەندێکیان مەلا و زانا ئاینیەکانی هاوشانی خۆی بون.
- هەندێکیان میر و کاربەدەستەکانی کوردستان بون.
- هەندێکیان حوکمڕانەکانی ناوچەکە بون.
- هەندێکیشیان کەسوکاری خۆی بون.

ئەمانە بەشێکیان بون بە خەلیفەی، بەشێکی بون بو مورید و مەنسوب و، بەشێکی دوربەدور ناسـیاوی و ئاشنایەتی لە گەڵ دامەزراندون.

مەولانا لە گەڵ مامۆستاکانی سـەردەمی فەقێیەتـی خـۆی دا، هەروەهـا لە گەڵ کورەکانیـان دا، بە نـامە پێوەندی بەردەوامی درێژە پێ داوە، لەوانە:

> شێخ عەبدوڵای خەرپانێ، مەلا جەلالی خورماڵی و، کورەکانی مەلا مستەفا، مەلا ئەحـمەد و، مەلا مەحمود، مەلا عەبدورەحیمی زیارەتی، مەلا ساڵحی تەرەماری و کورەکانی.
>
> *(دەسنوس: 13 و 14 و 63 و 71)*

ئەمەش جگە لە وەفاداری، هەم کەڵکی لە نفوزی ناوچەیی ئەوان وەرگرتوە، هەم هەوڵی داوە بیان خـاتە وێنەی راستەقینەی خۆی و جوڵانەوە تازەکەیەوە، راستیەکەیشی هەندێکیانی بە لای خۆی دا راکێشاوە.

لە گەڵ مەلا و زانا ئاینیەکانی هاوشانی خۆی، لەوانە:

- لە کۆیە، مەلا عەبدوڵای جەلی، مەلا عەباس.
- لە هەولێر، شێخ ئەحمەدی خەتیب، مەلا هیدایەتوڵا.
- لە هەورامان، شێخ عوسمانی سیراجەدین.
- لە قەڵاچوالان، مەلا محەمەدی مەلا سادق.
- لە گولعەنبەر، مەلا مەحمود و مەلا محەمەد، کورانی مەلا جەلالی خورماڵی.
- لە پشدەر، مەلا ئەحمەدی باوزێ.

**لە ساداتی بەرزنجە:**

سەید عەلی بەرزنجی قازیی سلێمانی، سەید عەلی بەرزنجی مـودەڕیس، شـێخ عەبـدولقادری بەرزنجـی برای شێخ عەبدوسەمەدی قازیی سـلێمانی، سـەید عەبـدولقادری بەرزنجـی مـودەڕیس، سـەید عەبـدولعەزیزی بەرزنجی برای نەقیبی سلێمانی، سەید عەبدوڵای بەرزنجی برازای نەقیب، سەید ئیسماعیلی بەرزنجـی بـرازای نەقیب، سەید محەمەدی بەرزنجی، سەید عەبدوللەتیفی بەرزنجی کوڕی سید عەبدولکەریمی مامۆستای.

ساداتی بەرزنجە لە سلێمانی و دەوروبەری بنەماڵەیەکی ناسراو و ڕێـزدار بـون لە لای میرانـی بابـان. مەلای گەورە و قـازی و مودەڕیسـیان تـێدا هەڵکەوتـوە و، پیـاوی دەسڕۆیشـتویان هەبـوە لە نـاو دەزگـای کارگێڕیی بابان دا.

**لە زانایانی حەیدەری – ماوەرانی:**

سـەید ئەسـعەد صـەدرەدینی حەیـدەری. سـەید صـیبغەتوڵای حەیـدەری. سـەید عەبـدولقادر صـدیقی حەیدەری. سەید عەبدوسەلامی حەیدەری. سـەید عەبـدولغەفوری حەیـدەری. سـەید عەبـدورەزاقی حەیـدەری. سەید عیسای حەیدەری. سەید فەزڵوڵای حەیـدەری. سـەید عەبـدولحەکیمی حەیـدەری. سـەید عەبـدولحەلیمی حەیدەری. سەید محەمەدی حەیدەری. سەید ئیبراهیم فەصیحی حەیدەری

**بنەماڵەی حەیدەری:** لەو سەردەمەدا، لە بەغداد پلە و پایەی دینیی بەرزیان هەبوە. هەنـدێکیان مـوفتی و قازی و مودەڕیس و، لە دەزگای کارگێڕیی عوسمانی دا دەسەڵاتدار و خاوەن نفوز بون.

**لە بادینان:** مەلا یەحیای مزوری. شێخ عەبدولفەتاحی ئاکرەیی. مەلا عەبدولوەهابی سوسەیی.

**لە هەکاری:** شێخ عەبدولقادری هەکاری. سەید تەهای شەمزینی.

**لە سنە**، میرزا لوتفوڵا. لە سابلاخ، مەلا ڕەسول.

ئەمانە بەشێکن لەو کەسایەتییانەی خەلیفە و باوەڕپێکراوی مەولانا خالید بـون لە شـوێن و نـاوچەی جیاواز. جـگە لەم شـوێنانە مەولانـا لە وان و دیـاربەکر، لە بەغـداد و بەسـرا و دیمەشـق و حەڵەب و مەکە و ئەستەموڵ، خەلیفەی باوەڕپێکراوی هەبون. *(بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ناوی خەلیفە و موریـدەکانی مەولانـا خالیـد، بڕوانە: یادی مەردان، 1/ 83- 86)*

**پێوەندی لە گەڵ میر و دەسەڵاتدارەکانی کوردستان، لەوانە:**

- میرەکانی بابان، عوسمان بەگ و، حەسەن بەگ، سلێمان بەگ، محەمەد بەگ.
- والیی کوردستان، ئەمانوڵاخانی ئەردەڵان. *(بۆ دەقی فارسی نامەکە بڕوانە کۆتایی باسەکە)*
- میری بادینان، زوبێر پاشا. *(الرقعة: 81)*
- پێوەندی لە گەڵ دەسەڵاتدارانی ناوچەکە، لەوانە:
- داود پاشا، وەزیری بەغداد. *(الرقعة: 9 و 40)*
- عەباس میرزای کوڕی فەتحعەلی شا، وەلیعەهدی شای ئێران. *(بۆ دەقی فارسی نامەکە بڕوانە کۆتایی باسەکە)*
- شێخولئیسلام، مەکی زادە مستەفا عاسم ئەفەندی. *(الرقعة: 8)*

فراوانبـونی تـۆڕی پێوەنـدیەکانی و، زۆربـونی موریـد و مەنسـوبەکانی، زۆربـونی لایەنگرەکـانی، خانەقاکەی بۆتە بارەگایەکی گرنگی ئاراستەکردنی "ڕوحـانی" ی هەزاران کەس. یەکێ لەو دەریتـانەی هێنـا بویە ناو تەریقەتەکەیەوە "ڕابیطە" بـوە. ڕابیـتە مەراسـیمێکی ئـاینیی تـازە بـوە، بـۆ بەسـتنەوەی موریـد بە شێخەکەیەوە. بەم بۆنەیەوە یار و نەیار چیرۆکی جۆراوجۆریـان هەڵبەسـتوە. مەولانـا خـۆی لە شـیعرێکی دا ئاماژەی بەوە کردوە، ئەڵێ:

ز سـودایت چنـان بـدنام گشـتم در هـمه عـالم
بگوش خود شنیدم هر طرف افسـانەی خـودرا

واتە:

لە سۆنگەی سەودای تـۆوە، لە دنیـادا وەهـا بەدنـاو بـوم
بە گوێی خۆم لە هەمو لایەک گوێم لە ئەفسانەی خۆم بو

پەرەسەندنی تەریقەتی نەقشبەندی وا بە خێرایی و. گەورەبونی قەوارەکەی و. پتەوبونی رێکخراوەیی داوودەزگاکانی، ترسی لە لای شێخانی تەریقەتی قادری و. لە لای میرەکانی بابان دروست کردوە. بە تایبەتی لەو ماوەیەدا میرایەتی بابان بە قۆناغێکی نالەباردا تێ پەڕیوە بە هۆی ناکۆکی ناوخۆی بنەماڵەی بابان و. دەستێوەردانی بەردەوامی رۆم و عەجەم لە کاروباری کوردستان.

## کێشەی ناوخۆی تەریقەت

مەولانا لە سەردەمی ژیانی خۆی دا لە ناو خۆی تەریقەت دا. لە گەڵ هەندێ لە خەلیفە و لایەنگرەکانی خۆی، توشی هەندێ کێشەی نەخوازراو بوە:

هەمان دەروێش محەمەدی، کە لە هیندستانەوە هاتوە بە دوای دا و. رێبەری کردوە بۆ هیندستان و. تا گەیاندویەتی بە شاە عەبدولا لە گەڵی بوە. مەولانا ئەو کاتەی لە سلێمانی بوە. لێی هەڵگەڕاوەتەوە و کەوتۆتە قسە دژی لە لای خەلیفە ناسراوەکانی و. لە لای کاربەدەستانی سەردەم.

لە نامەیەکی دا کە بۆ محەمەد ئەسعەد ئەفەندی نوسیوە، ئەڵێ:

نامەی لە هندستانەوە بۆ هاتوە، شاە عەبدولا دەری کردوە و. نامەکەی مەحمودی برای بردویەتی بۆ کەرکوک، پیشانی کەسانی پێوەندیداری بدا.

هەرچەندە لە نامەیەکی دا باسی پێکهاتنەوەیان ئەکا، بەڵام ئەو متمانەیەی کە سەرەتا بە یەکیان هەبوە، نەماوە.

*(ریاض المشتاقین: 175)*

## بیری تیۆلۆجی مەولانا

لە ناو نامەکانی دا گەلێ لایەنی ژیانی تایبەتی خۆی و خێزان و بنەماڵەکەی و. ژیانی کۆمەلایەتی و ئابوری و سیاسی ئەو سەردەمە رون ئەبێتەوە. هەرچەندە مەولانا خۆیشی لە چەند نامەیەکی دا بە ئاشکرا نوسیویێتی کە "الاسرار لا تكتب فی الاسفار" نهێنیەکانی تەریقەت لە نامەدا نانوسرێن. *(الرقعة: 5)* بەڵام نامەکانی مەولانا و. نوسین و نامیلکە و شیعر و کتێب و حاشیەکانی کە لە سەر هەندێ لە کتێبە ناسراوەکانی نوسیوە، ئەشێ سەرچاوەیەکی گرنگ بن بۆ لێکۆڵینەوەی بیری تیۆلۆجی مەولانا خالیدی نەقشبەندی. کە لەو ژینگە کۆمەلایەتی و ئابوری و رۆشنبیری - دینیی و سیاسیەی ئەو کاتەدا، سەرەرای هەمو دوژمنایەتیەک، تەشەنەی کردوە. تەریقەتی نەقشبەندی بۆتە دیاردەیەکی کۆمەلایەتی، رۆشنبیری، سیاسی، کاریگەر. تەنیا هێزی مەعنەوی روحی نەبوە. بەڵکو لە هەمان کات دا بۆتە هێزێکی مرۆیی "حساب" بۆ کراو. ئاخۆ ئەم بزوتنەوەیە، هیچ بەرنامەیەکی چاکسازی کۆمەلایەتی هەبوە. یان لە هیچ جێگایەکی پرۆسەی چاکسازیی دینیی دا کە کەسانی وەکو: عەبدورەحمانی کەواکیبی، جەمالەدینی ئەفغانی، محەمەد عەبدە.. سالانی دواتر ئالاهەڵگری بون، شوێنی ئەبێتەوە؟

ئەمە بابەتێکە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیە.

## مەولانا و
## هەوڵی ڕێکخستنەوەی ناوماڵی بنەماڵەی بابان

لە کۆنەوە لە ناو بنەماڵەی بابان دا پیلانگێڕان لە یەکتری بۆتە نەریتێکی باو. برا پیلانی لە برا و ئامۆزا پیلانی لە ئامۆزا و مام لە برازا و برازا پیلانی لە مام گێڕاوە. برا خیانەتی لە برا و ئامۆزا خیانەتی لە ئامۆزا کردوە.

ئەمە بە تەنیا لە ناو چینی حوکمڕانی کوردا نەبوە، بەڵکو لە ناو چینی حوکمڕانی ئیرانی دا هەبوە، هەروەها لە ناو چینی حوکمڕانی عوسمانی دا هەبوە. تەنانەت لە ناو چینی حوکمڕانی ئینگلیزی و بنەماڵەی شاکانی ئەوروپادا هەبوە. ناکۆکی و پیلانگێڕان لە ناو خۆیان دا لە سەر زەوتکردنی دەسەڵات زۆر جار گەیشتۆتە پێکدادانی خوێناوی و دڕنژخایان. بەڵام چونکە داودەزگای حوکمڕانی و بەشێکی زۆری جومگەکانی لاشەی بەڕێوەبەرایەتی: کارگێڕی و کارمەندەکانی، باجگیری و فەرمانبەرەکانی، لەشکر و فەرماندەکانی، دەزگای دینی و پێشەواکانی، وەکو خۆی ماونەتەوە، ئەستونەکانی حوکم نە روخاون. پاشاکە گۆڕاوە، بەڵام زۆری کارمەندانی دەزگاکان بە نەگۆڕاوی ماونەتەوە. لە ئەمارەتی بابان و ئەمارەتە کوردیەکانی تردا، لە گەڵ گۆڕانی حاکمەکەدا گۆڕان بە سەر فەرمانبەر و کارمەندەکانی دەزگاکانی کارگێڕی و بەڕێوەبەرایەتی و لەشکری دا هاتوە. دەستوپێوەندی حاکمی پێشو گۆڕاوە، دەستوپێوەندی حاکمی تازە هاتونەتە سەر کار. بیانویان بەوانەی پێشو گرتوە سەرەکانیان خستونەتە زیندانەوە، سامان و دارایی یان زەوت کردون.

میری بابان، هەر کامێکیان بو بێ، لە سەردەمی حوکمڕانی دا نەی زانیوە، یان نەی ویستوە داودەزگایەکی بەڕێوەبەرایەتی هەمیشەیی: کارگێڕی، باجگیری، سەربازگیری، ئابوری، جێگیر دابمەزرێنێ و بۆ دوای خۆی پێوەندی نێوان خۆی و کوڕەکانی و، پێوەندی نێوان کوڕەکانی و ئامۆزا و برازاکانی و ئەندامانی تری بنەماڵەکەی، لە سەر بنچینەی دابەشکردنی سامان و دەسەڵاتی - پاشایەتی، لە گەڵ یەکتری بە جۆرێ ڕێک بخا کە نەگۆڕێ و سەبات بدا بە دەزگاکە، بەڵکو کاربەدەستەکانی لە داروەستەکانی خۆی داناوە، دوای ئەو کەسێکی کە کە هاتوە ئەوانی پێش خۆی گۆڕیوە بە کەسانی داروەستەی خۆی. لە بەر ئەوەی لە چوارچێوەیەکی ڕێکخراوی حوکمڕانی دا نەبوە، هەمیشە لە ناڵوگۆڕدا بوە، برا و برا، ئامۆزا و ئامۆزا، بۆ وەرگرتنی دەسەڵات و سامان پیلانیان لە یەکتری گێڕاوە. ئەم هەلومەرجە نائارامیی بەڕێوەبەرایەتی دروست کردوە، هەمیشە بۆتە مایەی لاوازیی دەسەڵاتی خۆجێیی لە بەرامبەر هێزی دەرەکی و هێزەکانی لە خۆیان گەورەتر. سەرەنجام بۆتە هۆی ئەوەی بناغەی دەوڵەتی تێ دا دانەمەزراوە.

لە ژێر سایەی ئەم بنەماڵەیەدا، شاری تازە - دامەزراوی سلێمانی گەشەی نەکردوە. هەرگیز نەگەیشتۆتە ئاستی هیچ کام لە شارەکانی ئیران یا دەوڵەتی عوسمانی. وەکو شارۆچکەیەکی بچوک لە روی ژمارەی دانیشتوان و دواکەوتو لە روی ژێرخانی ئابوریەوە ماوەتەوە. نەبۆتە ناوەندی راکێشانی بازرگان و سەرمایەدار، نەبۆتە ناوەندی راکێشانی زانای دینیی و زانستی. نەبۆتە ناوەندی راکێشانی پیشەساز و هونەرمەند. کۆچیان لێوە کردوە و کۆچیان بۆ نەکردوە. هێزی مرۆیی و ئابوری قەڵەمڕەوی بابان، ئەوەندە داهێزراو و داچۆڕاو بوە، بەرگەی هیچ هێرشێکی سەربازیی عوسمانی یا ئیرانی نەگرتوە.

مەولانا پیاوی دین بوە، لە هەمان کات دا پیاوێکی دنیادیدە بوە. بەغداد و تاران و دیمەشق، وڵاتانی تورکیا و شام و حیجاز و ئیران و خوراسان و هندستانی دی بو. تەجروبەی ژیانی لە مەحمود پاشا و میرەکانی تری بابان زۆرتر بوە. ئەبێ روانینێکی بۆ جۆری حوکمڕانی و بەڕێوەبەرایەتی ئەو شار و وڵاتانە هەبو بێ.

ئەو کاتەی مەولانا ئەرکی ڕێکخستنەوەی ناوماڵی بنەماڵەی بابانی گرتوتە ئەستۆ یان خراوەتە ئەستۆی، سەد ساڵ زیاتر بوە، ئەم بنەماڵەیە لە ناو خۆی دا ئەوەندە ناکۆک و ناتەبا بوە، ئێسکی یەکتری‌یان شکاندوە. قەڵەمرەوی بابان بە هۆی ململانێی ناوخۆی بنەماڵەکە و دەستێوەردانی ڕۆم و عەجەم، لە نائارامیەکی درێژخایانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، سەخت دا ژیاوە.

نمونەی ئەمە لە حوکمرانی سەلیم پاشا و خالید پاشادا ئەبینرێ. دوای ئەوانیش لە ململانێ پێنج کوڕەکەی خالید پاشادا: سلێمان پاشا، مەحمود پاشا، ئەحمەد پاشا، محەمەد پاشا، عومەر پاشا، لە گەڵ یەکتری. دوای ئەوانیش ئیبراهیم پاشا و خالید پاشای کوڕانی ئەحمەد پاشا و ئەورەحمان پاشای مەحمود پاشا.

تەنانەت کە مەحمود پاشای دوەم لە جێگەی ئەورەحمان پاشای باوکی دانراوە بە میری میران و "خەڵعەتی پاشایەتی" قەڵەمرەوی بابانی لە لایەن وەزیری بەغداوە بۆ نێردراوە. لە هەمان ماوەدا سێ لە مامەکانی: عەبدوڵا بەگ، ئەحمەد بەگ، عومەر بەگ، بۆ دەربڕینی ناڕەزایی خۆیان هەڵاتون بۆ بەغداد و دەستوپێوەندەکانیان ناردوە بۆ کەرکوک (*دوحة الوزراء: 263*) و، ماوەیەک دوای ئەوانیش، یەکێکی تر لە براکانی، حەسەن بەگی ئەورەحمان پاشا، هەڵاتوە بۆ بەغداد. (*دوحة الوزراء: 283*)

مەولانا لە سەر داوای داود پاشای وەزیری بەغداد هەوڵی داوە تەبایی لە ناو بنەماڵەی بابان دا دروست بکا و، سنورێ دابنێ بۆ پیلانگێڕان لە یەکتری و، هێنانی دەستی بێگانە. بە تایبەتی دەستی عەجەم، بۆ ناوچەکە. مەولانا لە نامەیەک دا کە بە زمانی عەرەبی بۆ داود پاشای نوسیوە(*دەسنوس: 20 - 24. الرقعة: 9*) چەند بابەتێکی بۆ ڕون کردۆتەوە:

> "تێوەگلان لە بەجێهێنانی ئەرکێکی سامناکی وەکو "اصلاح ذات البین" و ئامۆژگاری بۆ نەهێشتنی کدورەت و شحنا و گۆڕینی نیفاق بە ویفاق و دوژمنایەتی بە ئیتیفاق. بە لای هەندێ کەسەوە ئێمە لە بەرچاوی خەڵک ئەخا و پایەی ئێمە دائەبەزێنێ. ئەمان خاتە بەر تانە و تەشەر، چونکە بەڵێنی ئەهلی دنیا پشتی پێ نابەسترێ.

بەڵام فەرمانی وەزیرانی ئیسلام، ئەگەر پێچەوانەی شەرع نەبێ، ئەبێ گوێڕایەڵی بکرێ. بە تایبەتی بۆ پاراستنی دین و قازانجی موسوڵمانان و بەهێزکردنی سوننەتی باڵا و گوێدانە لایەنی دەوڵەتی بەرز و ڕزگارکردنی باوەڕداران لە ناکۆکی

قۆڵی لێ هەڵماڵیوە، ئیستیخارەی کردوە، ئیستیمدادی لە سادات و قاداتی نەقشبەندی وەرگرتوە، لە گەڵ مەحمود پاشا و عوسمان بەگی برای و عەبدوڵا پاشای مامی، یەکە یەکە قسەی زۆری لە گەڵ کردون، وەعزی داداون و هەڕەشەی لێ کردون، هەتا ڕازی کردون. ئینجا لە گەڵ قازی سلێمانی و گەورەپیاوەکانیان کۆڕێکیان بەستوە، مەحمود پاشا و ئەوانی تریان سوێند داوە و، بەڵێننامەیان پێ مۆر کردون، قورئانیان پێ مۆر کردون. وێنەی بەڵێننامەکە و قورئانە مۆرکراوەکەیان بۆ داواد پاشا ناردوە.

بەڵێنیان داوە، هەر کامێکیان نامەیەکی بۆ بێ ئەیشارێتەوە لە بەردەم مەولانادا ئاشکرای بکا.

نابێ ئەم بەڵێن و پەیمانە بشکێنن. مەگەر کەسێ لە سزای ڕۆژی مەوعود نەترسێ. لە بازنەی ئیسلام دەر بچێ. پاکانە لە میللەتی سەیدولئەنام بکا.

ئەگەر ئێوە یا مەحمود پاشا ئەم پەیمانە بشکێنێ و، لە پێناوی جیفەی دنیادا خۆی بخاتە بەر توڕەبونی خوا، لە بازنەی ئیسلام دەرچون، بونە جێگەی شەرم و ئەنگی. زمانی توانج و تانەتان لێ کرایەوە، ئەوسا چ گلەییەک لەم مسکینە زەعیفە ئەکرێ، لە وەزیع و شەریف. چ قسوریەک لە ئەستۆی سوێندەر و سوێندەکەدایە. من ئەمە ئەڵێم چونکە غەیب نازانم. سیعلم الذین ظلموا ای منقلب ینقلبون"

ریچ ئەو ماوەیە لە سلێمانی بوە. بەردەوام میرەکانی بابانی دیوە و گفتوگۆی لە گەڵ کردون. ئاگاداری ئەم ڕێککەوتنە بنەماڵەییە بوە. زیاتر چۆتە قوڵایی بابەتەکەوە.

**لە یادداشتەکانی ڕۆژی 6 ی تەموزدا نوسیویتی:**

"ماوەیەکی کەم بەر لە ئێستا، دوای ئەوەی مەحمود پاشا، بڕیار دەدا خۆی بداتە پاڵ تورکەکان، خۆی و عەبدوڵا پاشای مامی و عوسمان و سلێمانی بـرای چوبـونە لای خواناسـی مەزن شـێخ خالیدی سلێمانی و هەرسێکیان سوێندیان خواردوە کە لایەنگیر و پشتیوانی مەحمود پاشا بـن و لە بەر ئەوەش کە چاوەڕوان دەکرا شازادەی کرماشان، تەقەلای ئەوە بدات یەکێکیـان بە لای خۆی دا دابشکێنێ و لە دژی تورکەکان هانیان بدات، سـوێندیان بە شمشـێر و قورئـان و تەڵاق خوارد بو، کە ئەگەر هەر کامێکیان نامەیەکیان لە لایەن تورک، یان ئێرانەوە پێ بگات، دەبـێ لە ماڵی شێخ خالید لە بەر چاوی چەند کەسێک، کە خۆیان لە سەری ڕێک دەکەون، بیکاتەوە..."

*(ریچ: 146)*

لە یادداشتەکەی ریچ دا چەند لایەنێکی پێکهاتنەکە زیاتر ڕون دەبێتەوە:

**یەکەم**، سوێند خواردنەکەیان سەرەڕای قورئان، بە تەڵاق سوێندیان خواردوە، هەروەها بە شمشێر.

**دوەم**، جگە لەو سێ میرەی بابان، ناوی یەکێکی تریشیان ئەهێنێ، کە ناوی سلێمان بەگ بوە.

**سێیەم**، هاتنی نامە و ئاشکراکردنی هەر بۆ نامەی ئێرانی نەبوە، بۆ هەمو نامەیەک بوە تەنانەت ئەگەر لە بەغدایشەوە، واتە لە داود پاشاوە بێ.

مەولانا، وەکو لە نامەکانی و لە شیعرەکانی دا دەر ئەکەوێ، لە گەنجێتیەوە، بەر لەوەی حەج بکـا و، بەر لەوەی سەفەری هیندستان بکا و، بەر لەوەی ببێ بە پیـری تەریقەتـی نەقشـبەندی پێوەنـدی لە گەڵ میرەکـانی بابان خۆش بوە. میرەکانی بنەماڵەی بابانی لە نزیکەوە ناسیوە. وەکو لە نامەکەی دا دەرئەکـەوێ ئومێـدێکی زۆری بە بەڵێن و سوێند و پەیمانەکانیان نەبوە. بەدگومانیەکەی مەولانا کە "پشت بە بەڵێنەکانی ئەهلی دنیـا نابەسترێ" لە جێی خۆی دا بوە. هەر ئەو چەند ڕۆژەی ریچ لە سلێمانی بوە، شایەتی پەیمانشکێنی و بێبەڵێنی عەبدوڵا پاشا بوە، چونکە نامەی شازادەی کرماشانی بۆ هاتوە، ئاشـکرای نەکـردوە و لە سـەر ئەوە گیـراوە، عوسمان بەگیش، بە فیتی والی بەغداد، هەمو دەسەڵات و موڵکەکانی لێ سەنراوەتەوە و دەس بەسەر کـراوە. *(ریچ: 289)* مەولانا خۆیشی هەر لەو ڕۆژانەدا لە سنوری قەڵەمڕەوی بابان هەڵاتوە.

ئەو پەیمانەش جێبەجێ نەکراوە. ڕوداوەکانی ڕابوردو سەرلەنوێ دوبارە بونەتەوە.

میرایەتی بابان داوودەزگای بەڕێوەبردن و باجگیری و سەربازگیری و لەشـکری پیشـەیی نەبـوە، بـۆ ئەوەی دوای گـۆڕانی میـرەکە ئەوان بە نەگـۆڕی بمێنـنەوە درێـژە بە ئاسـایش و کـارگێڕی و ڕاپەڕانـدنی کاروباری وڵات بدەن.

میرەکان لە ناو خۆیان دا نـاکۆک بـون. پیلانیـان لە یەکتـری گێـڕاوە. مـاوەی کـورت لە میرایەتـی دا ماونەتەوە. هەر جارەی بە یارمەتی لەشکری ڕۆم یا عەجەم دەسیان بە سـەر نـاوچەکەدا گرتـوە. ئەمیـرێ کە هەڵاتوە و ئەمیرێکی تر هاتۆتە جێگەی هەمو داوودەزگاکانی سەردەمی ئەمیـری پێشـوی گۆڕیـوە، پیاوەکـانی خۆی داناوە. هەمو جار یەکتریشیان تاڵان کردوە.

لەم شەڕانەدا هەزاران کەس لە خەڵکی ناوچەکە چ ئەوانەی پیاوی میرەکان بون، یـان خەڵکـی ئاسـایی دانیشتوی شەڕگەکان بون کوژراون یا زەرەرمەند بون. تەنانەت هەندێ ئاوایی بە یەکجاری کوێر بونەتەوە.

لە پاڵ شەڕی ناوخۆی میرەکان، ئەرکێکی تریشیان لە سەر بوە. هەمو جار والی بەغداد خـۆی ئامـادەکردنە بۆ لەشکرکێشی بۆ شەڕی یاخیبانی خێڵەکانی ناوەڕاست و خواروی عیراق. میرەکانی بابان ناچـار بـون هێـزی سوارە و پیادە کۆ بکەنەوە و، بچن بەشداری شەڕەکانی والی بکەن. لەم شەڕانەش دا هەزاران کەس کوژراون.

## ناکۆکی شێخ مارف و مەولانا

لە گەڵ بنیاتنانی شاری سلێمانی دا (1199 ک) ئیبراهیم پاشای بابان مزگەوتی گەورەی سلێمانی دروست کردوە. میرەکانی بابان بایەخی زۆریان داوە بە مەلا و مزگەوت و خوێندنی دینیی. هەوڵیان داوە مەلا باش و ناسراوەکان لە دەوری داوەندی دەسەڵاتی خۆیان کۆ بکەنەوە. ئیبراهیم پاشا، لە گەڵ دروستکردنی مزگەوتی گەورە، کەسایەتی دینیی و زانستی، شێخ مارفی نۆدێ (1175 - 1254 ک/ 1838 ز)، لە قەڵاچوالانەوە بانگ کردوە بۆ سلێمانی و، کردویەتی بە مەلای مزگەوتی گەورە.

مزگەوتی گەورە، تەنیا مزگەوتی شاری سلێمانی بوە کە نوێژی جومعەی تێ دا کراوە. لە چاو مزگەوتەکانی تردا وەقفی لە هەمویان زۆرتر بۆ تەرخان کراوە و، ژمارەی خوێندکارەکانی لە ژمارەی خوێندکاری مزگەوتەکانی تر زۆرتر بوە. کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندیشی تێدا بوە.

شێخ مارف، سەیدی بەرزنجە بوە. ساداتی بەرزنجە، ئەوەی محەمەدی پێغەمەری ئیسلام بون. شانازییان بە رێچەڵەکی خۆیانەوە کردوە و، خۆیان لە خەڵکی ئاسایی بە گەورەتر داناوە. هەوڵیان داوە بە هۆی ژنوژنخوازیەوە خوێنیان تێکەڵاوی خوێنی غەیری سەید نەبێ، لە بەر ئەوە کچی خۆیان بە غەیری سەید نە داوە.

شێخ مارف، جگە لەوەی سەید و گەورەی ساداتی بەرزنجە بوە، لە سۆنگەی ئەوەی مەلای مزگەوتی گەورەی سلێمانی بوە، خۆی بە گەورەی مەلاکانی سلێمانی و بە سەرۆکی زانایانی دینیی مەڵبەندەکە زانیوە. چەندین کتێبی بە هۆنراوە و بە پەخشان بە زمانی عەرەبی داناوە. بۆ فێربونی زمانی عەرەبی فەرهەنگی عەرەبی - کوردی "ئەحمەدی" ی بە هەڵبەست بە ناوی کاک ئەحمەدی کوڕیەوە هۆنیوەتەوە.

شێخ مارف، لە گەڵ ئەوەی گەورەی ساداتی بەرزنجە و مەلای مزگەوتی گەورە بوە، شێخی تەریقەتی قادرییش بوە. تەریقەتی قادری لە شێخ عەبدولقادری گەیلانیەوە داکەوتوە و، لە رێگەی ساداتی بەرزنجەوە هاتۆتە کوردستانەوە، لە کوردستان دا ریشەیەکی کۆن و بەربڵاوی هەبوە.

شێخ مارف، دیوێتی لە پڕ کەسێ پەیدا بوە، نە سەیدە و نە لە بنەماڵەیەکی ناسراوە، مەلایەکی ئاسایی یەکێ لە مزگەوتەکانی سلێمانی بوە، چۆتە هیندستان و هاتۆتەوە، لە گەڵ خۆی، تەریقەتێکی نوێ، بە باوەڕێکی نوێ و، بە شێوازێکی نوێی کارکردنەوە، هێناوەتەوە. بە چالاکی کەوتۆتە کار، رۆژ بە رۆژ ناوبانگی زیاتر بڵاو ئەبێتەوە. لایەنگری زۆرتر ئەبێ، لە سلێمانی و شارەکانی تروە روی تێ ئەکەن، تا دێ دەسەڵاتی مەعنەوی بەهێزتر ئەبێ، خەریکە جێگە بەو لێژ ئەکا. ئەمە بۆ شێخ مارف قابیلی قوبوڵ نەبوە. بە هەمو توانایەوە کەوتۆتە دوژمنایەتی خالید.

سەرسەختترین دوژمنی خالیدی "تازە - دەرکەوتو" شێخ مارف بوە. شێخ مارف جگە لەوەی میرەکانی بابان و، مەلا و شێخ و سەیدەکانی سلێمانی لێ هان داوە، نامەی لە دژی خالید بۆ والیی بەغداد و والیی موسڵ و زاناکانی بەغداد و موسڵ نوسیوە، خالیدی تاوانبار کردوە بە درۆزنی و بە کافری. داوای دەرکردنی، بەڵکو سزادانی کردوە. لەم بارەیەوە هەندێ لە مەلاکان، بە تایبەتی هی موسڵ، نوسراویان لە سەر نوسیوە و بڵاویان کردۆتەوە. هەندێ رونوسی لێ نێردراوە بۆ حیجاز، تەنانەت هەندێ لەو نوسراوانە و وەڵامەکانیشی گەیشتونەتە شا عەبدوڵای دەهلەوی.

**شێخ مارف نامیلکەیەکی نوسیوە بە ناوی "تحرير الخطاب..."**

عثمان بگ عبدالجليل الموصلي، یەکێ لە لایەنگرەکانی شێخ مارف، ئەم نامیلکەیەی "شەرح" کردوە، لە ژێر ناوی: "بين الله الغالب، على المنكر المبتدع الكاذب"

پێ ناچێ خالید خۆی داکۆکی نوسراوی لە خۆی کرد بێ. لە ناو نوسینەکانی دا نوسینێ بە جێ نەماوە، بە قەڵەمی خالید، خۆی نوسرا بێ، بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەو تۆمەتانەی بە پاڵی داروە. راستەوخۆ وەڵامی دابێتەوە بەڵام کۆمەڵێ لە لایەنگرەکانی، کە هەمویان زانای ناوداری سەردەمەکە و، نوسەر و شاعیری

گەورە بون. ئەوان باکۆکیی سەرسەختانەیان لە خالید و. تەریقەتی نەقشبەندی کردوە. والیەکانی بەغدایش ڕێیان لە چالاکیەکانی خالید و لایەنکرەکانی نەگرتوە.

**لە وەڵامی نامیلکەکەی شێخ مارف و شەرحەکەی عوسمان بەگ دا، هەر ئەو کاتە چەند کەسێ بۆ بەرپەرچدانەوە لێیان ڕاپەڕیون لەوانە:**

عبداللە الحیدری نوسیویتی:

"القول الصواب. فی رد ما سمی بتحریر الخطاب"

محمد امین. مفتی حلە نوسیویتی:

"السھم الصائب. لمن سمی النصائح بالمبتدع الکاذب"

*(الحدیقة الندیة: 40)*

– 1 –

**دەقی فارسی نامەی مەولانا خالید**

بۆ عەباس میرزا کوڕی فەتحعەلی شاھی قاجار

گوھر درج اقبال و سعادتمندی. و اختر برج کمال و سربلندی، منظور نظر بقرای نقشبندی، اعنی مرکز دائیرەی جلالت و سرافرازی. وقرەی باصرەی شاە عباس غازی، امیرزادەی اعظم در حرز الامان ھمم قاھرە نجوم فلک ھدایت و یکە تازان عرصەی ولایت، مکنوف بودە بانواع لطایف افضال مھیمن بیھمال محفوف باشند

در اینھنگام بنوازش نامەی فقرای بینوارا یاد و بارسال نیازی درویشانەی از باطن اھل فقر بمقام استمداد امدە بودند. چە نعمتی است کە کسی در لباس مکنت و حکمرانی. و در عین جمعیت اسباب بھجت و کامرانی. باوجود مستی صھبای غرور نوجوانی. از محض نیکوسیرتی و پاکیزەسیرتی با سودازدگان محبت جمال بیھمال محبوب لایزال تقدس جماله گرمی بازاری و نسبت بە بی سروپایان بوادی فنا الفتی و سروکاری داشتە باشند. بلی تواضع ز گردن فرازان نیکو است.

دگر چە نویسد منظور انظار اکسیر اثار اولیای کبار و مورد تلطفات بیحد و عنایات ایزد افریدگار باشند.

*(دەستنوس: 193)*

– 2 –

**دەقی فارسی نامەی مەولانا خالید**

بۆ ئەمانوڵاخانی ئەردەڵان والیی کوردستان

بامان اللە خان حاکم کردستان مرقوم گشتە است:

مخلص درویشان. خان والاشان را. بھمم علیە خواجگان میسپاریم کە در ھردو سرا بکام فقرا یار و مددکارش باشند. بمنە:

بمعیت منظور این مسکین بیوجود مخلص جان فشان میرزا محمود نوازشنامەی تحریر و شمەی سفارش را بایشان تقریر نمودە بودند رسانید، و جواب ان را علی التفصیل حوالەی مومی الیە نمود کە در وقت خاص انشاءاللە تعالی گوشزد خاطر خواھد نمود. باید دانست کە

مرد خردمند احیانا بمولای حقیقی مزید محبتی و بازیردستان ترحم و مروتی و گاه گاهی فکر اخرتی در کار است والا ادمی کدام مزیت و امتیاز از نقش دیوار است بلنایذ زهرالودەی دارالغرور از دولت ابدی بازماندن خیلی از عقل دوراندیش دور است.

عزیزی چه زیبا فرموده است:

افسوس که وقت کار از دست برفت
ایام وصال یار از دست برفت
در معرض یک دولت ناپاینده
صد دولت پایەدار از دست برفت
دگر چه نویسد. والسلام والاکرام

(دەستنوس: 155)

## -6-
## خالیدی ئاوارە (1236 – 1242 ک)

### کۆچی مەولانا بۆ بەغداد

شێخانی تەریقەتی قادری نەیان توانیوە باوەڕ بە زاناکانی عیراق بهێنن کە مەولانا خالید "کافر" ە و، خوێنی حەڵاڵ بکەن. نەیان توانیوە وەزیری بەغداد ڕازی بکەن کە کارێکی دوژمنانەی بەرامبەر بکا. پاشای بابان گوێی خۆی لێ خەواندوە. بۆیە بە تەما بون خۆیان کارێ بکەن دژی، کۆتایی بەو کێشەیە بهێنێ.

بە تەما بون بەیانی ڕۆژی هەینی کاتێ ئەچێ بۆ بەجێهێنانی نوێژی هەینی. کە ئەو زەمانە نوێژی هەینی تەنیا لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی کراوە، لە بەر دەرگاکەی دا ڕێگەی پێ بگرن و بیکوژن. مەولانا و خەلیفەکانی بەم پیلانەیان زانیوە. مەولانا لە خانەقاکەی خۆی دا بۆ ڕاوێژ و پرسوڕا لە گەڵ هەندێ لە خەلیفە و دۆستەکانی کۆ بۆتەوە کەوتونەتە گفتوگۆ. دو بۆچونی جیاوازیان تێدا بوە:

> هەندێکیان پێیان وا بوە، ئەگەر ئەوان توندوتیژییان بە کار هێنا ئەمانیش بە چەک بچنەوە بە گژیان دا. بۆ ئەو مەبەستە هەندێکیان، لەوانە شێخ ئەحمەدی سەرگەڵو، چەکدارەکانی خۆیان ئامادە کردوە.
>
> هەندێکی تریان، لەوانە شێخ عوسمانی سیراجودین، پێیان باش نە بوە ئەو شەڕە بکەن، پێیان باش بوە، مەولانا بە بێ ئاگاداركردنەوەی کەس بە نهێنی کۆچ بکا و دور بکەوێتەوە لە سلێمانی.

*(ریاض المشتاقین: 176 و 246)*

مەولانا خۆی بۆچونی دوەمی پەسند کردوە بە شەو خۆی و هاوسەرەکانی و دەسوپێوەندەکانی بە بێدەنگی لە سلێمانی دەرچون. چونکە شوێنی مەبەستی خۆیان دیاری نە کرد بو، نەیارەکانیان نەیان زانیوە بۆ کوێ چون. ڕۆژی دوایی کە دوایان کەوتون بۆ ئەوەی پەشیمانیان بکەنەوە یان بە زۆر بیان گێڕنەوە بۆ سلێمانی، هەرچی دوایان کەوتوە بێ دەسکەوت گەڕاوەتەوە هەر یەکەیان قسەیەکی کردوە. ئەو شەوەی مەولانا سلێمانی بە جێ هێشتوە ڕیچ لە سلێمانی میوانی مەحمود پاشای بابان بوە. لە دوا ڕۆژانی گەشتەکەی دا بوە. ڕوداوەکەی بەمجۆرە گێڕاوەتەوە:

"20 ی تشرینی یەکەم
ئەم بەیانیە شێخ خالیدی بە ناوبانگ هەڵهات. لە گەڵ ئەوەش دا کە ڕاکردنەکەی لە ناکاو و بە نهێنی بوە، بەڵام توانی بوی هەر چوار ژنەکەیشی لە گەڵ خۆی بەرێ و تا ئێستاش نازانرێ ڕوی لە کوێ کردوە. پێش چەند ڕۆژێک کوردەکان لە عەبدولقادریان گەورەتر دادەنا. میریش وا خوی گرت بو. لە بەرامبەریا بە پێوە بوەستێ و قەنەی بۆ تێ بکات. بەڵام ئەمڕۆ بە کافری ناو دەبەن و زۆر شتیش دەربارەی لوتبەرزی و کافری و خوانەناسی دەگێڕنەوە... دوای مردنی کوڕەکەی میر، شێخ ناوبانگی زۆر دۆڕاند، چونکە وتبوی چاکی دەکاتەوە و سەیری کتێبی بۆ دەکات، بزانێ خوا چی لە چارەی نوسیوە و شتی تریش... گەلێ قسە و باسیش لە سەر هۆی ڕاکردنەکەی دەوترا و هەندێک دەیان وت تۆوی پشێوی لە نێوان میر و براکانی دا وەشاندوە و ئەوانیش ویستویانە لە بەردەم میردا بەرەو ڕویان بێتەوە. هەندێکی تریش دەڵێن خەریکی دانانی بناغەی ئایینێکی تازە بوە و ویستویەتی خۆی بکات بە گەورەی وڵات... ئیتر زۆری دەربارەی وترا و تاوانی شتی وا لەرادەبەدەریشی بە پاڵ دەدرا، کە لە ڕاستی دا وا نەبوە، چونکە زانا و سەیدەکان هەمویان و، لە سەرو هەمویانەوە شێخ مارف. ڕقیان لێیەتی... ئەویش کاتێ دەسەڵاتی هەبو، هەمویانی بەزاند بو."

*(ریچ: 288)*

**ریچ لە گێڕانەوەی باسەکە دا توانجی لە بێیاریی خەڵکی سلێمانی داوە.**

پاش چەند ڕۆژێ مەولانا لە بەغدادەوە سەری دەرهێناوە و، مژدەی گەیشتنی بە سەلامەتی لە نامەیەکی تایبەتی دا بە دایکی داوە. لە نامەکەی دا نوسیویتی: "... ئەگەر لە چۆنێتی ئەم بێ چارەیە و پیری دەستگیر پرسیار بکەن، بە نیگەهبانی پیرانی بزگوار بە هەزاران هەزار شادی گەیشتینە شاری بەغداد. ئومێد بە خوای بێ هاوتا کامیاب و لەم گەردشەی ڕۆژگار بەرکەنار بن..."

*(دەسنوس: 105)*

## مەولانا لە بەغداد (1236 – 1238 ک)

ئەوە جاری یەکەم نەبوە کە مەولانا چۆتە بەغداد. پێشتر چەند جارێ بە بۆنەی جیاوازەوە ڕوی کردۆتە بەغداد.

- جاری یەکەم بە فەقێیەتی بۆ خوێندن چوە.
- جاری دوەم دوای گەڕانەوەی لە هندستان لە سەر داوای پیری تەریقەتەکەی، شاە عەبدوڵا.
- جاری سێیەم دوای ئەوەی ئەورەحمان پاشای بابان سەرپشکی کردوە لە نێوان بەجێهێشتنی سلێمانی یا دەسهەڵگرتنی لە ئیرشاد.
- جاری چوارەم لە ئەنجامی گەلەکۆمەکێی نەیارەکانی دا.

مەولانا شارەزای بەغداد و خەڵکەکەی و کاربەدەست و دەزگای دینیی و کارگێڕیەکانی بوە. ناسیاوی لە گەڵ داود پاشای وەزیری عێراق هەبوە. بە ڕۆیشتنی لە سلێمانی نەک هەر پچوک نەبۆتەوە، بەڵکو ئاسۆیەکی زۆر فراوانتری لە سەر ئاستی مرۆیی و لە سەر ئاستی جوگرافی لە بەر دەم دا کراوەتەوە.

لە نامەیەک دا کە بۆ شێخ ئیسماعیلی بەرزنجەیی کونەکۆتری نوسیوە، ئاگاداری ئەکا ڕیسالەکەی شێخ مارف دژی ئەو بە نهێنی گەیشتۆتە بەغداد بەڵام گەورەکانی بەغداد بەرپەرچیان داوەتەوە. نوسیویتی:

"نور چشما سید اسماعیل. رسالهء کاک معروف نودهء که تکفیر و تکنیب فقیر بیمراد خفیة باینجا فرستاده بود رسید. و أکابر اینجا که علامات حقیقت این کار از خورشید رابعة النهار روشن تر می بینند. خیلی زبان بانچه او را شایسته باشد گشوىند. و او را بما یستحق او ستوىند. و بسیار تکلم باین چند بیت نمودند. بیت:

نقشـــبندیه عجـــب قافلهســـالاراننند
که برانـــداز رهء پنهـــان بحـــرم قـــافلهرا

تا بانجا که میگوید. بیت:

همه شـیران جهـان بسـتهء ایـن سلسـلهاند
روبه از حیله چه سان بگسلد این سلسـلهرا

بعد از تشریف بردن ان قرهالعین بغیر از ازدیاد رغبة طریقهء علیه. و ایـن واقـعه چیـزی رو ندانه است. البته شما هم واقعهء انجارا خواهند نویشت والسلام علیکم و حبیب و سائر أحبارا سلام رسانیم."

(مسنوس: 68)

له نامەیەک دا بۆ مەلا یەحیای مزوری نوسیوه، ئەڵێ:
"... ووصل معها جواب مکتـوب الشـیخ معـروف، عومـل بحسـن الختـام مـن الکـریم الـرؤوف، فوجدناه مسکتا له بالادلة والوجدان. ومفحما علی مسلک العلماء واهل العرفـان. فبعثنـاه الیه مـع والینا. لعله ینتفع به وماراه."

(الرقعة: 81)

## دوایین سەردانی کوردستان

مەولانا له ژیانی ئاوارەیی بەغداد بێزار بـوه. وەرزیـی کوردسـتانی کـردوه. ویسـتویەتی سـەردانێکی کوردسـتان بکـا. گەشـتە هـاوینیەکەی بـۆ هەورامـان دوایـین گەشـتە بـۆ کوردسـتان و یەکـێکە لە وێسـتگە گرنگەکانی ژیانی مەولانا. پێ ئەچێ ویستبێتی پێوەندی خۆی له گەڵ میرانی بابان، بە تایبەتی مەحمود پاشـا ئاسایی بکاتەوە و، گفتوگۆیەک لە گەڵ زانا نەیارەکانی بە تایبەتی لە گەڵ شێخ مارفی نۆدێ دەس پـێ بکـا بە هیوای خاوکردنەوەی ئەو دوژمنایەتیەی لە گەڵ ئەو هەیان بوە.

له بەغداوە لە گەڵ کۆمەڵێ لە خەلیفە و موریدەکانی، کورد و عەرەب، چۆتە سەرگەت کە هێشـتا مـاڵی حەمە خانی برای لەوێ بوە. مەولانا چەند نامەیەکی دەربارەی ئەم گەشتەی بۆ کەسانی پێوەندیـدار نوسـیوه، رەنگە بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم باسە، بەهێزترین سەرچاوە. نامەکانی خۆی بن، کە ئێستا هەنـدێکیان لە بەر دەس دان.

### نامەی یەکەم

### بۆ عوسمان بەگی نوسیوه.

عوسمان بەگ کوڕی ئەورەحمان پاشا و برا بچوکی مەحمود پاشا بوه. لەو کاتەدا حاکمی کـۆیە بـوه. مەولانا لە کۆیە خەلیفە و موریدی ناسراوی هەبوه، لەوانە: مەلا عەبدوڵای کـاکی جەلـی، مەلا عەبـاس، مـحەمەد ئاغای عیسا ئاغا، کە یەکێ بوه لە دەسەڵاتدارەکانی ئەوێ.

**لە نامەکەیدا، ئەڵێ:**

"ئێوە چەند جارێ چ بە ڕاسپاردن و چ بە نوسینی نامە هیوای گەڕانەوەی ئەم مسکینەتان بۆ ولایەتەکەی خۆتان خواستوە و، بە چەندین جۆر دڵسۆزیتان بەرامبەر بەم فەقیرە پیشان ئەدا، ئێستاش وا ئەم فەقیرە ڕوی کردۆتە ولایەتەکەی ئێوە و، نیازی هەیە چەند ڕۆژێ بە میوانی لە کوێستانی سەرگەت بمێنێتەوە".

"جۆرەها جوڵانەوەی سەیر بەرامبەر خۆشەویستانی ئێمە ئەکرێ. ئەم کارەش جێگەی سەر سوڕمانە.

سەبارەت بە موبالەغەی جاران و ئادابی گەورەیی و میوانداری گومانم وابو ئێوە ئەگەر خۆتان بە پێشوازی فەقیرەوە نەیەن، یەکێ لە کەسە ڕێزدارەکانی خۆتان ئەنێرن و، ئازار و بەدرەفتارییەکی کە پێشتر لە خەڵکی سلێمانی‌مان دی بو هەڵئەگرن. ئێستا سەرباری هەمو ئەوە ئەبیستین جۆرەها قسەی ناشایستە لە مەجلیسەکانی ئێوەدا بەم فەقیرە ئەوترێ و، خەریکی ئازاردانی هەندێ لەو فەقیرانەن کە خۆشەویستی‌یان بۆ فەقیر هەیە و، هەزاران ئیفتەرا بە زمانی ئەم لایەنە و دەسوپێوەندەکانیەوە داوە بە گوێی وکەلای عالی دا، ئەوانیش باوەڕیان کردوە. ئەم نۆخە لە هۆش و تێگەیشتنی وکەلای عالی چاوەڕوانکراو نەبو. بۆچی؟ ئەوان لە سەرەتاوە تا دوایی ئەم مسکینە لە هەمو کەس باشتر ئەناسن. مەردمی ئەهلی عیناد لە ئیفتەرا کۆتایی ناکەن.

کورتیەکەی، ئەگەر مەبەستیان برەوپێدەری تەریقەتی بەرزی نەقشبەندیە، ئەوە ئەم مسکینەیە و ئەگەر شایستەی گفتوگۆ و ململانێ بێ ئەویش هەر ئەم لایەنەیە. ئەگەر مەلاکانی، کە ئینکاری ئەربابی فەقر ئەکەن، ڕاست ئەکەن و دەعوا لە پێناوی خوادا ئەکەن، کاری مەردان جنێودان و غەیبەتکردنی فەقیران نیە.

تۆ خۆت گەنجێکی بەختیاری، لە پێناوی خوا دا ئاگری ئەم فیتنە و فەسادە بکوژێنەوە. هەڵسە! شێخ مارف و مەلا ساڵح و شێخ عەبدولکەریم، کە لە گەورەکانی زانایانن، لە گەڵ خۆت بهێنە. ئەگەر ئەڵێن ئەنگیە بۆ ئێمە بڕۆین بۆ لای فڵان، ئەم قسەیە گوێلێگیراو نیە چونکە ئەوان، بە قسەی خۆیان، دەعوا لە پێناوی خوادا ئەکەن نەک دێن بۆ لای ئەم لایەنە. ئەگەر بۆ گوندەکەی فەقیریش نایەن، با بێن بۆ گولعەنبەر ئێمە ڕازین، خۆمان ئەچین بۆ ئەوێ. ئەگەرچی پێش ئەمە، لە ڕۆژانی پاشای خوالێخۆشبودا، شێخ عەبدوڕەحیم و شێخ عەبدولکەریم لە گەڵ چەند کەسی ڕێزدار چونە لای شێخ ڕەزای بێلو کە عیلم و مەعریفەتی ئەو مەعلومی خاس و عامە، چ جای فەقیر کە چەندەها لە سادات و عولەما وەکو مەلا یەحیای مزوری و شێخ ئەحمەدی بەغدادی و مەلا عەبدوڕحیمی زیارەتی و مەلاکانی کۆیە، کە خۆت ئەیان ناسی، موریدو سەلمێنەری ڕەوایی کاری فەقیرن. ئێوەش خۆتان ئامادەی مەجلیسەکە بن. ئەم فەقیرە لە گەڵ ئەوان وتوویژ و گفتوگۆ ئەکا، ئەگەر بۆتان دەرکەوت جگە لە عیناد و حەسەد و ئیفساد مەبەستێکی تریان هەیە، ئەوا دوای ئەوە ئەگەر ئەم مسکینە دەعوای ئیرشاد و مەشیەخیەتی کرد، دەعوایەکی پوچ و بێهودە ئەکا.

ئەگەر مەلاکان خۆیان نایەن، ئێوە کە ئەربابی جاە و دەوڵەتن و، باوکی خوالێخۆشبوتان، چاکەی زۆری بەسەر ئەم مسکینەوە هەیە، بۆ ئێوەی بە گونجاو نازانم، بە قسەی بێهودە، ئازاری دڵی ئەهلی فەقر، بە ڕەوا بزانن. یەقین بزانن ئەم فەقیرە ئەگەر خۆیشی وەلی نەبێ،

بەڵام دەستی بە زنجیرەی ئەولیاوەیە. ڕەنجاندنی ئەولیا بۆ دین و دنیا زەرەری تەواوی هەیە. وەلحاسڵ ئێوە ئەبێ هاتنی ئێرە بۆ خۆتان بە سەرئێشە ئەزانن. کە باعیسی چەندەها ئەجر و سەوابە و ئەبێتە مایەی ئەمانی چەندین کێشەکێش. والسلام. ختام الکلام."

*(نامە: 68.*

*(دەقی فارسی نامەکە لە کۆتایی باسەکەدا نوسراوەتەوە.)*

## نامەی دوەم

## بۆ حسێن بەگی هەورامی نوسیوە.

حســـێن بەگ یەکـــێ بـــوە لە دەســـەڵاتدارانی نـــاوچەکە و خـــاوەنی یەکـــێ لە هەوارەکـــانی ئەوێ بوە.

**مەولانا پاش ستایشکردنی، ئەڵێ:**

"لە گەڵ چەند کەسێ لە پیاوە ئەجیبەکانی بەغداد بە نیـازی بینینـی ئەو وڵاتە چـونەتە گونـدی سەرگەت. هەمویان حەزیـان بە مـانەوەیە. هەوارەکەی ئەویـش لە هەمـو شـوێنەکانی هەورامـان جوانترە بۆیە. ئارەزویان وایە گەرمای هاوین لە ژێر سێبەری ئەودا بە سـەر بـبەن و لە پـایزدا بگەڕێنەوە بۆ بەغدادی "بورجی ئەولیا""

*(دەستنوس: 104.*

*(دەقی فارسی نامەکە لە کۆتایی باسەکەدا نوسراوەتەوە.)*

## نامەی سێیەم

## بۆ عەبدولقادر حەیدەری نوسیوە

کە یەکێ بوە لە موریدە نزیکەکانی و، لەو کاتەدا قازی بوە لە بەسرا. باسی پەشـیمانبونەوەی مەحمـود پاشا ئەکا.

**لە نامەکەی دا ئەڵێ:**

"گلەیی‌یان کردوە لە درێژەکێشـانی پچڕانـی دەنگوباسـی ئەوان و، وەڵام نە دانەوەی هەنـدێ لە نامەکانیـان... بەکەم ئەو نامەیەیـان پـێ نەگەیشـتوە. دوەم لە شـاری ئاشـتیەوە بەغـداد، بە ئیشارەتی سادەتی تەریقەت و اساطینی کشف و حەقیقەت، ڕۆیشتون بۆ لای کوردستان، تەنیـا بۆ سەردانی دایکی سەروەری. لە گەڵ ئەوانیش زۆرێک لە خۆشەویسـتەکانی بەغـدادیان، لەوانە موریدی دڵسۆزیان براکەیان مەلا عوبەیدوڵا ڕۆیشتوە.

"بەڵام دوای ئەوەی گەیشتونەتە گوندەکەی خۆیان و پێیـان ڕاگەیانـدون کە والـیی کوردسـتان ئەیەوێ قـازی سـلێمانی لە گەڵ چەنـد کەسـێکی ڕێـزدار، بە داوای لێبـوردنەوە، لەوەی خـۆی و باوکی بەرامبەر فوقەرا کردویانە. بە دوایان دا بنێرێ. ئەوانیش دەسـبەجێ گوێزاویـانەتەوە بـۆ خاکی هەورامان لە موزافاتی سنە. لەوێوە فەرمـانی داوە بە مەلا عوبەیـدوڵا ئەفەنـدی بچـێ بـۆ ماوەران بە هۆی خزمـایەتی و سـەردانی خزمـان و براکـانی. دوای تێپەڕینـی گەرمـا ئینشـاڵا ئەگەڕێنەوە بۆ شاری ئاشتی.."

*(الرقعة: 30.*

*(دەقی عەرەبی نامەکە لە کۆتایی باسەکەدا نوسراوەتەوە.)*

## نامەی چوارەم

### بۆ محەمەد ئەسعەد ئەفەندی حەیدەری نوسیوە

کە یەکێ بوە لە موریدە نزیکەکانی و، لەو کاتەدا یەکێ بوە لە موفتیەکانی بەغداد. باسی پەشیمانبونەوەی مەحمود پاشا ئەکا

**لە نامەکەی دا ئەڵێ:**

"ئینجا بۆ ئاگادارکردنیان کە ئەو، وەکو خۆی نوسیویێتی ئەو مسکینە، لە گەڵ هەمو خۆشەویستەکان گەیشتۆتە شارەزور.

"دوای ئەوەی بیستویانە مەحمود پاشا حاکمی بابان ویستویەتی قازی سلێمانی و چەند کەسێکی رێزداری تر بنێرێ، بانگیان بکا بۆ شار بۆ دڵنەوایی و هێنانەوەی ئیعتیزار لەوەی کە لە رابوردودا بەرامبەر بەو فەقیرەیان کرد بو، لە گوندەکەیانەوە گوێزاویانەتەوە بۆ هەورامان لە موزافاتی سنە، ئینجا پێیان راگەیاندون کە بریارەکەی هەڵوەشاندۆتەوە، هەندێ لە عالمەکانی سلێمانی کە لێتان ئاشکران رێیان لێ گرتوە، سپاسی خوا ئەکا چونکە حەساندونیەتیەوە لە ئەرکی بەرپەرچدانەوەی ئەوەی هیوایان بوە و، لە... پەیامهێنەکەیان. ئێستا ئەوان لە گەڵ کۆمەڵێ لە "فەقیران" سەرقاڵن بە کاروباری "فەقر و فاقە" وە...".

*(الرقعة: 39.*

*نەقی عەرەبی نامەکە لە کۆتایی باسەکەدا نوسراوەتەوە.)*

## نامەی پێنجەم

### بۆ سەید عەبدولقادر و سەید مەحمودی نوسیوە

دو کەس بون لە شاگرد و هاوکارە نزیکەکانی، کە لە سلێمانی، بەشێ لە ئیشەکانی ئەویان رایەڕاندوە.

**لە نامەکەی دا ئەڵێ:**

"نامەیەکی بۆ میری جەلیلولشەئن، عوسمان بەگ، نوسیوە، لە کاتی پێویست دا بیدەنێ و، هەوڵی زۆر بۆ سەرخستنی ناوەرۆکەکەی بدەن و، وەڵامەکەیشی بە زویی رەوانە بکەن.

"دوزمانەکان وتویانە فلانی لە موڵکی بابانەوە چوە بۆ خاکی سنە. لەم رێیەوە کورەی فیتنەی خۆیان ئەدەمێنن. مەگەر ئێوە نازانن کەلەخانی (رەنگە مەبەستی قەلاخانی بوبێ - وەرگر) چەندەها ساڵە شوێنی هاوینەی حەمەخانە و بەستراوە بە سەرگەتەوە و، بۆ سەردانی دایکی چۆتە ئەوێ... ئیتر ئەوە کام سنە و سابلاخە

ئەبێ ئەم قسەیە بە عوسمان بەگ بڵێن ئەوەکو مەلاکان بڵێن فلانی رۆیشتوە ئیتر ئێمەش ناچین بۆ لای. هەرچەندە من نامەوێ بێنە ئێرە. ئەگەر تەشریف ئەهێنن بۆ گوڵعەنبەر من خۆم بە خزمەتیان ئەگەم. لەوانەیە ئەم گفتوگۆیە پەسەند نەکەن. ئومێد هەیە بە رەئی خۆیان نەکەن. شێخ مەحمود بە هاورێیەتی مەلا عەباس زۆروکەم گفتوگۆی کردوە. وەڵامەکەیان لە نامەدا ناگونجێ..."

*(دەستنوس: 81 - 82.*

*نەقی فارسی نامەکە لە کۆتایی باسەکەدا نوسراوەتەوە.)*

دیارە هەوڵەکانی مەولانا سەری نەگرتوە، تا ئەو لە هەورامان بوە مەحمود پاشا مەلاکانی نە ناردوە بـۆ لای، هەروەها کەسایەتیەکی ناسراویشـی نە نـاردوە. عوسـمان بەگـیش، وەکـو لە نامەکـانی دا دەرئەکەوێ کە دۆستێکی نزیکی بوە، ئەویش نە چـوە بـۆ لای. کـورتیەکەی فەرامـۆش کـراوە و لێـیان نە پرسـیوەتەوە. لە ئەنجام دا بە نائومێدی گەڕاوەتەوە بۆ بەغداد. پێ ئەچێ لەو نائومێدیەدا گەیشتبێتە تینی نامەیەکی توندی بـۆ مەحمود پاشا نوسی بێ.

**نامەی شەشەم**

**بۆ مەحمود پاشای بابانی نوسیوە**

کە لەو کاتەدا حاکمی سلێمانی بوە.

**لە نامەکەی دا ئەڵێ:**

من ئەوەی مەرجی ڕاگەیاندنە بە تۆی ئەڵێم

تۆش خۆت سەرپشکی پەند لە قسەکانم وەربگری یا بێزار بی

لەو ڕۆژەوە، کە بەر لە سـەفەری هیندسـتان. "ئەم مسـکینە" تـان لە خەودا لە ژورەکەی مەلا عەبدورەحمانی جـامی، قـدس سـرە السـامی، دی بـو، شـەوی دوایـی، بە تەواوی نیازمەنـدی و دلسۆزیەوە، لە مزگەوتەکەی نزیک حەرەم، خەونەکەتـان گێـڕایەوە و، لەم ئاوارەیەتـان خواسـت چاوی لێتان بێ، تا بە ڕۆژی حکومەتەکەتان، کە لای ئەربابی فەقـر کـایەک نـاهێنێ. هەرگیـز لە هاوکاری ئێوە، کۆتاییمان نە کردوە. نە لە سەفەر و نە لە حەزەر، نە لە غـوربەت و نە لە وەتەن، زیندانیی کرماشان و ئەمیری کـۆیە و پاشـای بابـان، لە بەر چـاوی ئەم مسـکینە، بەرامـبەر و یەکسان بوە.

تەنانەت ڕۆژێ بە موقتەزای "سوکری ولایەت" و "غلبەی باطن" لە شـاهی جیهانئابـاد، بە زمـانی شەریفی، قطب الاولیاء وبرهان الاصفیاء، پیری دەستگیری ئێمە، قدس الله سره العزیـز، چەنـد وتەیەکی بتقریب دلـداری و اسـتمالتی ئەم فەقیـرە وت، لەوانە: خالیـد دۆسـتی ئـێمە و دۆسـتی خوایە، دۆستانی ئەو دۆستانی خوا و، دوژمنانی ئەو دوژمنانی خوان. لە کـاتی ئەم خۆشـیی و شادییە دا، کە موڵکی سولەیمان، لە بەرامبەری دا نرخی کـوللەیەکی نـیە، ئەدەبـی بە جـێ هێنـا، عەرزی ئەو حەزرەتە بەرزمان کرد: مەحمـود کـوڕی ئەورەحمـان پاشـا، لە جـوملەی دۆسـتانی دڵسۆزی ئەم مسکینەیە، لە ئەلقە لە گوێکانی ئەم دەرگایە دابنرێ و، ڕوحانیەتی پیرانی کیبـار لە کارەکانی دا یار و مەدەدکاری بن و، لە گرفتاریی عەجەم ڕزگاری بێ. بە چەند وشەی تر، دوای موبالەغە و ئیستیدعای زۆر، قبوڵیان فەرمو. هەندێ مزگێنیێـیان سـەبارەت بە ئێـوە دا و، ڕۆژێ کە لە کرماشان بون لە نامەیەک دا بە ئاماژە بۆ ئێوەمان نوسیوە..

و دوای ئەوە، ئەو هەمو ئەتک و ڕیسواییەی، بە دوزمانی چەند کەسێکی حەسودی بێ بنیـاد و بەدنیهاد، بە سەری ئێمەیان هێنا. ئێوە قبوڵتان کرد. هەموی خـرایە سـەر بـێ دەسـەڵاتی ئێـوە، ئەسلەن ئەوەش کاری لە گۆڕینی ئێمە نە کرد زیاتر و زیـاتر بـۆ چـاکەی ئێـوە ڕومـان کـردە ڕۆحانیەتی پیرانی کیبار.

سەرەڕای ئەوەی ئێوە خۆتان لێرە نەبون و، مدعیانی ئێوە لێـرە لە ئیلتیمـاس دا چ موبالەغەیـان کردوە، گوێمان نە داوەتە قسەی کەس. دوای ئەوەی بوی بە حاکم ئەبوایە لە پێناوی بەختیـاری هەردو دارد، خۆت بە کەڕات و بە مەڕات، بە مەقـامی ئیعتیـزاری ئەو بـێ ئەدەبیـانەی پێشـو هەستایتایە، کەسێکی ڕێزدارتان تەنیا بـۆ هێنـانەوەی ئەم مسـکینە بنـاردایە. ئەوەی رابـردوی

بژاردبایە. ئەگەرچی فەقیر ئەسڵەن دڵی بەو دیارەوە نەما بو، بەڵام بۆ بەجێهێنانی ئادابی گەورەیی خۆتان و برەوپێدانی تەریقەتی بەرزی نەقشبەندی، کە چەندەها ساڵە لەم ناوچەیەدا پوکاوەتەوە، هەوڵتان بدایە و، هەرزەبێژانی بێ سەروپاتان لە قسەی پڕوپوچ مەنع بکردبایە. تا لە بەر کوێریی حەسودیی ئینکاری نوری هەتاوی عالەمتاب نەکەن و دادی تەعزیم و تەکریمی ئەهالیی ئەم زنجیرە بەرزە بدەن، کە پاشاهان بە ماچکردنی لاشیپانەی دەرگای ئەم هەڵبژاردانەوە ئەنازن.

ئێستا ئەم کارە حەواڵەی رەئیی راستی ئەو جەنابە ئەکەم، کام لەم گەورەییانەت بە جێ هێناوە؟

سەرەرای ئەمانە هەموی وەڵامی نامەی مەردانی خودا، کە داز بە سەر چەرخی سوڕاوەدا ئەکەن نانوسیتەوە، کە زمانی حاڵیان هەمیشە ئەم وتارە ئەڵێتەوە:

چەرخ تێک ئەدەم ئەگەر بە غەیری مورادی من بگەڕێ

من نە ئەوەم کە زەبونی لە چەرخی فەلەک بکێشم

بیانو بۆ نەنوسینی وەڵامی نامە ئەهێنیتەوە، هێشتا ئیدیعای باوەڕ و خۆشەویستی ئەم مسکینە ئەکەی؟

تۆ کە بە دوای حکومەت دا ئەگەڕێی، لەوپەڕی دەسەلات دا، لە سۆنگەی ترسان لە تانە و گلەیی بەدناوکەری چەند لە رێ دەرچویەکی بێ سەرەنجام، نەتوانی چەند دێرەسەمێکی وەفا و گیانبەختکردن سەبارەت بە شێرانی زنجیرەی ئێمە بە جێ بهێنی و، بەم هۆیەوە خۆت لە ریزی هیمەتی قاهیرەی ئەم تائیفە گەورەیە و شوکری نیعمەتی مەردانی خودا. هەموی لە بیر خۆت بەیتەوە، ئیتر ئەولیائەڵلا لە تەنگانەکان دا بۆچی دەستگیریی تۆ بکەن؟

خۆشەویستی زمانی یا قەلبی ئێوە، کە لەوپەڕی دەسەلات دا، نەتوانی ئاشکرا بکەی، بە کاری چی دێ و کەی ئاساری ئەو خۆشەویستیە ئەتوانێ دەربکەوێ؟

مەگەر وەهاتان زانیوە کە ئادابی ئەربابی باطین بەو ئەندازەیە سەیر بکەی، یا ئەوەی ئەم فەقیرە بە ئەربابی باطین نازانن؟ ئەگەرنا بۆچی ئێمە ئەسراری غەیبیمان، بە زیادیەکی وەهاوە، بۆ ئێوە ئەنوسی، کەچی ئێوە ئەسڵەن گوێتان نە ئەدایە.

ئێستا سەید ئیسماعیل، بە فەرمانی حەزرەت، بۆ ئیرشاد بۆ ئەو لایە نێردراوە، ببینین چۆن رەفتاری لە گەڵ ئەکەن. والسلام.

*(دەسنوس: 24.*
*دەقی فارسی نامەکە لە کۆتایی باسەکەدا نوسراوەتەوە.)*

پێوەندیی نێوان مەولانا و مەحمود پاشا لە ئاستێکی جێگیردا نەگیرساوەتەوە. جگە لەم نامەیە لە چەند نامەی تردا کە بۆ مەحمود پاشای نوسیوە و، لە چەند نامەی تردا کە بۆ عوسمان بەگی برای مەحمود پاشای نوسیوە گلەیی ئەکا، ئەڵێ کاتێ ئەو ئەسیری عەجەم بوە هەوڵی بۆ داوە رزگاری بێ. داوای لە مورشیدەکەی کردوە دوعای بۆ بکا و هەوڵی بۆ بدا، کە لە بەغدادیش بوە بە هەمان شێوە هەوڵی داوە ببێتە خاوەن دەسەڵات و، پلە و پایە، بە هیمەت و بەرەکەتی ئەو بۆتە خاوەن حکومەت، بەڵام ئەو نەک پاداشتی ئەو دۆستایەتیەی نەداوەتەوە و، ئەو چاکانەی لە بەر چاو نەبوە، فەرامۆشی کردوە هەروەکو یەکتری نەناسن، چاوپۆشی کردوە لە ئازاردانی لایەنگرەکانی و، تەنگهەڵچنین بە مورید و خەلیفەکانی، وەڵامی نامەکانی نەداوەتەوە، باوەڕی بە بەدزمانی نەیارەکانی کردوە. لە کاتێک دا ئەو چاوەڕێ بوە مەحمود پاشا تەریقەتە

نوێیەکەی قوبوڵ بکردایە و، بە ئاشکرا بە هەمو لایەکی ڕابگەیەندایە تەریقەتی نەقشبەندی تەریقەتێکی هەقە! بە وتەیەکی تـر بە تەمـا بـوە مەحـمـود پاشـا تەریقەتـی نەقشـبەندی وەکـو تەریقەتـی ڕەسـمی حکـومەتەکەی بسەلمێنێ.

لە یەکێ لە نامەکانی تریش دا کە بۆ عوسمان بەگی نوسیوە،

"نیسبەت بە برای گەورەی نێوە، مەحمود پاشا، کۆتاییمان نە کرد بو. تەنـانەت دوای ئەوەی کە بە دەوڵەتێک شەرەفمەند بوین. کە سـوڵتانی حەوت کیشـوەر لە پەنـای ئەودا وەک نەبـو وایە. دیسان بە هۆی ئەوەوە کە زوتر ئەومان بە دڵسۆزی خۆمان هەژمار کرد بو. ئەومان فەرامـۆش نە کرد و سەبارەت بەوان ئەوەندە چاودێریمان کردوە کە بە خەیاڵی کەس دا نایەت. ئێستا کە بۆتە فەرمانڕەوا بە غروری دەسەلاتی چەند ڕۆژە، کە ئەویـش لە بەرەکەتـی حەزرەتـی ئـێمەوە بو. بە جۆرێک لە خۆبایی بون. کە گۆیا لە نێوان ئێمە و ئەودا ئاشـنایەتی نەبـوە و مافەکـانی عینایەتی مەردانی خوایان بە تەواوی لە بیر چۆتەوە. دڵ نایەوێت کە لافی دۆستایەتی و پەیمان و یەکێتـی و خۆشەویسـتی لە گەڵ بپەسـتێت. بەڵام ئەوەنـدەم لا جێگیـر بـوە کە ئەم هەژارە هەمیشە دەرهەق بە میرانی دادگەر کە ئەهلـی مـروەت و چـاودێری حـاڵی خەڵـک بـن. دوعـای سەرکەوتن و پیرۆزیم کردوە و دەکەم و، تا چەند بـۆ ڕەواجـی شـەریعەت و چـاکەی ڕەعـیەت بکۆشن. بەو ئەندازەیە شایانی دوعای ئەم هەژارە دەبن. ئیتر چاکبونی حـاڵ و جـوانی مەئـال بۆ ئەو مەرکەزی دائیرەی ئیقباله لە خواوەندی بێ هەڤاڵ تکا و سوئال ئەکەم"

*(نامە: 61.*

*وەرگێڕانی سەباح بەرزنجی)*

## پاشکۆ

سەفەرەکەی مەولانا بۆ هەورامان، دوایین سەردانی مەولانایە بۆ کوردستان و، ئیتر بە یەکجاری کۆچی کردوە بۆ شام و، جارێکی تر نەگەڕاوەتەوە بۆ کوردستان. بۆ ئەوەی خوێنەر لە وردەکاری رووداوەکان دا ئاگاداریەکی هەبێ، باشتر وایە دەقی نامەکانی مەولانا، وەکو بەڵگەی مێژوویی لێرەدا تۆمار بکرێن.

بەڵگەکانی یەکەم و سێیەم و چوارەم، پێشتر لە "یادی مەردان" دا بڵاو کراونەتەوە. بەڵام بەڵگەکانی سێیەم و پێنجەم و شەشەم جاری یەکەمە بڵاو ئەکرێنەوە.

بەڵگە بڵاونەکراوەکان لە بەر دو دەستنوس، وەکو هەبون نوسراونەتەوە. هەندێ هەڵەیان تێ کەوتوە. نوسەری دەستنوسەکان پێ ئەچێ زمانی فارسی‌یان باش نەزانی بێ. لەمە باشتر راست نەکرانەوە. بەڵام بە چاکی مەبەست ئەدەن بە دەستەوە.

### نامەی یەکەم

### بۆ عوسمان بەگی بابان

"شما بدفعات چه بسفارش و چه بتحریر مکاتیب تمنای عودت اینمسکین بولایت خود مینمودند، و انواع دلالت و اظهار اخلاص نسبت باین فقیر میکردند. اکنون اینفقیر رو بولایت شما اورده و چند روزی بمهمانی در کوهستان سرگت نیت سکونت دارد. انواع حرکات عجیبه نسبت باحبای اینجانب کرده میشود، این کار جای تعجب است.

نظر بمبالغه‌های پیشین و به اداب بزرگی و مهمان نوازی چنان گمان میبردیم شماها اگر خود باستقبال فقیر نیاین، البته کسی‌را از معتبران خود خواهند فرستاد و رفع بعضی انیت و بدسلوکیها که پیشتر از اهالی سلیمانیه دیده‌ایم خواهند نمود. اکنون علاوه‌ی همه میشنویم که انواع سخنهای ناشایسته در مجالس شما باین مسکین گفته میشود، و در صدد ایذای بعض فقرای که محبت بفقیر دارند هستند، و هزاران افترا را از زبان اینجانب و متعلقان اینجانب بگوش وکلاء عالی رسانیده‌اند و ایشان هم باور نموده‌اند، اینحالت مأمول از هوش و فهم وکلاء عالی نبود. چرا ایشان اول تا باخر این مسکین را از همه کس بهتر میشناسند، و مردم اهل عناد از افتراء کوتاهی نمینمایند.

خلاصه اگر مروج طریقه‌ی علیه‌ی نقشبندیه است این مسکین است و اگر شایسته‌ی گفتوگو و نزاع است هم اینجانب.

اگر ملاهای که انکار ارباب فقر مینمایند راست میگویند و دعوا برای خدا مینمایند، کار مردان دشنام دادن و غیبت فقراکردن نیست.

شما خود جوان سعاتمند هستید، برای خدا نائره‌ی این فتنه و فساد را خاموش گردیان، برخیز و شیخ معروف و ملا صالح و شیخ عبدالکریم، که از اکابر علما هستند، همراه خود اورده. اگر میگویند که ما عار داریم بنزد فلانی برویم، این سخن مسموع نیست زیرا ایشان بزعم خود دعوی برای خدا میکنند نه بنزد اینجانب می ایند، و اگر بقریه‌ی فقیر هم نمی ایند بشهر گلعنبر هم بیایند رضا داریم و ماخود بانجا خواهیم امد.

باوجود اینکه پیش ازین در ایام حکومت پاشای مرحوم، شیخ عبدالرحیم و شیخ عبدالکریم با چند نفر از اشخاص معتبر بنزد شیخ رضای بیلو که علم و معرفت او معلوم خاص و عام است رفته‌اند، چه جای فقیر که چندها از سادات و علماء منتهی مانند ملا یحیی مزوری و شیخ احمد

بغدادی و ملا عبدالرحیم زیارتی و ملاهای کوی که خود اوهارا میشناسد مرید و معترف حقانیت کار فقیرند و شما خود هم حاضر مجلس شوید اینفقیر با انها مباحثه گفتوگو میکنیم. اگر معلوم خاطر شما شد که سوای عناد و حسد و افساد غرض دگر ندارند خوب والا بعد از اگر این مسکین دعوای ارشاد و مشیخت نمود معلوم است دعوی پوچ و عبث میکنیم.
و اگر خود ملاها نمی ایند. شماها که ارباب جاه و دولت دنیااند. و پدر مرحوم شما بسیار نیکیها با این مسکین دارد. برای شما مناسب نمیدانیم بسخن بیهوده انیت دل اهل فقر را بر خود روا دارید. یقین بدانند اینفقیر اگر خود ولی نیست. اما تمسک بسلسلەی اولیاء دارد. اولیارا رنجانیدن برای دین و دنیا ضرر کلی دارد.
والحاصل شما می باید امدن اینجارا تصدیع ندانند که باعث چندها اجر و ثواب و موجب رفع چندین کشاکش میشود. والسلام ختام الکلام."

(نامە: 68)

## نامەی دووەم

## بۆ حسێن بەگی هەورامی

"الهی ذات حمیده صفات. مخلص جانی حسین بیگ. از شر فتن دارین در ضمن همت اولیای کبار محفوظ باشند بمنه:
اگرچه خالی از تعارف پیش ازین هم حسن سلوک و وفور اخلاص شما بوجه مطبوع بود لیکن اینعدفه از قرار رضامندی محمد خان بیگ برادرم و تقریر امیت و نیکورفتاریهای شما و فرزندان ارجمند ان مرید مخلص پایه شخصیت را بمعراج خود رسانیدەاند. خانه اباد و رویتان سفید باد. البته در مکافات این اطوار حسنه منتظر حسن نظر عنایت پیران بزرگوار بوده باشند.
چونکه فقیر درینونقت با چند کسی از نجباء بغداد بعزم تفرج این سامان وارد سرگت شده و طبع همه بغایت بدیدن مکان سردسیر و خوردن و نوشیدن اب سرد مائل است. و همه سراب سلور را درین دیار سرامد همه جاهای اورامان میدانند. و ان مکان متعلق بسرکار انمخلص است. گر شوق و رغبت کلی داشته باشند گرمی این تابستان را در سایه شما میگذرانیم و موسم پایز باز ببرج اولیای بغداد رجوع خواهیم انشاالله المهیمن العزیز والسلام علیکم."

(دەستنوس: 104)

## نامەی سێیەم

## بۆ عەبدولقادر حەیدەری

"اخص بالسلام التام القرون بمزید العز والاکرام. جناب الحسیب النسیب والادیب الاریب. المحب فی الله والمعتقد لوجه الله. فرع الشجرة المبارکة الحیدریة السید عبدالقادر افندی لازال مترقیا فی درج خلوص الفقراء ومتربیا فی حجر عنایة الاولیاء.
وبعد. فقد وصلت الوکتکم الکریمة. مخبرة عن صحة ذاتکم السلیمة. وحاکیة عن اضمحلال الفرقة الوهابیة. ومبشرة عن بعض اخبار وصولنا الی العتبة العلیة. مع بعض دواعی الاخلاص. وعلائم الاختصاص. جزاکم الله خیرا فی الدارین خیر الجزاء. وحشرکم فی زمرة خلص عباده الاصفیاء. بحرمة خاتم الانبیاء واله وصحبه الازکیاء. وشکوتم من طول انقطاع اخبارنا وعدم

جواب بعض مكاتيب كنتم ارسلتموها مع عريضة الحاج. اولا ما وصل تلك المكتوب. وثانيا انتقلنا من مدينة السلام بغداد باشارة من سادة الطريقة واساطين الكشف والحقيقة، الى طرف كردستان لمجرد زيارة الوالدة الماجدة، وانتقل معنا كثير من احبة بغداد منهم اخوكم مريدنا المخلص الملا عبيدالله افندى. لكن بعد ما وصلنا الى قريتنا و بلغنا ان والى كردستان عازم على ان يبعث فى طلبنا قاضى السليمانية مع بعض اشخاص معتبرين. معتذرا عما سلف منه ومن والده فى حق الفقراء، ارتحلنا حالا الى ارض اورامان من مضافات سنه. ومن هنا امرنا الملا عبيدالله افندى بذهابه الى ماوران لصلة الرحم وزيارة الاقارب والاخوان. وبعد مضى مدة الحر نعود انشاءالله الرحمن الى مدينة السلام. وفى ضمن ما كتبت الاعتذار عن تقصير اخى الملا عبيدالله افندى فى قلة المكاتبة مع جنابكم. العذر عند كرام الناس مقبول.

هنا، وقد تعترى احيانا بعض الاحوال الباطنية تمنع الفقراء عن الاداب الرسمية. وتشغلهم عن جميع الامور الدنيوية. فان اتفق على الندرة عدم الجواب والتعويق فى الخطاب، فليس لعدم الالتفات الى جنابكم او قلة الاحتفال بحسن خطابكم. والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته."

(الرقعة: 30)

## نامەی چوارەم

## بۆ محەمەد ئەسعەد حەیدەری

"بعد حمدالله والصلوة والسلام على اشرف رسل الله، اني اخص بالدعوات المرجوة الاستجابة في الاوقات المعلومة المستطابة، جناب العالم التحرير والعلم الشهير، جامع شرفى الحسب والنسب، وحائز خصلتي الفضل والادب، محب الفقراء الاكرم الافخم، سيدي الحاج محمد اسعد افندي مفتي بغداد الافخم، جعله الله منظورا بعين الاولياء، ورزقه مزيد الاعتقاد في السادة الاصفياء.

وبعد، فالبادى لتحرير رقعة المودة والخلوص، هو شكر احسان ودادكم الذى كأنه البنيان المرصوص، ثم اخباركم بان هذا المسكين وصل مع كافة الاحباب على شهرزور.

وبعد ما سمعنا ان محمود پاشا حاكم بابان يريد ان يرسل الينا قاضى السليمانية مع اشخاص أخر معتبرين، يدعونا الى البلد لاستمالة قلوبنا والاعتذار عما سلف منهم فى حق الفقير، انتقلنا من قريتنا الى اورامان من مضافات سنه، ثم بلغنا انه فسخ عزيمته حيث منعه بعض من لا يخفى عليكم من علماء السليمانية، فاسترحنا بحمدالله تعالى عن تكليف مدافعة مأمولهم، وتجشم م رسولهم، فالان نحن مشغولون مع جماعة من الفقراء بأمر الفقر والفاقة متحفون لكم صالح الدعوات بقدر الطاقة. والمرجو منكم تذكار هذا المسكين احيانا بدعاء توفيق اتباع السنة السنية، وان لا تقطعوا اخباركم عنا الى حين اللقاء. والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته، ما جرى للفلك حركاته."

(الرقعة: 39)

## نامەی پێنجەم

## بۆ سەید عەبدولقادر و سەید مەحمود

"جناب سعادت نصاب، سيادت انتساب، سيد عبدالقادر و سيد محمود خيوتى را بخداى بيهمتا مى سپاريم، كه از شر چشم زخم حسود عنود و منكران مردود نابود، محفوظ باشند بمنه:

نامه‌ی‌را بمیر جلیل الشأن عثمان بیگ نوشته‌ایم. البته در وقت فراغ نـامه‌ی مزبـورهرا بـاو مـی نمایند و در انجاح مضمونش سعی بلیغ می کنند و جواب را زود خواهند فرستاد.
و سخن چینان گفته‌اند که فلانی از ملک بابان بخاک سنه رفته است. و ازیـن رهگـذر کـوره‌ی فتنه خودرا دمه‌ی دانه‌اند مگر شما نمیدانید که‌له‌خانی این سالهاسـت بـورود تابسـتانی محمـد خان و متصل قریه‌ی سرگت است و فقیر بمجرد زیارت والده این مسکین دفـعه عـودت نمـوده است و در حال عودت خانه‌ی محمد خان درینجا بود ما هم توقف ناکرده باینجا رسیدیم. دگر این کدام سنه و ساوجبلاغ است که رفته‌ایم.
می باید این سخن را هم بعثمان بیگ القا نمایند مبادا ملاها بگویند فلانی دگر رفـته اسـت مـا بنزد او نمی رویم. با وجود اینکه من نمی خواهم باینجا بیایند. اگر بگلعنبر تشریف می ارند ما خود بخدمتشان خواهیم رسید و محتمل است که این گفتگـورا نپسـندند. امـا امیـد هسـت برأی خود نکنند و شیخ محمود گفتگوی زیادوکم را بصـحابت مـلا عبـاس القـا نمـوده بودنـد رسیدند جوابشان در مکتوب نگنجد. والسلام."

*(دەستنوس: 81 - 82)*

**نامەی شەشەم**

**بۆ مەحمود پاشای بابان**

"من انچه شرط بلاغ است با تو میگویم
تو خواه از سخنم پند گیر و خواه ملال

از روزی که پیش از سفر هند این مسکین را در خواب در حجـره مولانـا عبـدالرحمن جـامی، قدس سره السامی، دیده بودند و فردای ان شب امده به کمال نیازمندی و اخـلاص در مسـجد نزدیک حرم، آن خواب را نقل و چشم التفاتی را ازین آواره التماس نمودند تا بروز حکومـت شما، که در نزد ارباب فقر بکاهی نمی ارزد، هرگز امداد شما کوتاهی ننموده‌ایم. نه در سـفر و نه در حضر، نه در غربت و نه در وطن. مسجونی کرمانشاهان و امیری کوی و پاشـای بابـان در نظر این مسکین برابر و یکسان بوده است. حتـی روزی بمقتضـی سـکر ولایـت و غلـبه‌ی باطن در شاه جهان اباد بزبان شریف. قطب الاولیاء و برهان الاصفیاء، پیر دستگیر ما، قدس سره العزیز، چند کلمه بتقریب دلداری و استمالت این فقیر رفت از ان جمله: اینکه حالا دوست ما دوست خداست، و دوستان او دوستان خدا، و دشمنان او دشمنان خدایند. در عین ان طـرب و بشارت که ملک سلیمان را در جنبش قدر ملخی نیست ادب را بجا اورده در ان حضرت علـیه عرض کردیم که محمود پسر عبدالرحمن پاشا از جمله‌ی دوستان مخلص این مسکین اسـت. از حلقه بگوشان این استانه محسوب شود. و در هر کار روحانیت پیران کبـار یـار و مـددکار او شوند. و از گرفتاری عجم رستگار شود. با چند کلمه دگـر بعـد از مبـالغه و اسـتدعای بسـیار قبول فرمودند و بعضی بشارتها در خصوص شما دادند و در مکتوبی باشاره بشما نویشته‌ایم روز که در کرماشاهان بودند. و بعد از ان این هـمه هتـک و ریسـوایی را بنمیمـی چنـد نفـر حساد بی بنیاد بدنهاد بر سر ما اوردند قبول کردن همه‌را حمل بر بـی اختیـاری شـما نمـوده اصلا با شما تغییری راه نیافت و پیشتر از پیشتر برای اصلاح شما متـوجه روحانیـت پیـران کبار شده‌ایم

باوجود که شما درینجا حاضر نبوده و مدعیان شما در اینجا در التماس چه مبالغها نموده و بحرف کسی التفات ننمودهایم بعد از انکه حاکم شدی می بایست برای سعادت دارین. خود بکرات و مرات. بمقام اعتذار بی ادبیهای ماتقدم برامده. کسی معقولیرا صرف به باز طلبیدن این مسکین بفرستند. و قضای مامضی نمایند. اگرچه اصلا فقیر را تعلق خاطر بان دیار نماندهاست. اما برای اداب بزرگی شما. و در ترویج طریقه علیه نقشبندیه. که مدتهاست درین دیار مندرس شدهاست. بذل مجهود نمایند. و هرزه درایان بی سروپا را از یاوهگوییها منع نمایند. تا از کوری حسد شب پرهسان انکار نور افتاب عالمتاب نکنند. و داد تعظیم و تکریم اهالی این سلسله علیه دهند. که پادشاهان بعتبهبوس این برگزیدهگان می نازند اکنون این کار را برأی صائب انجناب محول می نماییم که کدام ازین بزرگیهارا بجا اوردی؟ علاوەی اینهمه جواب مکتوب مردان خدارا. که از ناز بر فلک دوار میکنند و همیشه زبان حالشان ناطق باین مقال است:

چرخ برهم زنم ار غیر مرادم گردد
من نه انم که زبونی کشم از چرخ فلک

نانویشته. و تعلل برای نانویشتن جواب می ارند. و باز ادعای اعتقاد و محبت باین مسکین میکنند.

تو که در جویای حکومت و عین اختیار سبب بمخافة طعن و ملامة بدنام کنندەی نیکونامی چند از راه افتاده بی سرنجامی چند راه و رسم وفا و جانفشانی را نسبت بشیران سلسله ما نتوانی بجا اری و بدین سبب خودرا در ضمن همت قاهره این طائفه کبری و شکر نعمت مردان خدارا همگی نسیا منسیا میکنی. دیگر اولیاء الله در تنگیها ترا چرا دستگیری کنند؟ و محبت زبانی یا قلبی شما. که در عین تسلط اورا اشکار نتوانی نمود. بچه کار می اید؟ و کی اثار ان محبت بظهور تواند رسید؟ یا مگر که چنان دانسته اید که اداب ارباب باطن را همین قدر باید نگاه باید داشت تا اینکه این فقیر را از ارباب باطن نمیدانند و گر نه چرا ما اسرار غیبی را با چندان مبالغه بشما می نویشتیم و شما اصلا مبالاتی بان نمی نمودی اندکی. اکنون سید اسمعیل را بامر حضرات بارشاد ان سمت فرستائیم ببینیم با ایشان چه گونه سلوک می نمائید. والسلام."

(دەستنوس: 24)

## مەولانا لە شام (1238 – 1242 ک)

مەولانا پێش ئەوەی خۆی بروات بۆ شـام، شـێخ ئەحـمەدی خەتیـب، کە بە شـێخ ئەحـمەدی هەولێـری ناسراوە، ناردوە بۆ شام. لە دیمەشق خەریکی بڵاوکردنەوەی تەریقەت و پەیداکردنی پشتیوان و موریـد بـوە، شێخ ئەحمەد لە کارەکەی دا سەرکەوتو بوە. لە دیمەشق بنکەیەکی داناوە. یەکێ لەوانەی رای کێشـاوە مـوفتی دیمەشق بوە.

مەولانا دوای ئەوەی لە سەفەرەکەی هەورامانی، لە گەڕانەوەی بۆ کوردستان، نائومێد بوە، بڕیـاری داوە بچێ بۆ شام. خێزانەکەی لە بەغداد بە جێ هێشتوە، خۆی لە گەڵ کۆمەڵێ لە خەلیفەکانی بە رێ کەوتون بەرەو شام.

ئەوانی لەم کـۆچەدا لە گەڵـی بـون: شـێخ عوبەیـدوڵای حەیـدەری، شـێخ ئیسـماعیلی هەنـارانی، شـێخ ئیسـماعیلی بەرزنجـی، شـێخ ئیسـماعیلی زلزلەیـی، شـێخ عیسـا، مەلا ئەبـو بەکـر، شـێخ مـحەمەدی فیراقـی، عەبدولفەتاحی ئاکرەیی، شێخ عەبدوڵای هیراتی، شێخ محەمەد سـاڵحی سـلێمانی، شـێخ مـحەمەد ناسـیح، شـێخ عومەر، ئەحمەدی کوردی مەکی.

مەولانا سەرەتا لە مزگەوتـی "جـامع المعلـق" لای شـێخ ئەحـمەدی خەتیـب دامەزراوە، پـاش مـاوەیەک خانویەکی کڕیوە، بەشێکی لێ کردوّتە شوێنی ئەنجامدانی نوێژی پێنج فەرزە. (*اصفی الموارد: 46*)

لە نامەیەک دا کە بۆ، مەلا عەبدولغەفوری کەرکوکی و مەلا محەمەد جەدیدی بەغدادی نوسـیوە، کە دو لە خەلیفەکـانی شـاری بەغـدادی بـون، بـاس ئەکـا کە تـا رۆژی 17 ی رەبیعـولئەوەلی 1238 ک خێـزانەکەی نەگەیشتوّتە شام. لەو ماوەیەدا خۆی دورەپەرێز راگرتوە لە بینینی خەڵک و لە ئیرشاد. شێخ ئەحمەدی خەتیب خەریکی "تەوەجوهـ" بوە و خەلیفەکانی هەر یەکەیانی راسپاردوە بـۆ شـوێنێک: مەلا ئیبـراهیم بـۆ جەزیـرە، سەید ئیسماعیلی بەرزنجی بۆ شارەزور، شێخ مەحمودی برای بۆ سلێمانی، عوبەیدوڵا ئەفەنـدی حەیـدەری بـۆ بەغداد، محەمەد مەجزوب بۆ کەرکوک، سەید تەهای شەمدینانی بۆ وان. (*الرقعة: 75*)

سێ گروپ لە زاناکانی دیمەشق، کە هەر گروپەیان زانای مەزهەبێکی ئەهلی سـوننەت و جەمـاعەت بـون بۆ تاقیکردنەوەی بیروبۆچونەکانی مەولانا سەردانیان کردوە و گفتوگۆیان لە گەڵ کردوە:

گروپی زانایانی شافیعی کە پێکهاتوە لە: عبدالرحمن الكزبري، عبدالرحمن الطيبـي، عمـر افنـدي القـري، حامد العطار، حسن البيطار.

گروپی زانایانی حەنەفی کە پێکهـاتوە لە: عبـدالغني السـادات، محمـد الرحمتـي، عمـر المجتهـد، هاشـم التاجي، محي الدين الالبلي.

گروپی زانایانی حەنبەلی کە پێکهاتوە لە: حسن الشطي، سعدي افندي الرحيباني.

هەر سـێ گـروپ بە دڵنیـایی لە بـاوەڕی دینیـی و قـوڵیی زانـایی، بە ئاسـودەیی، مەولانایـان بە جـێ هێشتوە. (*اصفی الموارد: 48*)

مەولانا لە نامەکانی دا هەمیشە بە خۆی ئەڵێ "ئەم فەقیرە"، یا "ئەم مسکینە" و، هەنـدێ جـار خـۆی بە "مرکز دائره مستمندی" و "مرکز دائره دردمندی" ناو ئەبا، بەڵام بە کردەوە "مەرکەزی دائیرەی ئیرشاد" بـوە، چوّتە هەرشوێنێ، لە سلێمانی بو بێ یان لە بەغـداد یـا شـام، ئەو مەرکەزە لە گەڵ ئەو گـوێزراوەتەوە بـۆ ئەو شوێنە. ئیتر شام بوّتە مەرکەزی تەریقەتەکەی لە سەرانسەری جیهان دا.

## کێشەی ناوخۆی تەریقەت

مەولانــا ویسـتویەتی هەنـدێ لە خەلیفەکـانی بنێـرێ بـۆ ئەسـتەموڵ بـۆ ئیرشـاد و بڵاوکـردنەوەی تەریقەتەکەی. لە گەڵ چەند کەسێکیان قسەی کردوە، لە بەر ئەوەی حەوت مەرجی بۆ داناون، لە ترسـی ئەوەی پێیان جێبەجێ نە کـرێ، کەسـیان چـونی قبـوڵ نەکـردوە، جگە لە عەبـدولەهاب سوسـەیی کە یەکـێ بـوە لە خەلیفەکانی مەولانا لە ئاکرێ لە کوردستان. *(اصفی الموارد: 68)*

عەبدولوەهاب سوسی، یەکێ بوە لە شاگرد و مورید و خەلیفەکانی مەولانا. مەلایەکی زیرەک و شـارەزا بوە، بەڵام پێ ئەچێ دوزمان بو بێ. کە چۆتە ئەستەموڵ بۆ بڵاوکردنەوە و برەوپێدان "تەرویـج" ی تەریـقەت، تەریقەتەکەی بۆ مەبەستی خراپ بە کار هێناوە، وتار و ڕەفتـاری، قسـە و هەڵسـوکەوتی لە گەڵ ئوسـوڵەکانی تەریقەت ناساز، یا پێچەوانە بوە، بەدگومانی لای کاربەدەستانی عوسمانی و بەدناوی لە ناو خەڵک دا دروست کردوە. پێ ئەچێ زەرەری گەورەی لە ناوبانگی مەولانا و تەریقەتی نەقشی دابێ. مەولانا بانگی کردۆتەوە بـۆ دیمەشق بۆ لای خۆی، بۆی دەرکەوتوە ئەوەی بە پاڵی دراوە ڕاستە. داوای لێ کردوە دەسـت لەو کـارانە هەڵ بگرێ. لای ئەو پەشیمان بۆتەوە لە کردەوەکانی، بەڵێنی داوە کە ئیتر پێڕەوی ڕێنماییەکانی مورشـیدی کامیـل بکا، بەڵام درۆی لە گەڵ کردوە، بەڵێـنەکەی نە بـردۆتە سـەر. بە دژی مەولانـاوە، بە پـێچەوانەی ئەوەوە کە لە بەڵێنی بە مەولانا داوە، نامەی بۆ موریدەکانی نوسیوە. لە سەر ئەوە مەولانا وەکو لە نامەکانی دا نوسـیوێتی: "ئیرادەی ئیلاهی دەرچوە بۆ دەرکردنی لە تەریـقەت" و دەری کـردوە، داوای لە گشـت خەلـیفە و موریـدەکانی کردوە هەمو جۆرە پێوەندیەکی لە گەڵ ببڕن و، هەر کەسێ پێوەندیشی لە گەڵ نە بڕی بێ، پێوەنـدی ئەویشـی لە گەڵ تەریقەت بڕیوە. *(الحدائق الوردیة: 313 - 314)*

لە نامەیەکی دا کە بۆ حاجی محەمەد ئەسعەد ئەفەندی نائیب زادە وەکیلی بە غدادی نوسیوە، ئەڵـێ: "لە سۆنگەی حیل و دسائس و هێنانی کەلاکی بۆگەنی دنیایی و، چەندین شتی تر کە دوای هیجرەتی شـام پـێی زانراوە، ئیرادەی ئیلاهی بۆ دەرکردنی عەبدولوەهاب دەرکەوت و ئەویان لە تەریقەت دەرکـرد و دۆسـتەکانی و دوژمنەکانیشی پاکانەیان لێ کرد..." *(دەستنوس: 112)*

هەر لەو بارەیەوە نامەیەکی بۆ مەلا یەحیای مزوری نوسیوە، *(الرقعة: 15)* لە کوردسـتان چەنـد گونـدێ بە نـاوی سوسـێ هەیە. یەکێکیـان لە سورداشـە، یەکێکیـان لە شـەقڵاوەیە، یەکێکـی تـر گونـدێکە لە ئـاکرێ، عەبدولوەهاب خەڵکی گوندی سوسەی سەر بە قەزای ئاکرێ بوە. داسیاو و نزیکی مەلای یەحیای مزوری بوە. بۆیە مەولانا هەواڵی دەرکردنی ئەوی لە تەریقەتی نەقشبەندی لە ناو هەمـو خەلیفەکـانی کوردسـتان و بەغـدادا تەنیا بۆ ئەو نوسیوە، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەویشەوە کەسانی پێوەندیدار ئاگادار بن.

بـۆ ئاگـاداركردنەوەی خەلیفەکـانی ئەسـتەمولّی لە دەرکردنـی عەبـدولوەهابی سوسـی، مەولانـا چەنـد نامەیەکی نوسیوە، بۆ ئەوەی بڕوا بە نامەکانی بکەن نامەکانی بە خەتی خۆی نوسیوە:

بۆ ئەجیب پاشا. (الرقعة: 17)

بۆ سێ لە خەلیفەکانی لە ئەستەموڵ. (الرقعة: 18)

بۆ عەینی ئەفەندی. (الرقعة: 19)

دوای دەرکردنی لە تەریقەت، عەبدولوەهاب، لە دیمەشقەوە ڕۆیشتوە بۆ مەکە لە حیجـاز و، لەوێـوە چـوە بۆ دەهلی لە هیندستان، بۆ سەردانی شاه عەبدوڵای دەهلەوی، ئەویش دەری کردوە.

عەبدولوەهاب کتێبێکی دژی مەولانا نوسیوە هەندێ پرسی بە پاڵ داوە کە پێچەوانەی شـەرع بـون. بە قسەی لایەنگرەکانی مەولانا ئەوانە ئیفتەرا بون لە ئەنجامی ڕق و کینەدا نوسیونی. "محمد امین ابن عابـدین" بە کتێبی: "سل الحسام الهندی، لنصرة مولانا خالد النقشبندی" بەرپەرچی داوەتەوە.

وەکو ئەگێڕنەوە نەیارەکانی مەولانا لە حەڵەب ڕاپۆرتی خراپیان لە سەر هەڵسوکەوتی مەولانا بۆ سوڵتانی عوسمانی نوسیوە. سوڵتان ویستویەتی ڕێگەوشوێنی قەدەغکردنی بگرێ، بەڵام شێخولئیسلام داوای لێ کردوە پێش ئەوە هیچی دەربارە بکرێ لێکۆڵینەوەی لێ بکرێ. دو کەسیان بە جلوبەرگی دەروێشییەوە ناردوە. بۆ دمشق. بۆ لێکۆڵینەوەی نهێنی لە جموجوڵ موریدەکانی تەریقەت و. شێخ خالید. هەردوکیان بە دو راپۆرتی باشەوە گەڕاونەتەوە. تەنانەت دوای گەڕانەوەیان بۆ ئەستەموڵ یەکێکیان گەڕاوەتەوە بۆ شام، لە سەر دەستی مەولانا تەریقەتی وەرگرتوە بۆتە موریدی. *(الحدائق الوردية: 314 - 315)*

## خانەقای سلێمانی

مەولانا کە لە بەغداد بوە یا لە شام، بە وردی چاودێری خانەقاکەی سلێمانی کردوە. جموجوڵ لە ناو خانەقا دا دوای رۆیشتنی خۆیشی هەر بەردەوام بوە. بەڵام هەمیشە کێشەی تێ دا بوە.

مەولانا کاتێ سلێمانی بە جێ هێشتوە شێخ عەبدوڵای هەرەوی لە جێگەی خۆی بۆ سەرپەرشتی کاروباری خانەقای سلێمانی داناوە. شێخ عەبدوڵا، کەسایەتییەکی زانا و لێوەشاوە بوە. بەڵام خەڵکی وڵات نەبوە. ئەفغانی بوە.

سەرپەرشتی کردنی خانەقا، وەکو پایەیەکی بەرزی تەریقەتی و کۆمەڵایەتی لە ناو موریدەکانی تەریقەت و لە ناو خەڵک دا. هەروەها دابەشکردنی داهاتی دارایی خانەقا، کە پێ ئەچێ کەم نە بو بێ، دوای رۆیشتنی مەولانا لە سلێمانی ململانێی لە نێوان خەلیفەکانی دا خوڵقاندوە. خەلیفەکانی نیشتەجێی سلێمانی چاویان بڕیوەتە هەردوکی.

لە نامەیەک دا کە بۆ هەمو کاربەدەستەکانی خانەقای سلێمانی بە کۆمەڵ: مەلا عەبدوڵای هەرەوی، مەلا عەبدورەحمان، دو عەبدولقادر و دو ئەحمەدی، نوسیوە، گلەیی لە بێسەروبەری کاروباری خانەقا کردوە و سەرلەنوێ ئیشوکاری بە سەر دا دابەش کردون. پلەکانی ریزبەندی کردون و، هەمان پرنسیپی گوێڕایەڵی بێ چەندوچۆنی مورید بۆ شێخەکەی دوبارە کردۆتەوە، کە "ومن قال لشيخه: لم؟ لا يفلح ابدا". واتە هەر کەس بە شێخەکەی بڵێ: بۆچی؟ هەرگیز سەرکەوتو نابێ! هەڕەشەی لێ کردون کە ئەگەر ڕێنماییەکانی جێبەجێ نەکەن، لە نێوان ئەو و ئەوان دا "فیراقی ئەبەدی" رو ئەدات. *(نامە: 148)*

لە نامەیەکی تری دا کە لە شامەوە بۆ شێخ عەلی قازیی سلێمانی نوسیوە، چەند پرسێکی باس کردوە:

یەکەم، ئەو دەنگۆیەی بە درۆ خستۆتەوە کە کاربەدەستانی سلێمانی بە خۆشییەوە بڵاویان کردۆتەوە، گوایە مەولانا لە بەر دەسکورتی و قەرزاری سەرەنجام ناچار ئەبێ. یەنا بۆ ئەوان بباتەوە و. لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ بەردەستی ئەوان. وەکو خۆی نوسیوێتی، لە شارەزور ئالۆزییەک روی داوە، هەندێ لەوانە ویستویانە ئەوە بکەن بە بیانو شارەزور بە جێ بهێڵن و رو بکەنە شام بچن بۆ لای ئەو. نەیویستوە ئەوانە بچن، خۆی وای بڵاو کردۆتەوە قەرزارە و باری دارایی باش نیە بۆ ئەوەی کەس لەوانە روی تێ نەکەن و نە بن بە بار سەریەوە.

دوەم، وەکو گوشارێ بۆ سەر ئەو گوندی سەرگەتیان لە حەمەخانی برای سەندۆتەوە.

سێیەم، پرسی خانەقای لە گەڵ باس کردوە. نارەزایی لە هەندێ لە بەڕێوەبەرەکانی ئەوێ دەربڕیوە و. هەڕەشەی دەرکردنی لێ کردون. ئەگەر لە سەر هەڵسوکەوتی پێشویان بەردەوام بن. *(نامە: 159. دەستنوس: 124)*

مەولانا لە نامەیەک دا کە بۆ یەکێ لە دۆستەکانی بەغدادی نوسیوە. *(الرقعة: 39)* دەستەواژەی سەرقاڵبونی خۆی و موریدەکانی بە "فەقر و فاقە" وە بە کار هێناوە. ساڵانی دوایی، پاش رۆیشتنی بۆ شام و

مردنی، خانەقاکەی لە سلێمانی هەر بە ئاوەدانی ماوەتەوە. نالی، وەکو لە قەسیدە رائیەکەی دا، هەواڵی سلێمانی پرسیوە ماوەیەک لە حوجرەیەکی ئەم خانەقایەدا ژیانی بەسەر بردوە. دیارە لەو سەردەمەدا کە ئەو لەوێ بـوە، کاروباری خانەقاکە و رەفتاری سۆفیەکانی جۆرێ بوە، بۆتە جێگەی رەخـنە و گـاڵتەپێکردن. نـالی دەربـارەی دەستەواژەی فەقر و فاقە ئەڵێ:

"سـۆفی لە فەقـر و فـاقە، وەکـو فـاقە فـاقی دا
تەسـبیحی دام و دانە، ریشـی دوفـاقی فـاق!"

دەربارەی خانەقاکەش ئەڵێ:

"نـالی سـەرت لە گـونبەدەکەی خانەقـا دەکـا
لایەک پڕە لە مەشعەلە و لایەک پڕە لە مەشـغەلە"

## ئاوارەیی و نۆستالجیا

مەولانا خالید لە نامەکانی دا چەند جارێ وشەی "غەریـب" و چەنـد جـارێ وشـەی "ئـاوارە" ی بەکـار هێناوە. راستیەکەیشی بەشێکی گرنگی تەمەنی لە ئاوارەیی دا بە سەر بردوە. بەڵام وشەی "غەریـب" چەنـدین لێکدانەوەی جیاواز هەڵئەگرێ، رەنگە مەبەستی "لەخۆبێگانەبون" بو بێ، یان خۆ بە بێگـانە زانـین لەو ژیـنگە کۆمەڵایەتی و سیاسیەی تێی دا ژیاوە، یان لەم دنیایە کە ژیانی مرۆڤی تێ دا کاتیە.

خالیدی لاو، خالیدی حاجی، خالیدی سەحرانەوەرد، خالیدی پیـری تەریـقەت و خالیـدی ئـاوارە، لە هەر جێیەک گیرساوەتەوە، هەمیشە سۆزی خۆشەویستی نیشتمان لە دڵ و دەرونی دا جۆشی سەندوە. ئەم سـۆزە دەرونیەی، لە دوروڵاتی دا، بە شیعری فارسی، وەکو نۆستالجایەکی قوڵ رەنگی داوەتەوە.

خالیدی سەحرانەوەرد، لە رێگەی هیندستان، کەوتۆتەوە بیری نیشتمان و دۆسـت و خۆشەویسـتەکانی و، ناڵەی دەرونی خۆی لە شیعرێکی پڕ سۆز و سوتان دارشتوە. سالم یش، دوای ئەو بە چەند سـاڵێ ئـاوارە بوە. لە ژێر کاریگەری شیعرە فارسیەکەی مەولانا، بە هەمان شێواز، شیعرەکەی بە کوردی تەخمیس کـردوە، لە دوا بەشی دا ئەڵێ:

کەس نەبێ سالم لە دنیادا وەکو من توشـی دەرد
بێ نەوا کەوتومە غوربەت، نـاتەوان و رەنگـی زەرد
شیعری مەولانا ئەخوێنم، هەڵئەکێشم ئاهی سەرد
خالــدا گــر نیســتی دیــوانە و صــحرانورد
تــو کجــا و کابــل و غــزنین و خــاک قنــدهار

سالم ئیلهامی لە شیعرێکی تری مەولانایش وەرگرتوە، بە هەمـان شـێواز و بە هەمـان کـێش و ئـاوازی "ئەلویـدا ع" ەکەی ئەو، کە لە ماڵئاوایی "خانەی خوا" دا لە حیجاز وتـویەتی. سـالم ماڵئـاوایی لە نیشـتمانەکەی کردوە، ئەڵێ:

ئەلویـدا ع، ئەی مـولکی بابـان، ئەلویـدا ع!
ئەلویـدا ع، ئەی جـایی جانـان ئەلویـدا ع!... تاد

لە بەردەمی دەرگای شاهی جیهانئاباد، کە ئەو خۆی ئەو ڕێگا دورە پڕ مەترسیەی بۆ ماچکردنی خاکی دەرگاکەی پێواوە و. ئەوەندە بە تاسەیەوە بوە ناوی ناوە: "کەعبەی ئامال". کەچی لە بەر ئەو کەعبەیەدا ڕوی کردۆتەوە دۆستەکانی کوردستانی. سەرەتای نامەکەی بەم چوارینە دەس پێ کردوە:

| | |
|---|---|
| والەی شـــوق جمـــال دوســـتان | بی نصیب از گشت بـاغ و بوستان |
| بنـــدەء وامنـــدە از وصـــل حبیـــب | خالـــد درمانـــدە در هندوســـتان |

لە سەفەرەکەی دا بەرەو شام. کە گەیشتۆتە شاری نسێبین. وەستایانە. ناوی نسێبینی لە چـوارینەیەک دا دارشـتوە. بەڵام داخ و خەمـی دوری خـۆی. کە بـوە بە بەشـی ئەو. بە ئاشـکرا دەربڕیـوە. بەڵام لە گەڵ چارەنوس ئەتوانێ چی بکا؟ ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| امـــروز کە منـــزلم نصـــیبین گردیـــد | از داغ غمت نصیب من ایـن گردیـد |
| دوری زسر کوی تو از مـن دور اسـت | اما چە توان کرد. نصیب این گردید |

لە شیعرێکی تردا، لە ستایشی کەسێک دا، باسی چەپکێ وەنەوشەی چەمی زەڵـم. هـەڵبژاردە لـە گـوڵی گوڵشەنی گولعەنبەر (خورماڵی ئێستا) ئەکا و. ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| ای مـــە بـــرج شـــرف ســـروری | وی در درج صـــــدف دلبـــــری |
| مهـــر جهـــان تـــاب و ســـپهر کمـــال | تـــازە گـــل گلـــبن پیغمبـــری |
| چنـــد بنفشـــە ز ریـــاض زلـــم | منتخـــب از گلشـــن گلعنبـــری |

مەولانـا خالیـد. لە شـیعرێکی تـری دا، داوا لە ئەسـیمی سـەبا ئەکـا بێتـە غەمخـۆری ئەو. بە دەشـتی شارەزور دا تێ بپەڕێ و پەیامەکەی بە یار بگەیەنێ. چـونکە خـۆی نـاتوانێ بـڕوا بـۆ ئەوێ. غەم ئەوەنـدەی کێوی پیرەمەگرون لە سەر دڵی نیشتوە. چاویشی وەکو سەرچاوەی ئاوی سەرچنار فرمێسک ئەڕێژێ. ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| خون شـد دلـم. نسیم صـبا غمگسـار شـو | بـر دشـت شـهرزور دمـی رهگـذار شـو |
| رفـت انـکە مـا بعـیش دران بـوم بگـذریم | زینهـار تـو وکیـل مـن دلفگـار شـو |
| میـوس خـاک ان چمـن و بعـد ازان روان | نزدیـک بارگـاە بـت پـردەدار شـو |
| ... | |
| تـاری ز چـین طـرەاش از لطـف بـاز کـن | گو سرچناررا کە تـو رشـک تتـار شـو |
| غم بر دلم نشست چو گـدرون ز داغ هجـر | ای چشمەسار چشم تو هم سرچنار شو |

بی کاری است کار جهان و جهانیان
بگریز خالد از همە و مرد کار شو

نالی لە ئاوارەیی دا پێ ئەچێ ئیلهامی قەسیدە بەناوبانگەکەی:

"قوربـانی تـۆزی ڕێگەتـم. ئەی بـادی خۆشـمرور
ئەی پەیکـی شـارەزا بە هەمـو شـاری شـارەزور..." تاد

لەم شیعرەی مەولانا وەرگرت بێ و. لاسایی ئەمی کردبێتەوە لە ناردنی پەیامەکەی دا.

## سەردانی فەلەستین و حەج

ساڵی 1240 ک سەردانی فەلەستینی کردوە، لەو سەردانەی دا سەری "بیت المقدس" یشی داوە.

هەر لەو ساڵەدا داردویەتی بە شوێن شێخ مەحمودی برای دا لە سلێمانیەوە هاتوە بۆ شام، داردویەتی لە حیجاز نیشتەجێ بێ. ئەرکی تایبەتی پێ سپاردوە.

ساڵی 1241 ک بۆ دوەم جار چوە بۆ حەج. بەر لە ڕۆیشتنی "وەسیەت" ی کردوە. کتێبەکانی و هەندێ لە داراییەکانی خۆی وەقف کردوە. بۆ سەرپەرشتی جێبەجێکردنی وەسیەتەکەی لە ناو خەلیفەکانی دا چواری دیاری کردوە، بە ڕیز: شێخ ئیسماعیلی هەناراتی، شێخ محەمەد ناسیح، شێخ عەبدولفەتاحی ئاکرەیی، ئینجا ئیسماعیل ئەفەندی غەزی.

## وەبای تاعون

مانگی ڕەمەزانی ساڵی 1242 ک لە شام نەخۆشیی تاعون بڵاو بۆتەوە.

مەولانا پێشتر کارەساتی بڵاوبونەوەی تاعونی دی بو. لە سلێمانی مامۆستاکەی خۆی، شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجی، کە ئەم لە جێگەکەی ئەو دانرا بو، بە تاعون مرد بو. چەند جارێکی تریش وەبای تاعون لە سلێمانی و ناوچەکەی دابو، ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی قڕ کرد بو. زانیویتی کە تاعون نەخۆشیەکی چەندە کوشندەیە، بەڵام ئەوسا زانایانی وڵاتانی ئیسلامی جگە لە دوعا باوەڕیان بە هیچ چارەسەرێکی تر نەبوە و، هیچ چارەسەرێک و هیچ ڕێگەیەکی خۆپاراستنیشیان نەزانیوە. پێیان وا بوە تاعون غەزەبی خوایە بە سەریان دا باریوە. لە بەر ئەوە لە ئەنجامی تێکەڵاوی دا بە کۆمەڵ لێی کوشتون.

26 ی شەوالی 1242 ک کوڕێکی مەولانا بە تاعون مردوە. بەیانی ڕۆژی هەینی لە بناری قاسیون ناشتویانە. بۆ نوێژی جومعە چونەتە مزگەوتی "جامع العداس". مەلا عیسا، ئیمامی مزگەوتەکە و یەکێ لە خەلیفەکانی مەولانا، ئەویش توش بوە. بە زەحمەت نوێژەکەی پێ تەواو کراوە. ڕۆژی دواتر مردوە.

لە پاش چەند ڕۆژێ کوڕێکی تری مەولانا تاعون کوشتویەتی. تەرمی ئەویشیان بردوە لە بناری قاسیون لە تەنیشت براکەیەوە ناشتویانە. مەولانا لەوێ شوێنێ بۆ گۆری خۆی و هاوسەرەکانی و خەلیفەکانی دیاری کردوە و، گۆڕێکی بۆ خۆی بە هەڵکەندن داوە. لە گەڕانەوەی دا بۆ ماڵەوە، ئیسماعیل ئەلغەزی بانگ کردوە "وەسیەتنامە" ی بۆ بنوسێ. غەزی هەم برای یەکێ لە هاوسەرەکانی بوە، هەم خەلیفەیەکی نزیکی بوە. بە پێی وەسیەتەکەی بە دوای یەک دا ئەم خەلیفانەی بە جێنشینی خۆی و وەصی لە سەر خێزانەکەی داناوە: ئیسماعیل هەناراتی لە سەر سوجادەی ئیرشاد و وەصی لە سەر خێزانەکەی و چاودێر بە سەر وەقفەکانیەوە، دوای ئەو محەمەد ئەلناصیح، دوای ئەو شێخ عەبدولفەتاح عەقری، دوای ئەو ئیسماعیل غەزی. بۆ ئەوەی هەر یەکێکیان مردن، بێ کێشە و هێنان و بردن، ڕاستەوخۆ ئەوی دوای ئەو جێگەی مەولانا بگرێتەوە. سوجادەی ئیرشاد نە بە چۆڵی بمێنێتەوە و، نە ناکۆکی لە نێوان خەلیفەکانی دا دروست بکا.

هەمو خەلیفەکانی کۆ کردۆتەوە وەسیەتەکەی لە بەردەم هەمویان دا دوبارە کردۆتەوە. داوای لێ کردون تەبا و کۆک و یەکگرتو بن، هەمویان گوێڕایەڵی جێنشینەکەی بن.

بەر لە مردنی مەولانا، محەمەد ئەمین بن عابدین، بۆ پرسەی کوڕەکانی چۆتە سەردانی مەولانا، وتویەتی:

لە خەوم دا تۆم بینی نوێژی مردوت لە سەر تەرمی عوسمانی کوڕی عەفان ئەکرد.

مەولانا لە وەڵام دا وتویەتی:

"ئەوە منم ئەمرم چونکە من لە ئەوەی عوسمانم!"

## مردنی مەولانا

دوای ئەوەی لای چۆڵ بوە چۆتە ژورەوە بۆ لای هاوسەرەکانی. ئامۆژگاری کردون.

بەیانی چوارشەمە 11 ی زیلقەعیـدەی 1242 ک. نیشـانەکانی تـاعونی لـێ دەرکەوتـوە و کـاری تـێ کردوە. داوای کردوە کەس نەچێ بۆ لای.

رۆژی پێنجشەمە 12 ی زیلقەعیدەی 1242 ک. ریگەی بە خەلیفەکـانی داوە بـۆ یەک جـار بچـن بـۆ بینینی. 20 خەلیفە بە یەکەوە چونەتە ژورەوە بۆ سەردانی. مەولانا لە سەر لای راست روەو قیـبلە راکشـاوە. بە ئیشارەت پێی وتون قسە نەکەن و زۆر نەمێننەوە و برۆن.

ئێوارەی هەینی 13 ی زیلقەعیدەی 1242 ک مردوە.

قازی شام ئاگـاداری بانگـدەرەکانی مـزگەوتە گەورەکـانی کـردوە کە هەواڵەکە بە خەڵـک رابگەیەنـن. تەرمەکەیـان بـردۆتە مزگەوتـی "یەلبەغـا" نـوێژی مـردوی لە سـەر بکـرێ و، لەوێـوە ببـرێ بـۆ گۆرسـتان. قەرەباڵغیەکی زۆری لە سەر کۆبۆتەوە. بە ئیمامەتی شێخ عەبدورەحمان کەزبەری نوێژی لە سەر کـراوە. زۆری ئامادەبوان نەیان پەرژاوە نوێژی لە سەر بکەن. دوای ئەوەی بردویانە بۆ قاسیون، بە ئیمامەتی محەمەد ئەمـین بن عابدین، دوبارە نوێژی لە سەر کراوە. ئینجا بە خاکیان سپاردوە.

### خەون و زیندەخەو

مەولانا کەسایەتیەکی بەهێز بوە. کاریزمایەکی کەم وێنەی هەبوە. کاریگەریەکی قوڵی لە سەر خەلـیفە و موریدەکانی هەبوە. لە مردنی دا هەزاران کەس لە پرسەکەی دا بەشدار بون. دەیان قەسیدەی درێژ لە شـیوەنی دا هۆنراونەتەوە. دەیان کتێب لە سەر ژیان و مەناقیب و کەراماتی نوسراون. سـەدان چیرۆکـی جۆراوجـۆری گەورەیی و توانای ژورئاسایی بۆ هەڵبەستراوە. لە رۆژانی مردن و ناشتن و پرسەکەی دا گەلێ کەس خەونـی دیوە و خەونی گێراوەتەوە. لەوانە:

محەمەد ئەمین بن عابدین، یەکێ لە خەلیفەکانی مەولانا، لە زمانی پیاوچاکێکەوە گێڕاویتیەوە:

لە شەوی مردنی مەولانا دا، مانگ لە ئاسمانەوە، بە سەر ماڵەکەی ئەو دا بەر بۆتەوە.

شێخ عەبدولقادری دیمەلانـی، یەکێکـی تـر لە خەلیفەکـانی مەولانـا، خەوێکـی گێـڕاوەتەوە. لە خەوی دا مەولانا لە سەر گۆڕەکەی دانیشتوە. خەلیفەکانی لە دەوری بون. دەرگاکانی ئاسمان کـراوەتەوە. حوریەکـان بە رازاوەیی لە بەر دەرگا چاوەڕێ بون.

شێخ لێی پرسیون: چاوەڕوانی چی ئەکەن؟

وتویانە: مەلا بەکر دێ بۆ لامان.

دوای ناشتنی مەولانا رویان کـردۆتە مـزگەوت بـۆ نـوێژی جـومعە. مەلا بەکـر، یەکـێ لە خەلیفەکـانی مەولانا، پێشەوای مزگەوتەکە بوە. ئەو دیوەڕۆیە بە زەحمەت لە سەر مینبەری مزگەوتی عەباس نـوێژەکەی پـێ تەواو کراوە، چونکە تاعون لەویشی داوە. ئەویش رۆژی یەکشەمە مردوە.

هەر عەبدولقادر دیمەلانی، لە زمانی پیاوێکی ئەهلی تەقوا و سەلاحەوە گێڕاویتیەوە:

"ئەو پیاوە لە مزگەوتی عارفی گەورە، شێخ محێدینی عەرەبـی بـوە. شـێخ لە گـۆڕەکەی هـاتۆتە دەرەوە بۆ ناو مزگەوت. کۆمەڵێ لە ئەتباعەکانی لە گەڵ بـوە. کـابرا هـۆی دەرهـاتنی پرسـیوە. یەکێکیان پێی وتوە شێخ ئەیەوێ بڕوا بۆ بناری قاسیۆن بۆ ئەوەی سڵاو لە حەزرەتی مەولانـا خالید بکا. کابرا شوێنیان کەوتوە تا گەیشونەتە گردەکە. سەرگردەکە خانوی گەورەی لـێ بـوە کە ئەم پێشتر هەرگیز نەی دیون.

حەزرەتی مەولانا بە خێرایی لە خانوەکان هاتۆتە دەرەوە بۆ ئەوەی پێشوازی لە شێخ محێدین بکا. شێخ و مەولانا کە گەیشتونەتە یەکتری وەکو لە دو سەفەری دورەوە هاتبن، سڵاویان لە یەکتری کردوە و، دەستیان کردۆتە ملی یەکتری. حەزرەتی شێخ گلەیی لە حەزرەتی مەولانا کردوە، کە بۆچی تا ئێستا لە گەڵی کۆ نە بۆتەوە.

**حەزرەتی مەولانا وتویەتی:**

مەشغول بوم، حەزرەتی حەق، جل جلالە وعظم نوالە، هەر هەشت دەرگاکانی بەهەشتی بۆ کردومەتەوە، فەرمانی پێ کردوم لە بەر دەم هەر یەکێ لەو دەرگایانەدا یەکێ لە ئەتباعەکانم دابنێم، بۆ ئەوەی هەرکەس لەم تاعونە دا بمرێ، ئەوان پێشوازی بکەن.

کابرا وتویەتی:

روانیم هەر هەشت دەرگاکانی بەهەشت کرا بونەوە. کەس ناتوانێ باسی خۆشییان بکا. لە بەر هەر دەرگایەکیان دا، یەکێ لە تابیعەکانی حەزرەتی کەریم وەستا بو، سەیری هاتوانی ئەکرد. ئەگەر پیاوێ لە رۆیشتن دا ناتەوان یا لاواز بوایە، ئەوان دەستیان ئەگرت و ئەیان برد بۆ ژوری بەهەشت.

کابرا لە حەزرەتی کەریمی پرسیوە:

ئەم تاعونە کەی ئەڕوا؟ داوای یارمەتی لێ کردوە.

مەولانا وتویەتی: ئینشائەڵا دەفعی ئەکەین.

کابرا پرسیویتی:

گەورەم ئەگەر ئەمە قەزاوقەدەری خوا بێ چۆن دەفعی ئەکەن؟

مەولانا وتویەتی:

ندفعه بالله لله!" (اصفی الموارد: 61)

ئەم چێرۆکانە و دەیان چیرۆکی تر کە نوسەرانی بیۆگرافیەکانی مەولانا خالید، وەکو راستیەکی بێگومان، تۆماریان کردوە، نیشانەن بۆ پێوەندی رۆحیی خالیدی پیری تەریقەت لە گەڵ خەلیفە و مورید و مەنسوبەکانی. مەولانا خالید هیچ دەسەڵاتێکی دنیایی نەبوە. نە توانیویتی هیچ پلەیەکی حوکمڕانی بە کەس ببەخشێ، نە پارەیەکی ئەوەندە زۆری هەبوە خەڵکی پێ بکڕێ، بەڵام کاریگەریەکی سایکۆلۆجی ئەوەندە بە هێزی هەبوە، ئەو هەمو پیاوە گەورەیە شوێنی کەوتون و، خەویان بە تواناکانیەوە بینیوە و، ئومێدی گەورەی دینیی و دنیاییان لە سەر هەڵچنیوە. خۆیشی ئەمەی زانیوە. لە یەکێ لە شیعرەکانی دا بەوپەڕی راستگۆییەوە دەری بڕیوە، ئەڵێ:

بە معمار غمت نو ساختم ویرانهء خودرا
بە یانت کعبه کردم عاقبت بتخانهء خودرا
فرو مانند اطبای جهان از چارهام اخر
بە دردی یافتم درمان دل دیوانهء خودرا
ز سودایت چنان بدنام گشتم در همه عالم
بگوش خود شنیدم هر طرف افسانهء خودرا... تاد

بە وەستای غەم، ویرانەکەی خۆمم نۆژەن کردەوە و،
بە یادی تۆ، سەرەنجام کەعبەم کرد بە بتخانەی خۆم
هەمو پزیشکەکانی جیهان لە چارەسەری من دامان
بەڵام دڵە دێوانەکەی خۆم لە دەرێک دا دەرمانەکەی دۆزیەوە
لە سۆنگەی سەودای تۆوە، لە دنیادا وەها بەدناو بوم
بە گوێی خۆم لە هەمو لایەک گوێم لە ئەفسانەی خۆم بو...  تاد

**مردنی هەنارانی**

**وەبای تاعون لە ناو خەلیفە و موریدەکانی مەولانا دا بڵا بۆتەوە.**

ئیسماعیلی هەنارانی لە سەر سوجادەی ئیرشاد دانیشتوە دەستی کردوە بە کارەکانی.

هەناران گوندێکە لە دۆڵەڕوتی سەروی شاری سلێمانی. ئیسماعیل یەکێ بوە لە شاگردە نـزیکە دڵسـۆز و گوێڕایەڵەکانی، کە بە درێژایی تەمەنی ئیرشادی مەولانا، لە گەڵ خۆی بوە. مەولانـا ئەوەنـدە متمـانەی پـێ بوە بەر لە مردنی خۆی وتویەتی: "مادام شێخ ئیسماعیل ماوە وا بزانن من ماوم و نەمردوم!"

تاعون لە جێنشینەکانی داوە.

لە یەک ڕۆژدا شێخ عەبدولفەتاحی ئاکرەیی و شێخ محەمەد ئەلناصیح تـوش بـون. پـاش دو ڕۆژ شـێخ محەمەدی کوشتوە، بەڵام عەبدولفەتاح ماوە.

ڕۆژی دەهەم لە شێخ ئیسماعیلی هەنارانی داوە پاشا 14 ڕۆژ کوشتویەتی. 4 ڕۆژ پـێش ئەوەی بمـرێ وەسێتی کردوە. بۆ سەرپەرشتی وەقفەکانی شـێخ مـحەمەد بـن عەبـدوڵا ئەل خـانی دیـاری کـردوە، بەڵام بـۆ دیاریکردنی بۆ جێنشینی خۆی لە جێگەی مەولانا لە سەر بەرماڵی ئیرشاد خەلیفە و موریدەکانی کـۆکردۆتەوە ڕاوێژی پێ کردون لە دوای مردنی ئەو کێ بیبێـتە "مورشـید". خەلیفەکـان سـەریان لـێ شـێواوە چـونکە هەر کەسەیان خۆی بە شایستەی ئەو جێیە زانیوە و ویستویەتی خۆی بێ.

ئیسماعیل غەزی وتویەتی: "ساڵی پار، مەولانا کە چو بۆ حەج، لە وەزیریب وەسـێتی نوسـی و نـاردی بۆ من و شێخ محەمەد ئەل ناصیح. مەلا عەبدوڵای هەرەوی کردۆتە خەلیفەی موتڵەق لە سەر بەرمـاڵی ئیرشـاد، دوای ئەو محەمەد ئەلناصیح، دوای ئەو شێخ عەبدولفەتاح، دوای ئەو ئەم فەقیرە. لەم وەسێتەدا باسـی خەلافەتـی تۆی نەکردوە."

هەنارانی سپاسی کردوە. هەرەوی لەو کاتەدا لە سلێمانی بوە. هەنارانی نامەی بۆ نوسیوە بگاتە شـام. داوای لە گشت خەلیفەکان کردوە تا هەرەوی دەگات، هەر کەسەیان، لە شوێنی خۆی، خەریکی تەوەجوهـ بێ.

مەولانا تۆڕێکی ڕێکخراوەیی فراوانی خەلیفە و موریدی لە سەرانسـەری وڵاتـانی ئیسـلامی دا لە دوای خۆی بەجێ هێشتوە. مردنی کتوپڕی مەولانـا بـۆ هەمویـان چـاوەڕوان نەکـراو بـوە. کەسـایەتی ئەو لە نـاو خەلیفەکانی تەریقەتەکەی دا ئەوەندە گەورە و بەهێز و کاریگەر بوە، دوای ئەو ئیتر کەسێکی تر نەی توانیـوە جێگەی بگرێتەوە و، ئەو بۆشاییەی ئەو بەجێی هێشتوە پڕ بکاتەوە.

**ئەم پیاوە چی ویستوە؟**

مەولانا ئەو ڕۆژەی مردوە تەمەنی لە پەنجا ساڵ کەمتر بوە (1193 - 1242 ک). ئاخۆ ویستی ئەو، کە ئەو هەمو هەوڵەی بۆ داوە و بەرگەی ئەو هەمو گوشارەی گرتـوە، هەر تەنیـا پێـڕەوی کیتـاب و سـوننەتی ڕەسول بوە، یان لە ژێر چەتری ئیسلامەتیەکی پاک دا ئامـانجێکی گەورەتـری هەبـوە، بەڵام بە هـۆی مەرگـی ناوەختەوە بە ڕانەگەیەنراوی بردویەتیە ژێر گڵ؟

**ئەمە پرسیارێکە وەڵام نەدراوەتەوە.**

دوای مردنی مەولانا خەلیفەکانی، هەر یەکەیان لە شوێنی خۆی و لە خانەقاکەی خۆی دا، درێژەی بە ئیرشاد داوە. بەڵام خەلیفایەتی ئیرشاد لە هەمو شوێنەکان لە ناو خێزانەکانیان دا بوّتە "وراثی". کوڕ جێگەی باوکی گرتۆتەوە. مەولانا خۆی لەو کاتەدا کوڕێکی وای نەبوە جێگەی بگرێتەوە، بەڵام شێخ مەحمودی برای و محەمەد ئەسعەدی برازای شوێنەکەیان گرتۆتەوە.

دوای مردنی مەولانا، ناوەندێتی لە ئیرشادی تەریقەتەکەدا نەماوە. نەقشبەندی بۆتە تەریقەتێکی نەناوەندی. دۆستایەتی لە نێوان خەلیفەکان دا ماوە، ناوەندێتی لە ئاراستەکردن دا نەماوە. یەک مورشیدی کامیل نەبوە هەمویان ئاراستە بکا و هەمویان گوێڕایەڵی و ملکەچی بکەن.

خەلیفەکان، هەمو بون بە شێخی ئیرشاد، هەریەکەیان مورید و مەنسوبی خۆی هەبوە، هەندێکیان بۆ ئەوەی سنوری نفوزی خۆیان فراوان بکەن، ئیجازەی ئیرشادیان داوە بە خەلیفەی تر. پلەی "مورشیدی تەریقەت" یان لە ناو خێزانەکانی خۆیان دا هێشتۆتەوە. دەزگاکەیان کردوّتە دامەزراوەیەکی "ویراسی"، لە باوکەوە بۆ کوڕ. سەرچاوەی دارایی‌یان بۆ خۆیان پەیدا کردوە.

شێخایەتی تەریقەت لە کوردستان دا بۆتە یەکێ لە شێوەکانی دامەزراندنی سیستەمی دەرەبەگایەتی. ئەوان خاوەنی زەویوزار و خەڵک جوتیاری بێ زەوی. ساڵی 1958 کە حکومەتی جمهوری لە عیراق دا "قانونی ئیسلاحی زەراعی" دەرکرد. بەشی زۆری شێخانی تەریقەت بەرکەوتن. سێ بنەماڵەیان لە ریزی زەویدارە هەرە گەورەکانی عیراق دا بون، لەوانە: دو خێزانیان لە کەرکوک. خێزانێکی شێخی قادری، سەدوسیوحەوتهەزارو سەدوشەستوسێ (163.137) دۆنم ئەرز و ئەوی تریان، خێزانێکی شێخی نەقشبەندی، چلودوهەزارو سێسەدوپەنجاویەک (351.42) دۆنم ئەرز و، لە سلێمانی یەک خێزانی شێخی قادری حەفتاویەک هەزارو حەوتسەدوشانزە دۆنم (716.71)، ئەرزیان هەبوە. *(حنا بطاطو: 1/82-85)*

شێخانی تەریقەت، ناوبانگیان پەیدا کردوە، نفوزی دینی‌یان زیاد و، دەسەڵاتی دنیایی‌یان پەیدا کردوە. بونەتە خاوەن زەوی و ران و رەوە. سوڵتانەکانی عوسمانی بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی خۆیان، بە تایبەتی دوای کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی میرایەتیە کوردییەکان، لە کوردستان یارمەتی بەهێزبونی دەسەڵاتی ئەوانیان داوە. وەقف یان بۆ تەرخان کردون، موچەیان بۆ بریونەتەوە، خانەقا و تەکێیان بۆ دامەزراندون، کاربەدەستانی حکومەتی رێزیان لێ گرتون. بە مانەش پایەی کۆمەڵایەتی‌یان بەهێز بوە. لە خێزانی بچوک و نەناسراوەوە بون بە بنەماڵەی فراوان و دەسەڵاتدار.

## سەرچاوە

بۆ نوسینی ئەم باسە سود لە گەلێ سەرچاوە وەرگیراوە، لەوانە:

**بە عەرەبی**

الشيخ عثمان بن سند الوائلي النجدي.
اصفى الموارد. من سلسال احوال مولانا الامام خالد.
المطبعة العلمية بمصر - 1313 .
شێخ عوسمان ئەم کتێبەی ساڵی 1234 ک نوسیوە. لە پەراوێزی ئەم کتێبەدا کتێبێکی تر چاپ کراوە، لە نوسینی:
محمد بن سليمان الحنفي البغدادي.
الحديقة الندية في الطريقة النقشبندية والبهجة الخالدية.
نوسەر باسەکەی تا ساڵی 1233 هێناوە. بە سەری دا مردوە، محەمەد ئەسعەد ساحێب زادە، کوڕی شێخ مەحمود ساحێب (1197 - 1283 ک) و. برازای مەولانا درێژەی پێ داوە و هەندێ پەراوێزی بۆ زیاد کردوە.
الرسائل المغنية لكل محتاج.
رسائل ارسلها الملا يحيى المزوري الى الشيخ معروف النودهي.
اعدها وقدم لها: محمد القرهداغي.
اربيل - 2009.
محمد امين بن عمر بن عبدالعزيز. المعروف ب (ابن عابدين الحنفي.
سل الحسام الهندي لنصرة مولانا خالد النقشبندي.
اربيل - 2009.
عبدالمجيد بن محمد الخاني.
الحدائق الوردية في حقائق اجلاء النقشبندية.
اربيل - 2009.
الشيخ رسول الكركوكلي.
دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد.
ترجمة موسى كاظم نورس.
منشورات الشريف الرضي، قم - 1413 هـ

**بە فارسی**

كاتب الاسرار ملا حامد بيساراني.
سيري در رياض المشتاقين.
در بيان احوال و مناقب حضرت مولانا خالد ضياءالدين
و حضرت شيخ عثمان سراج‌الدين قدس سرهما
به تصحيح و مقدمه و حواشي و تعليقات: ابوبكر سيهرالدين
ايران - 1386
مەلا حامیدی مەلا عەلی بێسارانی (1223 - 1310 ک) ساڵی 1251 چۆتە هەورامان بۆتە کاتبی ئەسراری شێخ عوسمانی سیراجودینی نەقشبەندی تا مردنی هەر لەوێ ماوەتەوە و هەمان کاری کردوە. ساڵی 1274 دەستی کردوە بە نوسینی کتێبی "ریاض المشتاقین". ساڵی 1277 لە نوسینەوەی بۆتەوە.
عبدالقادر ابن رستم البابانی.
تاريخ و جغرافياي كردستان موسوم به: سير الاكراد.
به اهتمام محمد رؤووف توكلي.
تهران - 1366 .

به کوردی

مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس.
یادی مەردان. بەرگی یەکەم.
بەغداد - 1979.
بەشێکی زۆری نامەکانی مەولانا خالید بە فارسی و عەرەبی. هەروەها دیوانی شیعرەکانی. لەم سەرچاوەیەدا هەیە.
جگە لەم سەرچاوە چاپکراوە سود لە چەند سەرچاوەی دەستنوس وەرگیراوە. لەوانە:
دو دەستنوسی "مەکتوبات" ی مەولانا خالید کە تێکەڵاوە لە نامە فارسی و عەرەبیەکانی یەکێکیان لە 21 ی شەعبانی 1293 لە لایەن "عبدالفتاح النقشبندی الخالدی کردی" نوسراوەتەوە. ئەوی تریشیان کۆنە بەڵام ساڵی نوسینەوەی لە سەر نیە. هەندێ نامە لەم دو دەستنوسەدا هەیە. لە یادی مەردان دا نین.
هەروەها چەند دیوانێکی دەستنوسی مەولانا خالید.
کۆپی ئەم دەستنوسانە لە بنکەی "ژین" وەرگیراون.
نامە فارسیەکانی مەولانا. ئەوانەی لە یادی مەردان دا هەن. کراون بە کوردی:
مەکتووبات.
وەرگێڕدراوی نامە فارسیەکانی مەولانا خالید.
دکتۆر سەباح بەرزنجی وەریگێڕاوە و پەراوێزی بۆ داناوە.
هەولێر. ئاراس - 2009.
نامە عەرەبیەکانی مەولانا. ئەوانەی لە یادی مەردان دا هەن. کراون بە کوردی:
نامە عەرەبییەکانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی.
وەرگێڕان و لێکدانەوەی: ئیبراهیم فەتاح
هەولێر. ئاراس - 2009.
بەشێکی زۆری شیعرە فارسیەکانی مەولانا لە لایەن پیرەمێردەوە کراوە بە کوردی و. لە چلەکان دا لە ڕۆژنامەی "ژین" دا بلاوی کردونەتەوە. لە کتێبێکی تایبەتی دا کۆ کراونەتەوە و چاپ کراون:
ڕۆحی مەولانا.
پیرەمێردی شاعیر کردوویە بە کوردی.
ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەی: محمود احمد محمد.
بەغداد - 1987.
کلاودیوس جەیمس ریچ.
گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان 1820.
لە عەرەبیەوە محەمەد حمە باقی کردویە بە کوردی. بەرگی یەکەم.
ئەم گەشتنامەیە چەند جارێ چاپ کراوە.
محمد القزلجي.
التعريف بمساجد السليمانية ومدارسها الدينية.
بغداد - 1938.
تەرجومەی کوردی:
ناساندنێکی مزگەوتەکانی سلێمانی و خوێندنگە ئاینییەکانی.
وەرگێڕانی: د ئاراس محەمەد صالح.
سلێمانی - 2013.
محمد امین زکی.
تاریخی سلیمانی و ولاتی.
بەغداد - 1939.

# ئاینی بابی و بەهایی

سەید عەلیمحەمەدی شیرازی (1225 - 1266 ک) لە شیراز لە دایک بوە و، لە 19 ساڵی دا چۆتە بوشەهر، لە سەر پیشەی باوکی چەند ساڵێ خەریکی بازرگانی بوە. دوای ئەوە دەستی لە بازرگانی هەڵگرتوە چۆتە "عتبات" لە لای سەید کازمی رەشتی خوێندویەتی.

سەید کازم پێڕەوی لە شێخ ئەحمەدی ئەحسایی (1166 - 1242 ک) کردوە. شێخ ئەحمەد دانەری ریبازی "شەیخیە" بوە. دوای مردنی شێخ ئەحمەد، سەید کازمی رەشتی (1212 - 1259 ک) جێگەی گرتۆتەوە. هەردوکیان دو ئاخوندی بنچینەوانی شیعە بون و، بە بۆنەی تێپەڕینی هەزار ساڵەوە بە سەر غائیب بونی ئیمام، لە نوسین و وتەکانیان دا مژدەیان بە شیعە و بە خەڵک داوە کە رۆژی دەرکەوتنی مەهدی "مەوعود" نزیک بۆتەوە، خۆیان ئامادە بکەن بۆ پێشوازی و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی. ئەم باوەڕە لە ناو مەزەبی شیعەدا زەمینەی هەبوە و بڵاوبۆتەوە. سەید کازم لە کەربەلا دەرسی وتۆتەوە، بە سەدان شاگرد و، بە دەیان پێڕەویکەری هەبوە. کتوپڕ کە مردوە بێ ئەوەی کەسی بۆ جێنشینی خۆی دیاری کرد بێ، پێڕەویکەرەکانی کۆ بونەتەوە، لە ناو خۆیان دا رێک کەوتون بە ناوچە جیاوازەکان دا بڵاوەی لێ بکەن و بە دوی "مەوعود" ا بگەڕێن. هەر یەکێکیان رێکەوتی مەوعودی کرد ئەوانی تری لێ ئاگادار بکاتەوە، تا هەمویان بەیعەتی پێ بکەن و، کاری لە گەڵ بکەن.

مەلا حوسەینی بوشرەوی، یەکێ لە شاگردەکانی رەشتی، سەید عەلیمحەمەدی شیرازی لە بوشەهر دۆزیوەتەوە. پاش بینین و گفتوگۆ و، نیشانەکانی کە رەشتی بۆ مەوعودی دانابو، لەم کەسە گەنجەدا بە دی ئەکا، خۆی یەکەم کەس بڕوای پێ ئەهێنێ و، هاوڕێکانی لێ ئاگادار ئەکاتەوە.

سەید عەلیمحەمەد، کە یەکێ لە شاگردەکانی سەید کازمی رەشتی بوە، خۆیشی باوەڕی هێنا کە ئەو کەسی "مەوعودە". سەرەتا خۆی بە "بابی ئیمامی زەمان" راگەیاند، مەبەستی ئەوە بو کە ئەو دەرگایەکە بۆ پەیوەندی لە گەڵ ئیمامی زەمان. بۆ ئەوەی بانگەوازەکەی لە مەکەوە دەس پێ بکا سەفەرێکی حەجی کرد.

داوای لە شەریفی مەکە کرد بە دەنگیەوە بچێ. بە هـۆی جەنجـاڵی حاجیـانەوە داواکەی بـێ وەڵام مـاوەتەوە، گەڕاوەتەوە بوشەهر، لەوێوە دەستی کردوە بە بڵاوکردنەوەی باوەڕەکەی. خۆی بە "مەهدی مەوعود" و "نوقتەی ئولا" و "مەزهەری ئیلاهی" ناساندوە. مەلا حوسەینی بوشرەوی، کە یەکەم کەس بوە باوەڕی هێنـاوە و ڕۆڵـی هەبوە لەوەدا کە سەید عەلیمحەمەدی قانع کردوە و، پێڕەوێکەری لێ کۆکردۆتەوە بابیەکان پێی ئەڵێن "اول مـن آمن" و سەید عەلی نازناوی "باب البـاب" ی پـێ بەخشـیوە. ئەوانەی لە سـەرەتاوە باوەڕیـان بەوە هێنـاوە کە سەید عەلی "مەهدی" و "ئیمامی قائیم" ە هەژدە کەس بـون کە نـاو نـراون حروفـی "حـی". وشـەی "حـی" بە ژمارەی جومەل ئەکاتە هەژدە.

ئەم گروپە کەوتنە چالاکیەکی زۆر و لە گەلێ لە شارە گەورەکانی ئێران باوەڕی خۆیان بڵاو ئەکردەوە.

کاربەدەستانی ئێرانی لە جموجوڵەکانی باب کەوتنە گومان، سەید عەلیمحەمەد بانگ کرایە شیراز، پاش فەلاقەکردنی، خرایە زیندانەوە.

لە شیرازەوە گوێزرایەوە بۆ ئەسفەهان. لەوێ کۆڕێکیان بۆ گرت لە گەڵ کۆمەڵێ لە ئاخوندەکانی شیعە گفتوگۆ بکا. لە ئەنجامی گفتوگۆدا بڕیاری گرتن و دورخستنەوەی درا. بە گیـراوی نێـردرایە زینـدانی قەڵای چەهریق لە ئازەربایجان.

گیرانی باب ڕێگەی نەگرت لە لایەنگرەکانی پەرە بە هەوڵەکانیان بدەن بۆ بڵاوکردنەوەی باوەڕەکەیان.

ساڵی 1263 ک باب لە چەهریقەوە هێنرایەوە بۆ تەورێز. بە ئامادەبونی وەلیعەهدی ئێران، ناسرەدین میرزا، گفتوگۆیەکی بۆ ڕێکخرا لە گەڵ کۆمەڵێ لە ئاخوندەکانی شیعە. باب لە باوەڕەکەی پەشـیمان نەبـۆتەوە. بۆ سزادانی، دوای فەلاقەکردنی براوەتەوە زیندان لە چەهریق.

محەمەد شای قاجار مرد. لایەنگرانی بـاب ویسـتیان کەڵـک لەو پشـێویە وەربگـرن. بەڵام ناسـرەدین میرزا کە لە جێگەی باوکی بو بە شای ئێران، بۆ کۆتایی هێنان بە کێشـەی بابیەکـان، فەرمـانی دا سـەرلەنوێ بابیان لە زیندانی چەهریقەوە هێنایەوە بۆ تەورێـز بـۆ گفتوگـۆ لە گەڵ کـۆمەڵێ لە ئاخونـدەکانی شـیعە. لەو دانیشتنەدا ئاخوندەکان فتوای کوشتنی سەید عەلی‌یان دا و، شـا پەسـندی کـرد و لە تەورێـز گولەبـاران کـرا (1266 ک).

بابیەکان لە چەند جـێگەی ئێـران کەوتـنە بەرگـری چەکـدارانەی دەسـەڵاتی قاجـاری: مەلا حوسـەینی بوشرەوی لە قەڵای تەبرس، مەلا محەمەد عەلی بارفرۆش کە ناسرا بو بە "قدوس" و یەکێ بو لە حروفی حـی، لە تەورێز، سەید یەحیای دارابی، لە زەنجان مەلا عەلی زەنجانی کە لە سەرکردە ناسراوەکانی بزوتنەوەی بابی بون، خۆیان و کۆمەڵێ لە هاوبیرەکانیان لە بەرگری چەکدارانەدا کوژران.

بزوتنەوەی بابی، وەکو بزوتنەوەیەکی ئاینی، بوە بە بزوتنەوەیەکـی سیاسـی و کـۆمەڵایەتیی مەترسـیدار. دەرباری قاجار بە توندی کەوتە ڕاونان و گرتن و کوشتنی بابیەکان. بابیەکان هەوڵیان دا ناسرەدین شا بکـوژن (1228 ک). سەرکەوتو نە بون، ئەمەیان کرد بە بیانو بۆ لە ناوبردنیان. ژمارەیەکی زۆریان لێ گرتن، دابەشـیان کردن بە سەر داودەزگاکانی حکومەت و خەڵک دا بیانکوژن. بە دڕندانەترین شـێوە کوشـتنیان. یەکـێ لەوانەی بەر ئەم شاڵاوە کەوت قورەتولعەین بو. قورەتولعەین ژنێکی هەڵکەوتو بو، یەکێ بو لە بـانگخوازە هەرە چـالاک و کاریگەرەکانی ئۆلی باب و یەکێ بو لە قوتابیەکانی سەید کازمی ڕەشتی و یەکێ بوە لە هەژدە کەسـەکەی حروفـی "حی". وەکو سەرچاوەکانی خۆیان ئەڵێن، لەو شاڵاوانەدا 25 هەزار کەسیان لێ کوشتون.

باب، پێش ئەوەی بکوژرێ میرزا یەحیای کـوڕی عەباسـی نـوری (1246 - 1330 ک) کە دواتـر بە ناوی سوبحی ئەزەلەوە ناوی دەرکرد، بە جێنشینی خۆی دیاری کردوە. میرزا یەحیا و میرزا حوسەینعەلی، کە دواتر بە بەهائوڵا (1233 - 1309 ک) ناوی دەرکردوە، باوکبرا بون. لەم ڕوداوانەدا میرزا حوسـەینعەلی لە

تاران گیراوە و، میرزا یەحیای باوکبرای، لە شارەدێی نوری مازەندەران خۆی شاردۆتەوە. پاش ئازادکردنی میرزا حوسەینعەلی برای و دورخستنەوەی خۆی و بنەماڵەکەی بۆ بەغداد (1269 ک)، میرزا یەحیاش بە جلی دەروێشیەوە بە ڕێ کەوتوە بەرەو بەغداد، هەردو برا لە بەغداد یەکیان گرتۆتەوە.

## بەهائوڵا لە سلێمانی

بابیەکانی عیراق لە ناو خۆیان دا ناکۆک بون. چەند کەسێکیان ئیدیعای پێشەوایەتی و جێنشینیی بابیان ئەکرد. بەهائوڵا هەوڵی زۆری دا بۆ ئەوەی کۆیان بکاتەوە، ئەک سودی نەبو بەڵکو خەریک بو خۆیشی بە کوشتن بچێ. سەرەنجام لە گەڵ سوبحی ئەزەلی برایشی تێکچو. وەک دەرئەکەوێ نائومێد بوە بۆیە بەغدادی بە جێ هێشتوە و بەرەو کوردستان سەری خۆی هەڵگرتوە.

بەیانی ڕۆژی 12 ی ڕەجەبی 1270 کۆچی (بەرامبەر 10 ی نیسانی 1854 زایین)، بەهائوڵا بە ناوی خواستراوی دەروێش محەمەدەوە، بێ ئەوەی کەس، تەنانەت خێزان و منداڵەکانی، ئاگادار بکا لە ڕۆیشتن و مەبەستی ڕۆیشتنەکەی و شوێنی ڕۆیشتنەکەی، لە گەڵ یەکێ لە لایەنگرە باوەڕپێکراوە دڵسۆزەکانی، کە ناوی ئەبولقاسمی هەمەدانی بوە، شاری بەغدادی بەجێ هێشتوە و ڕوی کردۆتە سلێمانی.

ئەو کاتەی بەهائوڵا چۆتە سلێمانی شەش ساڵ کەمتر بو میرایەتی بابان کۆتایی هات بو. ناوچەکە لە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی تورک دا بو. قایمقامی تورک و سەربازی تورک لە سلێمانی فەرمانڕەوا بون.

بەهائوڵا لە سلێمانی چۆتە خانەقای مەولانا خالید، کە مەڵبەندی سەرەکی تەریقەتی نەقشبەندی بوە. هەر لە ناو خانەقاکەدا بە ناوی دەروێش محەمەدەوە جێگیر بوە و، هەندێ جار جێگەی خۆی گواستۆتەوە بۆ نزیک گوندی سەرگەڵو و، لە یەکێ لە ئەشکەوتەکانی ئەوێ دا گۆشەگیری هەڵبژاردوە.

دەروێش محەمەد، بۆ دابینکردنی پێویستیەکانی ژیانی خۆی و هاوڕێکەی، بڕێ پارەی داوە بە ئەبولقاسمی هەمەدانی هاوڕێی تا بازرگانیی پێوە بکات، ئەویش بە داهاتی کارەکەی پێویستیەکانی هەردوکیانی دابین کردوە.

ڕێی تێ ناچێ بەهائوڵا بە ڕێکەوت ملی ڕێگای سلێمانی و سەرگەڵوی گرت بێ. بەڵکو ئەشێ پێشتر ئاگاداریی لە سەر سلێمانی و خانەقاکەی و تەریقەتی نەقشی هەبو بێ و هەندێ کەسایەتی لێ ناسی بێ. هەروەها ئەشێ لە گەڵ شێخانی سەرگەڵوش جۆرێ لە ناسیاویی هەبو بێ. شێخ ئەحمەدی سەردار، کە شێخی دەسەڵاتداری سەرگەڵو بوە، یەکێ بوە لە کەسایەتیە نزیک و دڵسۆزەکانی مەولانا خالید. ئەو کاتەی مەولانا لە سلێمانی تەنگی پێ هەڵچنراوە و نەیارەکانی بە تەما بون بچنە سەری، یەکێ لەوانەی بە چەکەوە خۆی و دەسوپێوەندەکانی ئامادە کردوە بۆ پارێزگاری و داکۆکی لە مەولانا، شێخ ئەحمەد بوە. (*مەلا حامیدی بێسارانی، ریاض المشتاقین: 176*) شێخ ئەحمەد نزیکەی نەوەد ساڵ ژیاوە، بۆیە دور نیە هاتوچۆی بەهائوڵا بۆ سەرگەڵو لە سەردەمی ئەودا و بە پشتیوانی ئەو بو بێ.

## بەهائوڵا و کەسایەتیەکانی سلێمانی

بەهائوڵا ئەگەرچی بە ناوی دەروێش محەمەدەوە لە سلێمانی بوە، بەڵام وەکو سەرچاوەکانی بەهائیەکان ئەی گێڕنەوە پێوەندی دۆستانەی لە گەڵ چەندین کەسایەتی دینی و ڕابەرانی تەریقەتی ئەو سەردەمەی ناوچەکە هەبوە لەوانە:

پێوەندیی لە گەڵ دو لە کوڕەکانی شێخ عوسمانی سیراجەدین، شێخ محەمەد ئەبولبەها (1252 - 1298 ک) و شێخ عەبدورەحمان ئەبولوەفا (1253 - 1285 ک) هەبوە. ئەم دو شێخە دو کەسایەتی زانا

و ناسراو بون. گۆیا دو مانگ لە خانەقای مەولانا لە سلێمانی لە گەڵی ژیاون. ئەبولوەفا شاعیرێکی بە توانا بوە بە زمانی فارسی. شیعرەکانی لە پلەیەکی ئەدەبی باش دان. ساڵانی دواتر چۆتە بەغداد لە مەرقەدی شێخ عەبدولقادری گەیلانی نیشتەجێ بوە. ئیرشادی کردوە. هەر لە بەغداش مردوە.

یەکێ لە نامەکانی بەهائوڵا بۆ شێخ عەبدوڕەحمانی نوسیوە. *(ایمانی: 251 - 253)*

پێوەندی لە گەڵ مەلا حامیدی بێسارانی (1223 - 1310)، ناسراو بە "کاتب اسرار" ی شێخ عوسمانی سیراجەدین هەبوە. مەلا حامید دانەری چەندین کتێبە لەوانە "ریاض المشتاقین" کە بۆ باسی ژیان و کەراماتی مەولانا خالید و شێخ عوسمانی سیراجەدین و ڕێوشوێنی تەریقەتی نەقشبەندی نوسیوە. بەهائوڵا لە گەڵ مەلا حامید نامەیان ئاڵوگۆڕ کردوە. دەقی نامەکانی بەهائوڵا لە بەر دەس دایە، وەڵامەکانی مەلا حامید، ئەگەر وەڵامی بۆ نوسیبێتەوە، لە بەر دەس دا نیە. *(ایمانی: 222 - 231)* نامەکانی بەهائوڵا، بە زمانێکی ئەدەبی و عیرفانی بە پەخشان و شیعر نوسراون.

هەروەها نامەیەکی بۆ حاجی ڕەسول نوسیوە کە یەکێ لە کەسایەتیە ناسراوەکانی ئەوسای سلێمانی بوە.

پێوەندی لە گەڵ شێخ عەبدوڕەحمانی خالیس (1212 - 1275 ک)، مورشیدی تەریقەتی قادری هەبوە. بەهائوڵا لە گەڕانەوەی دا لە سلێمانیەوە بۆ بەغداد، لە تەکیەکەی ئەو لە کەرکوک، میوان بوە.

کەسایەتی ڕاستەقینەی دەروێش محەمەد دیارە لە لای گەورەپیاوانی سلێمانی زانراو بوە. بەڵام لای خەڵک نەناسراو بوە. خۆیشی ویستویەتی بە نەناسراوی بمێنێتەوە. بەڵام سەرەنجام وەکو کەسایەتیەکی گرنگ دەرکەوتوە.

## ئاشکرابونی لە سلێمانی

فەقێیەکی سنەیی لە خانەقا خوێندویەتی. مامۆستاکەی دەرسی مەشقی خەتخۆشی پێ وتوە. لە بەرئەوەی لە فێرکردنی نائومێد بوە دەری کردوە. فەقێکە ئەوەندە دڵگران بوە گریاوە. دەروێش محەمەد، کە لەو کاتەدا نیشتەجێی خانەقا بوە، گوێی لە گریانەکەی بوە لێی پرسیوە بۆچی ئەگری؟ هۆی گریانەکەی بۆ باس کردوە. دەروێش بەزەیی پێدا هاتۆتەوە، ویستویەتی یارمەتی بدا. مەسرەعێکی لە شیعرەکانی مەولەوی ڕۆمی، بە خەتێکی خۆش لە سەر کاغەزێ، بۆ نوسیوە کە بیکا بە سەرمەشقی فێربونی خەت. پاش ماوەیەک مەشق، فەقێکە بە چاکی فێری بوە و خەتی خۆش بوە. مامۆستا و فەقێ و شاگردەکانی تر لە مە سەریان سوڕماوە و، تێگەیشتون کە ئەم دەروێش محەمەدە کەسێکی ئاسایی نیە، بەڵکو خوێندەوارێکی شارەزایە. نیتر ڕویان تێ کردوە و ناوی بڵاو بۆتەوە. *(ایمانی: 137)*

## ئاشکرا بونی لە سەرگەڵو

یەکێ لە شێخەکانی سلێمانی باخی هەبوە لە سەرگەڵو. جاروبار بۆ بەسەرکردنەوەی باخەکەی چۆتە سەرگەڵو. جارێکیان بۆ حەوانەوە نوستوە. پێغەمەر چۆتە خەوی پێی وتوە: "برۆ بۆ کێوی سەرگەڵو ئەنواری زاتی کردگار ببینە!". شێخ کاتێ لە خەو هەستاوە کەوتۆتە گەڕان لەو نزیکانە گوێی لە دەنگی موناجات بوە. بە دوای دەنگەکەدا چوە دەروێشێکی دیوە لە ئەشکەوتێکی نزیک سەرگەڵودا بە دەنگێکی خۆش موناجات ئەکا. ئاشنایەتی لە گەڵ پەیدا کردوە. جاروبار سەری داوە. لە گەڕانەوەی دا بۆ سلێمانی باسی کردوە. نیتر دەماودەم هەواڵەکە بڵاوبۆتەوە. شوێنەکەی و خۆی ئاشکرا بون. *(ایمانی: 133)*

## ئاشکرابونی لای کەسوکاری

پێ ئەچێ دەروێش محەمەد دوای ئەوەی ئاشکرا بـوە، بڕیـاری دابـێ سـلێمانی بە جـێ بهێڵـێ. لە گەڵ ئەبولقاسمی هاوڕێی تەگبیریان کردوە، ئەبولقاسم بگەڕێتەوە بـۆ هەمەدان. هەرچـی مـاڵ و دارایـی خـۆی هەیە بیفرۆشێ و بیکا بە پارەی ئەختینە و، بگەڕێتەوە سلێمانی لە گەڵ دەروێش محەمەد پێکەوە بـڕۆن بـۆ میسـر. *(ایمانی: 148)*

ئەبولقاسم گەڕاوەتەوە بۆ هەمەدان و داواکەی دەروێش محەمەدی بە جێ هێناوە. شتەکانی فرۆشـتوە و کردویەتی بە پارە و لە ڕێگەی سنەوە چۆتە گوندی "ڕێژاو" لە هەورامان. شەو حسـەینعەلی خـان سـوڵتان، بە میوانی لای خۆی گلی داوەتەوە. دیارە زانیویتی پارەی پێیە، بەیانی کە بە ڕێ کەوتوە بەرەو شاری سلێمانی، خان، چەند سوارێکی بە بیانوی پاراستنیەوە لە گەڵ ناردوە. پارێزەرەکانی لە ڕێگە گەیاندویانەتە پەنـایەک لە شاخی گراویدۆڵ. پارەکەیان لێ سـەندوە و گەرویـان بڕیـوە. وایـان زانیـوە مـردوە بەجـێیـان هێشـتوە. بە ڕێکەوت شوانێ لەو نزیکانە بوە، لاشەیەکی بینیوە چۆتە سەری و سەیری کردوە نەمردوە، برینەکەی پێچاوە. چـوە ئاگـاداری خەڵکـی گونـدەکەی کـردوە. خەڵـکەکە بە دەنـگ برینـدارەکەوە چـون. هەڵیـان گرتـوە و گوێزاویانەتەوە بۆ ناو دێ. لە بەر زامی گەروی ئەی توانوە قسە بکا بەڵام داوای قەڵەم و کاغەزی کـردوە. کە بۆیان هێناوە نوسیوێتی:

"من ئەبولقاسم بازرگانێکی هەمەدانیم. حسەینعەلی خان سوڵتان میوانداری کـردم و چەنـد کەسـی بـۆ پارێزگاری لە گەڵ ناردم. ئەوانە لە ڕێگەدا وایان لێ کردم بۆیە داوای سزادانی ئەو و وەرگـرتنەوەی شـتەکانم ئەکەم.

**لە کۆتایی دا نوسی بوی:**

"ئەگەر حکومەت شتەکانیان بۆ وەرگیرایەوە، ئەبێ شتەکان و پارەکان بگێڕنەوە بۆ دەروێش محەمەدی ئێرانی کە نیشتەجێی کێوی سەرگەڵوە و هـاتوچۆی تەکـیەی شـاهی نەقشـبەند ئەکـا لە سـلێمانی. مـن دوای بینینی ئەو چومەتە ئێران و ئێستا گەڕاومەتەوە بۆ دیدەنی ئەو. ئەگەر پارەکەیان بۆ گەڕایەوە، ئەوان ئەتوانن بە هەر جۆرێ بیانەوێ بە کاری بهێنن."

خەڵکی گوندەکە وەسێتنامەکەی ئەبولقاسم و هەواڵەکەیان گەیانـدۆتە خانەقـای مەولانـا لە سـلێمانی و، دەروێش محەمەدیان لێ ئاگادار کردۆتەوە. دەروێش محەمەد دۆسـتایەتی لە گەڵ شـێخ عەبـدوڕەحمان و شـێخ محەمەد کوڕانی شێخ عوسمانی سیراجەدین هەبوە. لە ڕوداوەکە ئاگاداری کردون. هەردو شێخ خۆیان خەڵکـی هەورامان بون. هەردوکیان بە دەنگ داواکەوە چون و، دەروێش محەمەدیان لە گەڵ خۆیان بردوە بـۆ شـوێنی ڕوداوەکە کە لە ناو خاکی ئێران دا بوە. لەوێ تەرمی ئەبولقاسمیان، بە ئامـادەیی دەروێـش مـحەمەد بە خـاک سپاردوە. شێخ عەبدوڕەحمان خەرجی کفن و دفن و بە خاکسپاردنی کوژراوەکەی کێشاوە. *(ایمانی: 248)*

دەروێـش مـحەمەد لە گەڵ هەردو شـێخ گەڕاوەتەوە سـلێمانی بەڵام لە سـەر داوای شـێخ عەبـدوڕەحمان سکاڵایەکی لە گەڵ وەسێتنامەکەی ئەبولقاسم نوسیوە بۆ کاربەدەستانی ئێران بۆ ئەوەی لە ڕوداوکە بکـۆڵنەوە و وەسێتەکەی ئەبولقاسم بە جێ بهێنن. دوای سکاڵاکەی دەروێش محەمەد ڕوداوەکە بـۆتە هەواڵ لە ڕۆژنـامەی ڕەسمی ئەو سەردەمەی ئێران دا. بڵاوکـردنەوەی ئەم هەواڵە بـۆتە هـۆی دۆزیـنەوەی شـوێنی خۆحەشـاردانـی دەروێش محەمەد لە لایەن کەسوکارەکەیەوە.

ڕۆژنامە ڕەسمیەکەی ئێران هەمو مانگێ جارێک نێردراوە بۆ کارگوزاری ئێـران لە بەغـداد. کـارگوزار هاتوچۆی قاوەخانەیەکی کردوە. هەروەها زاوایەکی دەروێش محەمەدیش هەمیشە هاتوچۆی ئەو قاوەخـانەیەی کردوە. کارگوزاری ئێرانی ڕوداوەکەی بۆ دانیشتوانی قاوەخـانەکە بـاس کـردوە. زاواکەی یەکسـەر گومـانی

کـردوە کە دەروێـش مـحەمەد هەمـان کەس بـێ کە لەمـان بـزر بـوە. لە گەڕانەوەی دا بـۆ مـاڵ کەوتـۆتە مشورخواردنی پەیجوری دەروێش محەمەد.

شێخ سوڵتان کەربەلایی، کە یەکێ بوە لە بابیەکانی عەرەب و، لە ئەتباعی تـاهیرە بـوە و لەوانە بـوە کە هاوسەفەری تاهیرە بوە لە گەڕانەوەی دا لە بەغدادەوە بۆ کرماشـان و هەمەدان، هەر لە سـەر داوای ئەم چـۆتە قەزوێن و تاران و چۆتەوە بەغداد. میرزا موسـا کلیم، بـرای بەهـائوڵا کچـی شـێخ سـوڵتانی هێنـاوە. شـێخ سوڵتان، ئەگەرچی بە تەمەن پیر بوە، بەڵام ئەو داوای کردوە بچێتە کوردستان و بە دوای بەهائوڵادا بـگەڕێ.
شێخ سوڵتان لە گەڵ ئاقا محەمەد جەواد حەطاب، کە ئەویش عەرەب و لە پەیڕەوانی باب بوە، بە چەنـد نـامەی خێزان و بنەماڵە و لایەنگرەکانیەوە، کە داوای گەڕانەوەیان کرد بو بۆ بەغـداد، بە درێژایـی ڕێـگە لە هەواڵـی دەروێش محەمەدیان پرسی و چون بـۆ سـلێمانی لە خانەقـا دامەزران. ئاگاداریـان کـرد دەروێـش مـحەمەد لە ئەشکەوتێکە لە سەرگەلو. کەسێکیان ناردوە بە دوای دا کە بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی. دوای هاتنەوەی 22 ڕۆژ لە گەڵی خەریک بون و پاڕاونەتەوە تا ڕازییان کردوە لە گەڵیان بگەڕێتەوە بەغداد. پێـی وابـوە لایەنگرەکانیـان بێ سەروبەر و لە ڕێ لایان داوە. ئەوانیش هەڕەشەیان لێ کردوە کە ئەگەر نەگەڕێتەوە هەمـو ئەوان دێـنە لای ئەم لە سلێمانی لێی کۆ ئەبنەوە. *(ایمانی: 311 - 312)*

ڕۆژی 12 ی ڕەجەبـی سـاڵی 1272 ک بەرامـبەر 19 ی مـارتی 1856 ز لە ڕێـگەی کەرکـوکەوە گەڕاوەتەوە بەغداد *(ایمانی: 316)*

بەهائوڵا لە بەغداد ئیتر خۆی بە یەکجاری ئاشکرا کردوە. بەیانیان و ئێواران چـوە بـۆ یەکـێ لەو دو قاوەخانەیە. قسەی بۆ خەڵک کردوە و بانگی کردون بۆ سەر دینەکەی خۆی.

## بەهائوڵا و زانایانی کورد

ئەگەرچی بەهائوڵا نزیکەی دو ساڵی تەمەنی لە سلێمانی بە سەر بردوە و، لەو ماوەیەدا کە لە خانەقـای مەولانا خالید ماوەتەوە هەلێکی باشـی بـۆ هەڵکەوتـوە تـا لە گەڵ دەیـان زانـای ئـاینی و ڕابەری تەریـقەت و کەسانی ناسایی ئاشنایەتی پەیدا بکات و، هەر لەو ماوەیەدا بەشێ لە شیعرەکانی و کـارە فیکریەکـانی بەرهەم هێناوە، بەڵام ئەی توانیوە کاریگەریەکی ئەوتۆی لە نـاو مەلا و زانـا و ڕابەرانـی تەریـقەت و کەسـایەتیەکانی سلێمانی دا هەبێ و، هەندێکیان بە لای خۆی دا ڕابکێشێ و بیان کا بە هـاوبیر و هاوڕێبـازی خـۆی. ئەمەش ئەشێ بە دو جۆر لێک بدرێتەوە:

یەکەم، ڕەنگە خۆی نەی ویستبێ بە ئاشکرا بانگەواز بۆ باوەڕەکەی بکـات بـۆ ئەوەی کەسـایەتیەکەی ئاشکرا نەبێت و، ژیانی نەکەوێتە مەترسیەوە. بە تایبەتی کە لەو سـەردەمە دا داوودەزگـای قاجـاری لە ئێـران زۆر بە توندی کەوتبونە ڕاونان و گرتن و کوشتنی بابیەکان.

دوەم، زەمینەی فیکریی بڵاوبونەوەی ئەو باوەڕەی بەهائوڵا هەی بوە لە ناو مەلا و زانایان و ڕابەرانـی تەریقەتە باوەکانی کوردستان دا نەبوە. زانایانی ئاینی و ڕابەرانـی تەریقەتـی قـادری و نەقشـی و بە گشـتی خەڵکی کوردستان سوننی - شافیعی بون. بیروباوەڕی بابی و دواتـر بەهـائی چ لە ئێـران و چ لە نەجەف و کەربەلا و بەغداد لە ناو شیعەدا، بە تایبەتی لە ناو ڕێبازی شەیخیەکان "شـیخیە" دا بـڵاو بـۆتەوە. شـەیخیە و بـابیە و بەهـائیە لە کوردسـتان زەمیـنەی بڵاوبـونەوەی نەبـوە. تەنـانەت یەکـێ لە ڕابەرەکـانی بـابی کە بـۆ بڵاوکردنەوەی باوەڕەکەیان چۆتە سنە، شەڕێکی خوێناوی لێ قەوماوە، کە بە "جەنگی کاروانسەرا" ناسراوە.

## سەرچاوەکان

دەربارەی ئاینی بابی و بەهائی و باوەڕەکەیان و کەسایەتیە سەرەکیەکانیان. بە زمانی فارسی بڕوانە:
دهخدا. لغت نامه. تهران 1336 شمسی.
بابەتەکانی: باب (ص 32 - 64)، بهاءالله (ص 397)، حسین علی بهاء (ص660)، صبح ازل (ص 122 - 126)، طاهره (ص 109 - 113)
دایره المعارف فارسی.
به سرپرستی غلامحسین مصاحب.
بابەتەکانی: باب، بهاءالله، بهائیه یا بهائیان.
بۆ دەقی نامەکانی بەهائوڵا بۆ کەسایەتیەکانی کورد و مانەوەی لە کوردستان بڕوانە:
امیر فرهنگ ایمانی، عنقای بقا در قاف وفا
هجرت حضرت بهاءالله به سلیمانیه و کوه سرگلو.
وقایع دوران بغداد و کردستان. فبیروری 2007. موناکو.
دەربارەی دۆلی بابی و بەهائی و باوەڕکەیان و کەسایەتیە سەرەکیەکانیان. بە زمانی عەرەبی بڕوانە:
علی الوردی. لمحات اجتماعیة من تاریخ العراق.
الجزء الثانی. قم 2004. لەم بەرگەدا لە چەند شوێن لە ژێر سەردێری جیاوازدا باسی بەهائیەکانی کردوە لەوانە:
عقائد الشیخیین (ص140 - 144)، ظهور الباب (ص 144 - 153)، قرة العین (ص 163 - 203)، بهاءالله فی بغداد (ص 216 - 222)، بین البابیین والشیعة (ص 238 - 241)
عباس العزاوی. العراق بین احتلالین.
الجزء السابع. الباب و البهائیه (ص 72 - 76)
دەربارەی ژیاننامەی شێخ محەمەد دەبولبەها. شێخ عەبدوڕەحمانی دەبولوەفا. بە زمانی عەرەبی بڕوانە:
عبدالکریم محمد المدرس.
علماؤنا فی خدمة العلم والدین. عنی بنشره محمد علی القرەداغی. بغداد 1983.
کاتب الاسرار ملا حامد بیسارانی.
سیری در ریاض المشتاقین. بتصحیح ومقدمه و حواشی و تعلیقات: ابوبکر سیهرالدین. 1386.